پرۆژەی ١٠٠ کتێبی گرنگەکان

# فیقهی ئاسان

## الفقه الميسر

نووسینی

احمد عیسی عاشور

وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان

پێیدا چوونەوە و سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە

محمود احمد محمد

بەرگی دووەم

عاشور، احمد عیسی.
الفقه‌المیسر. کردی.
فیقهی ئاسان: (فقه المیسر) / نووسه‌ر احمد عیسی عاشور؛ وه‌رگیرانی نوری فارس حه‌مه‌خان؛ مصحح محمود احمد محمد. -- تهران: نشر احسان، ۲۰۰۷.
۲ ج.
ISBN: 964-356-565-3 (دوره)
ISBN: 964-356-563-7 (ج. ۱)
ISBN: 964-356-564-5 (ج. ۲)
فیپا.
کردی.
۱. فقه شافعی. الف. فارس، نوری، مترجم. ب. محمد، محمود احمد، مصحح. Muhammad, Mahmud Ahmad
BP ۱۷۷/ع۲ف۷۰۴۷ ۲۹۷/۳۲۲
کتابخانه ملی ایران ۸۵-۳۵۴۰۴م

## فیقهی ئاسان (به‌رگی دووه‌م)

✦نووسه‌ر: احمد عیسی عاشور
✦وه‌رگێرانی: نوری فارس حمه خان
✦بلاڵوکار: نه‌شری ئیحسان - تاران
✦چاپی: یه‌که‌م ـ ۲۰۰۷
✦چاپخانه: مه‌هارت ـ تاران
✦تیراژ: ۳۰۰۰ دانه
✦ژماره‌ی سپاردنی: (۸۳۱)ی ساڵی (۲۰۰٦)ی وه‌زاره‌تی رۆشنبیری پێدراوه

➢ فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ٤٠٦ ـ تلفن: ٦٦٩٥٤٤٠٤
➢ فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۳۳ـ تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱٤۹٥




ژماره‌ی نیونه ته وایه‌تی (ج ۲):۵-۵۶۴-۳۵۶-۹۶۴ ISBN:964-356-564-5
ژماره‌ی نیونه ته وایه‌تی دوره:۳-۵۶۵-۳۵۶-۹۶۴ ISBN:964-356-565-3

# ٢٤٣) باسی دابەشکردنی کەلەپوور لە نێوانی کەلەپووربەرانیدا (فەرائیض):

(بڕ: تەجرید/٥ ز: ٨٨).

وشەی (فەرائیض) لە زمانا لە وشەی (فەرض)ی عەرەبی وەرگیراوە، کە بەواتا دانانو دیاریکردنو بڕیاردانە، خوای گەورە دەفەرموێ: {فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ - سورة البقرة - ٢٣٧/٢} واتە: هەرکاتێ ژنتان تەڵاقدا، وە مارەییتان بۆ دیاری کردبوون، وە لەپێش گواستنەوەدا تەڵاقتاندا، ئەوە نیوەی ئەو مارەییەیان دەکەوێ کە دیاریتان کردووە بۆیان). لە شەرعیشا (فرض) بریێتییە لەو بەشە پشکەی کە شەرع داینەوە بۆ خاوەن پشك، لە سەردەمی نەزانیدا، عەرەب کە لەپووریان هەر بە پیاوی گەورە دەدا، بەشی ژنو منالیان نەدەدا، بەهۆی هاوپەیمانیشەوە کەلەپووریان لە یەکتر دەگرت، لە سەرەتای هاتنی ئیسلامیشەوە هەروابوو، هەتا خوا بە ناردنی ئایەتەکانی دابەشکردنی کەلەپوور ئەو یاسایەی هەڵوەشاندەوە. کاتێ ئایەتەکانی سوورەتی نیساء لە بارەی دابەشکردنی کەلەپوورەوە هاتن خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە راستیدا خودای باڵادەستو شکۆمەند، هەموو خاوەن مافێ، مافی خۆیی پێداوە، لەبەر ئەوە هۆشیار بن کە وەسێت بۆ کەلەپوور گر دانامەزرێ!. (ئەحمەدو ئەبو داوودو تەرمیذیو: ئیبنو مەجاو دارە قوطنیو نەسائی گێڕاویانەتەوە) زەیلەعی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە دە هاوڕێی پێغەمبەر (درودی خوای

لەسەربێ} گێڕاویانەتەوە). زەیلەعی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: هاوڕێی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} گێڕاویانەتەوە.

لە زانستی کەلەپوور دابەشکردندا ئەم چوارکەسە لە یارانی حەزرەت ناوداربوون: عەلی‌و ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو مەسعوودو زەید (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) ئیمامی شافیعی {رەزای خوای گەورەی لێبێ} ڕێبازگەی زەیدی هەڵبژاردو کردی بە سەرچاوەی مەزهەبی خۆی، لە بابەت کەلەپوورەوە، چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرموویەتی: باشترین فەرائیض زانتان زەیدی کوڕی ثابتە). لەبەر ئەوەیش کە ئەم ڕێبازگەی زەیدە زۆر نزیکە لە قیاسەوە، سەرەڕای ئەمانە هۆی پەسەندکردنی ڕێبازگەی زەید لە لایەن شافیعییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە سەرنجی بەڵگەکانی زەیدی داوە، بەڵگەکانی زۆرڕێك‌و پێك بوون، لەبەر ئەوە کاری پێکردوون، نەك لەسەر شێوەی لاسکایی کردنەوەی رووت‌و کوێرانە، بەڵکوو لەسەر بناغەی سەرنج ڕاکێشان‌و پەسەندکردن.

## نێرینە کەلەپوور بەرەکان:

ئەو نێرینانەی کە کەلەپوور دەگرن ئەم دە کەسەن: کوڕ، کوڕی کوڕ، هەرچەندەیش بەرەو خواربڕوا، باوك، باوکی باوك هەرچەند بەرەو ژوورتریش بڕوا، برا، کوڕی برا، هەرچەندەیش خاوبێتەوە، مامە، کوڕی مامە، هەرچەندەیش دوور کەوتبێتەوە، مێردوو ژن، خاوەنی پێشووی بەندەی ئازادکراوی خۆی. ئەم دە کەسە بەیەکگرتن کەلەپوور وەردەگرن. ئەگەر ئەمانە وارێکەوت لە مەسەلەیەکا هەموو

کۆبوونەوە، ئەوە تەنیا ئەم سێ کەسەیان کەلەپوور وەردەگرن: باوك‌و کوڕو مێرد، لەم مەسەلەیەدا دەبێ مردووەکە کەنیزێکی ئازادکراو بێ، ئەوسا دەگونجێ کە هەردەیان کۆببنەوە.

## ئەو کەسانەیش کە بەیەکگرتن کەلەپوور وەردەگرن لە ژیانان:

**حەوت کەسن:** کچ، کچی کوڕ، دایك، نەنك، خوشك، ژن، خاوەنی بەندەی ئازادکراو کە خاوەنەکە ژن بێ. ئەگەر وارێکەوت ئەم حەوت کەسە لە مەسەلەیەکا کۆبوونەوە، تەنیا ئەم پێنج کەسەیان کەلەپوور دەگرن: ژن‌و کچ‌و کچی کوڕو دایك‌و خوشکی باوکی‌و دایکی. دیارە لەم مەسەلەیشدا دەبێ مردووەکە بەندەیەکی خاوەن ژنی ئازادکراوبێ، دەنا ناگونجێ لە هیچ مەسەلەیەکی تردا کە ئەم حەوت جۆرە مێیینەیە کۆببنەوە.

ئەگەر وا رێکەوت ئەو کەسانەی کە بگونجێ لەم دوو تاقمەیە یەك بگرن، لە مەسەلەیەکا کۆ بوونەوە، ئەوە تەنیا ئەمانەیان کەلەپوور دەگرن: باوك‌و دایك‌و کوڕو کچ‌و یەکێ لە ژن‌و مێرد.

سەربەڵگەی کەلەپوور گرتنی یەکەیەکەی ئەم دوو تاقمەیە دەقی ئەو ئایەتانەیە کە لە دواوە دێن لەگەڵ یەکگرتندا، بەڵگەی ئەوەیش کە کەسی تر بێجگە لەمانە کەلەپوور ناگرێ پابەندبوونە بەم سەربەڵگەیەوە.

بزانن هەرکام لە نێرینەکان ئەگەر بە تەنیا هەر خۆی بوو، وەمیراتبەری تری لە گەڵا نەبوو، ئەوە گشت کەلەپوورەکە دەبا بۆ خۆی،

تـەنیا مێـردو بـرای دایکـی نـەبێ، ئـەم دوو کەسـە ئەگـەر بـە تـەنها هـەر خۆیان بوون هەموو کەلەپوورەکە نابەن. بەڵام هەرکام لە ژنان ئەگـەر بـە تەنها هەر خۆی بوو، میراتگری تری لە مەسەلەکەدا لەگەڵدا نـەبوو، گشت کەلەپوورەکە ناگرێ بۆ خۆی، مەگەر ئازادکەر مردووەکە کە ژن بێ.

**بەشبڕین: حەجب:**

**بەشبڕین دوو جۆرە:**

١) بەشـبڕینی ناتـەواو، کـە مـشهوورە بـە حـەجبی نوقـسان، کـە برێتییە لە کەم کردنەوەی بەشە پشکی میراتبـەر، بـەڵام بـە تـەواوی بـێ بەشـی ناکـا، وەك ئـەوە بەهۆیمنداڵـەوە بەشـی مێـرد لـە نیـوەوە دێتـە خـوارەوەو دەبـێ بـە چـواریەك، وەبەشـی ژن لـە چواریەکەوە دەبـێ بـە هەشت یەك، وە بەشی دایك لە سێیەکەوە دەبێ بە شەش یەك.

٢) بێبەشکردنی تەواو، یـا بەشـبڕینی تـەواو، کـە پێـی دەگـوترێ: حەجبی حیرمان، کە برێتییە لە بێبەشـکردنی میراتبـەر لـە بەشەپـشکی خۆی بە تەواوی.

لەپاش ئەمە کەلـەپوور گرەکـان دوو بەشـن، بەشـێکیان ناوەنـدێ نیە لە نێوان ئەوانو مردووەکەداو بـەهۆی کەسـی تـرەوە ناگەنـەوە پێـی بەڵکوو یەکسەر خۆیان پەیوەندییان بـە مردووەکـەوە هەیـە، ئەمانـەیش بـرێتین لـە ژنو مێـردو بـاوكو دایـكو منـداڵ، ئەمانـە بـە هـیچ جـۆرێ بەهۆی ئەم جۆرە بێبەشکردنەوە بێبەشـناکرێنو هەمیـشە بەشـە پـشکی دیـاریکراوی خۆیـان دەبـەن، ئەگـەر عەصـەبەیش بـوون ئـەوە حیـسابی ئەوەیان بۆ دەکرێ، بۆیە ئەمانە بێبەشـی تـەواو نـاکرێن چونکە بەیـەك

گەیەنـــەر نیـــە لـــە نێـــوانی ئـــەوانو مردووەکـــەدا. بەشـــێکی تـــری کەلـەپوورگرەکان بـەهۆی گەیەنەرێکـەوە دەگەنـەوە بـە مردووەکـە، کـە بڕێتین لە هەموو کەلەپووربەرەکانی تر.

## چەن کەسێ هەن بەهیچ جۆرێ کەلەپوور ناگرن؛

کـە بـڕێتین لـەم حـەوت کەسـە: بەنـدەو بەنـدەی پاشمەرگـە، کـە پێـی دەگوترێ مودەببـەر، کـە ئـەو بەندەیەیـە خاوەنەکـەی پێـی بڵـێ لـە پـاش مردنـی مـن تـۆ ئـازادی، هـەروا کـەنیزەکی دایکـی منـاڵ، کـە پێـی دەگوتـرێ (أم الولد) هەروا بەندەی کاغەز پێدراو (موکاتـەب) کەسێکیش کە کەسـێ بکوژێ میراتـی لێ نـاگرێ، هـەروا کـافری پاشـگەز (مرتـد)یـش کەلەپوور لە کەس وەرناگرێو کەسیش کەلەپوور لـەو وەرنـاگرێ، هـەروا جیاوازیی ئایینی میراتبەرو مردووەکە یەکێکە لە نەهێڵە (موانـع)ەکـانی کەلەپوور گرتن، وەك موسوڵمانەتیو بێبڕوایی. واتە: بەندەو کـەنیزەكو پاشمەرگــەو کاغــەز پێــدراوو کــەنیزی دایکــی منــاڵ لــە خاوەنەکــەی، ئەمانەکە رەگی کۆیلەییان تیا دایە کەلـەپوور وەرنـاگرن لـە مردووەکـان، هـەروا بکـوژو پاشـگەزو زەنـدیق کـە مـرۆی بێئایینـە، پـەیڕەوانی دوو ئایینی جیاجیایش لە یەکتری کەلەپوور وەرناگرن. کۆیلەو ئـەوەی رەگـی کۆیلەیی تیاماوە بۆیـە کەلـەپوور وەرنـاگرن چـونکە خۆیـان ماڵیـان نیـە، کەواتــە: هەرچــی وەربگــرن بــۆ ئاغاکــەیان دەبــێ، ئاغاکــەیش هیــچی مردووەکە نییـەو بێگانـەیـە، لەبـەر ئـەوە ناگونجێ کەلـەپووری لێبگـرێ. بەڵام بەندەی بەش بەش، کەپێی دەگوتـرێ (مـبعض) راجیـایی هەیـە لـە بارەیـەوە، فەرمایـشتی دروسـتو سـاغ ئەوەیـە کـە وەك بەنـدەی تـەواو

کەلەپوور ناگرێ، چونکە ئەگەر میرات بگرێ هەندێ لە ماڵەکە دەبێ بەهی ئەو کەسەی کە خاوەنی بەشە ئازادنەکراوەکەیەتی، ئەویش بیانییە لە مردووەکە. بەڵام هەر ماڵێکی بە بەشە ئازادەکەی پەیدا کردبێ، دەبێ بە کەلەپوور بۆ کەسوکاری، وەك ئەوە نیوەی ئازاد بووبێ، لەو ماوەیەدا رۆژێ بۆ خۆیو رۆژێ بۆ ئاغاکەی ئیشی کردبێ. بکوژیش بۆیە لە کوژراوی دەستی خۆی کەلەپوور وەرناگرێ چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بکوژ (قاتل) لە کوژراوی دەستی خۆی کەلەپوور ناگرێ. هەروا دەفەرموێ: بکوژ کەلەپووری بۆ دانانرێ، لە گێڕانەوەیەکی نەسائیدا دەفەرموێ: لە کەلەپوور هیچ بەربکوژ ناکەوێ. ئیبنو عبدولبەڕ بە فەرموودەیەکی ساغی داناوە، زیاد لەوە نەقڵ دەکا کە یەك رایی (اتفاق) لەسەر ئەم بڕیارە هەیە، کە بکوژ کەلەپوور ناگرێ. پاشگەزیش نەکەلەپوور لەکەس دەگرێو نەکەسیش کەلەپووری لێ دەگرێ، کەلەپوورەکەی دەبێ بە مفتەماڵ (فییء) بۆ موسوڵمانان، ئەبو بوردە فەرمووی {رەزای خوای لێبێ} پێغەمبەری خوا {درووده خوای لەسەربێ} ناردمی بۆ سەرکابرایێ، باوەژنی خۆیی مارەکردبۆوە، فەرمانی پێکردم کە بچم لە گەردنی بدەمو ماڵەکەیشی بە تالانی بەرم، کابراکە پاشگەزبووەوە بوو. چونکە ئەوەی بە حەڵاڵ دانابوو، کەبە دەقی قورئان حەرام کراوە. پەیڕەوانی دوو ئایینیش بۆیە کەلەپوور لە یەکتر ناگرن چونکە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێو نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ. (شەیخان). فەرمایشتی دروست ئەوەیە کە جوولەکەو گاور کەلەپوور لە یەکتر وەردەگرن، بە مەرجێ کە هەردوو لایان خاوەن

پەیمان بن، یا کافری حەربیبن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان خاوەن پەیمان بوو، ئەویتریان جەنگی بوو، کەلەپوور لە یەکتر وەرناگرن، چونکە پەیوەندی لە نێوانیاندا پچڕاوە.

## حوکمی کەسێ بێ سەرو شوێن بێ:

ئەگەر نەمان دەزانی کەسێ ماوە یا مردووە، وەك ئەوە دیار نەماو بێ سەرو شوێن بوو، یا حاڵی نەدەزانرا، یا کەوتە ناو جەنگستان (دار الحرب)ەوە، یا لە پاپۆڕێکا بوو، پاپۆڕەکە شکاو هەواڵی نەما، ئەم جۆرە کەسە کەلەپوورەکەی دابەش ناکرێ، هەتا بەڵگە راست دەبێتەوە لە سەرمردنی، جا ئەگەر پاش ماوەیێ قازی برپاریدا کە ئیتر لەوە زیاتر ناژی ئەوسا کەلەپوورەکەی لە نێوان کەلەپووربەرەکانیدا دابەش دەکرێ.

## نزیکنترین باوان:

باوان بە عەرەبی پێی دەگوترێ: عەصەبە، وشەی عەصەبە لە تەعصیب دارێژراوە کە بەواتا پشتگیرییە. لە عورفی شەرعا بەو کەسانە دەگوترێ کە بەشە پشکی دیاریکراویان نیە، بەڵام لەو کەسانەن کە بە یەکگرتن کەلەپوور دەگرن، باوان ئەگەر بەتەنها هەر خۆی بوو هەموو کەلەپوورەکە دەگرێ، وەك کەسێ بمرێ تەنیا کوڕێ کەلەپوورگری هەبێو بەس، ئەگەر خاوەن پشکی دیاریکراوی لەگەڵ دابوو، چی لەو مایەوە بۆ ئەمە، وەك ژنێ مرد، مێردێكو کوڕێکی هەبوو، چواریەکی کەلەپوورەکەی بۆ مێردەکەیەتی، ماوەکەی تری هەموو بۆ کوڕەکەیەتی.

نـزیکترین بـاوانیش کـوڕە، بـەپێی ئـەم فەرمایـشتەی زاتـی مـەزن: {يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ – سورة النساء – ١١/٤} ئـەوەتا لـەم ئایەتەدا بە منداڵ دەست پێکراوە، چونکە عـەرەب لـە منداڵەوە دەست پێدەکەن، سەرەڕای ئەمەیش ئەوەتا لـەم ئایەتـەی تـردا بـەهۆی منالـەوە بـاوك لـە بـاوانی دەکـەوێو دەبـێ بـە خـاوەن پـشکی دیـاریکراو، وەك دەفەرموێ: {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ – سورة النساء – ١١/٤} جا لەشوێنـێ بـاوك بـەهۆی کـوڕەوە لـە بـاوانی بکـەوێ باوانـەکانی تـر باشـتر لێ دەکـەون، کەواتـە کـوڕ نـزیکترین باوانە، لەپاش کوڕ کوڕی کوڕ، هەر چەند بەرەوخواریش بڕوا، رێـك وەك کوڕ وایە لە هەموو بڕیارەکانی تریشدا،

**سێیەم: باوکە(١).**

---

(١) لێرەدا بۆ پاساوی ئەوە کە باوك لـە ریـزی باوانـە سـێیەمە لـە ئەصـڵەکەو لـە ئەصڵی ئەصڵەکەیشدا ئاوا نووسراوە: (ثم الاب لانه بعصبه ولـه الولايـة عليـه بنفسـه ومن عدا الاب يدلی به فقدم لقربه. نازانم باوك چۆن چۆنی کوڕ یا کوڕی کـوڕی خـۆی دەکا بە باوان (واتە: بە عـەصەبە) ئەوەی ئاشکرایە باوكو باپیرە ئەگـەر کـوڕ یـا کـوڕی کوڕیان لەگەڵدا نەبوو دەبن بە عـەصەبە. رەنگ بێ مەبـەسـت لـەم قـسەیە ئـەوەبێ: کـە باوك هۆی بوونی منداڵە بە عـەصەبە، چونکە بەهۆی دایکەوە کەس نابێ بـە عـەصـەبە، بەم بۆنەیەوە.

موغنی موحتاج دەفەرموێ (ومعنى العصبة لغة قرابة الرجل لابيه).

- وەرگێڕ-

**چوارەم**: باپیرەیە، واتە: باوکی باوك، هەر چەند بەرەو ژووریش بڕوا بەریز، بە مەرجێ براو خوشکی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ.

**پێنجەم**: برای باوکیو دایکی.

**شەشەم**: برای باوکی.

**حەوتەم**: کوڕی برای باوکیو دایکی.

**هەشتەم**: کوڕی برای باوکی، هەتا بەرەو خواریش بڕوا بەریز.

**نۆیەم**: مامی باوكو دایکی.

**دەیەم**: مامی باوکی.

**یازدەیەم**: کوڕی مامی باوكو دایکی.

**دوازدەیەم**: کوڕی مامی باوکی.

**سیازدەیەم**: مامی باوكو دیاکی باوکی مردووەکە.

**چواردەیەم**: مامی باوکیی باوك.

**پازدەیەم**: کوڕی مامی باوکیو دایکیی باوك.

**شازدەیەم**: کوڕی مامی باوکیی باوك.

**حەڤدەیەم**: مامی باپیری مردووەکە بەو جۆرەی کە باسکرا، یانی مامی باوكو دایکیی باپیرەی بێ، یا مامی باوکیی باپیرەی بێ، ئیتر هەروا هەتا هەر شوێنێ بڕبکا. جا ئەگەر باوانی بنەچە نەبوو، واتە: عەصەبەی نەسب نەبوو، ئەوجار کەلەپوور دەدرێ بەو کەسە کە مردووەکەی ئازاد کردووە، ئەگەر مردووەکە ئازاد کراو بوو، لەکاتی وادا ئەو کەسەی مردووەکەی ئازادکردووە، پیاو بێ یا ژن، ئەو دەبێ بە

باوانی مردووەکە، ئەگەر ئازادکەرەکەی نەمابوو کەلەپوورەکەی دەدرێ بە باوانی ئازادکەرەکە، جارێ پیاوێ پیاوێکی هێنا بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! من خۆم ئەم پیاوەم بە ماڵی خۆم کڕیوەو ئازادم کردووە، کەلەپوورەکەی بوکێیە؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): ئەگەر لەپاش خۆی باوانی هەبوو کەلەپوورەکەی بۆ باوانیەتی، ئەگەر باوانی نەبوو بۆ هەقداری ئازادکەرە. لە فەرموودەیەکی ترا دەفەرموێ: سەرداریی هی ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا. واتە: کۆیلەی ئازادکراو، ئەگەر خزمی کەلەپوورگری لە باوانی نەبوو، ئازاد کەرەکەی دەبێ بە هەقداریو کەلەپوورەکەی دەگرێ، جا ئەگەر مردووەکە کەلەپوورگری نەبوو سامانەکەی دەدرێ بە گەنجینەی موسوڵمان، کە مەشهوورە بە بەیتولمال، کە بە واتا: گەنجینەی سامانو داراییە. بەڵام بە مەرجێ کە بەپێی شەرعی پیرۆز ببرێ بەڕێوە، دەنا ئەگەر گەنجینەی سامانی موسوڵمانان ڕێکو پێك نەبوو ئەوە دەدرێ بە خاڵوان، چونکە بە کۆی دەنگو بەپێی یەکگرتن کەلەپوور لە حاڵیوادا یا دەدرێ بەوان یا دەدرێ بە گەنجینەی موسوڵمانان، جا هەرکاتی یەکێکیان دەستی نەدەدا، دەبێ بە حەتمی بدرێ بەوی تریان.

**رافعی دەفەرموێ:** گەورەزاناکانی چینی دووەمی مەزهەبی شافیعی کە ناودارن بە موتەئەخخیرین، ئەم فەرمایشتەیان ڕەوا دیوە، کە لەکاتی وادا کەلەپوور بدرێ بە خاڵوان. ئەوەوی دەفەرموێ: لەناو فەرمایشتەکاندا ئەمە دروسترینیانە. ئەم زاتانەیش بە دروستی دادەنێنو فەتوایان پێداوە: ئیبنو سوراقەو صاحیبی حاویو قازی

حوسەین‌و موتەوەللی‌و کەسانی تریش. ئیبنو سوراقە[1] دەفەرموێ: ئەمە فەرمایشتی تێکڕای مامۆستاکانمانەو ئەمڕۆ لە ولآتا فەتوا لەسەر ئەمەیە.

کاتێ کەلەپوور دەدرێ بە خاڵوان (واتە: بەزەویلئەرحام) کە کەس لە خاوەن بەشەکان لە مەسەلەکەدا نەبێ، مەگەر ژن‌و مێرد، چونکە ئەگەر کەسێ لە خاوەن بەشەکان هەبێ چی مایەوە لە خاوەن بەشە دیاریکراوەکان بەڕەدد دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەوان.

**مەسەلەیێ:**

ئەگەر چەند کەسێ خزمی یەکتری بوون‌و بە کۆمەڵ مردن‌و نەدەزانرا کە کامیان پێش کامیانا لە مردووە، وەك ئەوە هەموو پێکەوە لە پاپۆڕێکا نوقم بوون، یا لە فڕۆکەیەکا بەربوونەتەوە، یا دیوارێ یا خانوویێ رووخا بە سەریانا، یا لە جەنگێکا کوژران، ئەمانە وا دادەنرێن کە گشتیان پێکەوە مردوون، لەبەر ئەوە لە ناوخۆیانا کەلەپوور لە یەکتری وەرناگرن، بەڵکوو کەلەپووری هەریەکێ لەوان دەدرێ بە کەلەپوورگرە زیندووەکانی خۆی.

---

[1] ئیبنو سوراقە لە زانا گەورەکانی موتەقەددیمینە، لە پێش چوارسەدی کۆچیدا ژیاوە. تەماشای موغنی موحتاج بەرگی سێیەم لاپەڕە (٧) بکە.

- وەرگێڕ -

**خاڵوان کێ و کێن؟:**

خاڵوان له زماندا به بەرەی خاڵ دەگوترێ، که برێتین لـه خـزم‌و کەسوکاری دایك، بەڵام له عورفی شەرعا: به هەموو خزمێ دەگوترێ کـه خـاوەن بەشـه پـشکی دیـاریکراو نـەبێ‌و، بـەپێی عـورفی شـەرعیش لـه باوانی به مەعنا عەصەبه نەبێ. ئەمانەیش به کورتی ئەم یازده بەشەن که زوربەیان له خاڵوانن:

١) ئەو باپیرو نەنکانه که میراتبەری هەمیشەیی نین.

٢) منالی کچی مردووەکه، چ کورپن‌و چ کچ بن.

٣) کچی برا، خوای برای باوکی‌و دایکی بێ، یـاخود بـرای بـاوکی بێ، یا برای دایکی بێ.

٤) کوڕی برای دایکی.

٥) منالی خوشك چ کوڕبێ چ کچ.

٦) مامی دایکی.

٧) کچی مام هەر مامەیەك بێ.

٨) خوشکی باوك.

٩) خوشکی دایك.

١٠) برای دایك.

١١) ئـەو کەسـانەی کـه بـەهۆی یـەکێ لـەم بەشـانەی سـەرەوە دەگەنەوە به مردووەکه.

## ٢٤٤) چۆنیێتیی دابەشکردنی کەلەپوور بەسەر خاڵواندا:

**دوو ڕێگە هەیە بۆ دابەشکردنی کەلەپوور بەسەریاندا :-**

**ڕێگەی یەکەم:** پێی دەڵێن، ڕێگەی لە شوێن دانان، برێتییە لەوە ئەو خاڵوانانەی کە لە مەسەلەکەدا هەن لە جێگەی ئەو باوان و خاوەن پشکە مردووە دادەنرێن کە دەیانگەیەنن بە مردووەکە، وە ڕێك پشك یا بەشی ئەو کەسە گەیەنەرە دەدرێ بەوانیش. بفەرموو لەگەڵ کردنەوەی چەند نموونەیەکا:

**١) ئەگەر مردوویێ ئەم خاڵوانانەی لەدوا بەجێما:**

**أ- کچی کچ.**

**ب- کوڕی خوشکی هەق (أخت شقیقە).**

**ج- کچی برای باوکی.**

**د- کچی مام.**

ڕێك سەیری ئەو کەسانە دەکەین کە ئەمانە دەگەیەنن بە مردووەکە، کەواتە وەك بڵێی مەسەلەکە ئەم چوارکەسەی تیایە: کچ و خوشکی هەق و برای باوکی و مامە، لەم مەسەلەیەدا برای باوکی و مامە بێ بەش دەبن بە خوشکە باوك و دایکییەکە چونکە لەگەڵ کچی مردووەکەدا کۆبۆتەوە، وە ئەصڵی مەسەلەکە لە دووە، کەواتە نیوە کە پشکی کچە دەدرێ بە کچی کچەکە، ئەونیوەکەی تریش کە پشکی خوشکی هەقە دەدرێ بە کوڕەکەی.

٢) ئەگەر مردووەکە ئەمانەی هەبوو کە لە خاڵوانن:

أ- کچی کچ.

ب- کچی کچی کوڕ.

ج- کچی مامی هەق کەلەپوورەکە ئاوا دابەش دەکرێ: وا دادەنرێ کە مەسەلەکە کچێك‌و کچێکی کوڕو مامێکی هەقی تیادایە، پشکی کچ نیوەیە دەدرێ بە کچەکەی، پشکی کچی کوڕ شەشیەکە دەدرێ بە کچەکەی، چی مایەوە بۆ مامەیە کە سێیەکە دەدرێ بە کچەکەی.

٣) ئەگەر مردووەکە کچی کچی کوڕو کچی برای هەق (شەقیق)ی هەبوو، مەسەلەکە ئاوا دەکرێتەوە:

کچی کوڕ، نیوەی دەکەوێ دەدرێ بە کچەکەی، برای هەقیش باوانە چی مایەوە بۆ ئەوە، کە لەم مەسەلەیەدا نیوەیە دەدرێ بە کچەکەی.

بناغەی ئەم بۆچوونە ئەم دوو مەسەلەیە: جارێ مردوویێ بەس خوشکێکی باوك‌و خوشکێکی دایکی دەبێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاوا کەلەپوورەکەی بەش دەکا لە نێوانیاندا: دوو سێیەکی دەدا بە خوشکی باوکی‌و سێیەکیشی دەدا بە خوشکی دایکی، جارێکیش ئیبنو مەسعوود کەلەپوورەکەی کرد بە دوو بەشەوە لە نێوانی کچی کچ‌و کچی خوشکدا، هەر وەك چۆن مردوویێ تەنیا کچێك‌و خوشکێکی هەبێ، هەریەکەیان نیوەی ماڵەکەی دەکەوێ ئاوا.

فەرموودەکەی پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} ئەوە دەگەیەنێ کە لەکاتی دابەشکردنی کەلەپووردا بەسەر خاڵوانا تەماشای خودی خۆیان ناکرێ، بەڵکوو حسێبی ئەو کەسەیان بۆ دەکرێ کە دەیانگەیەنێ بە مردووەکە، کە یا خاوەن بەشن یا باوانن. دیارە خوشکی باوك بە هۆی باوکەوەو خوشکی دایك بەهۆی دایکەوە دەگەنەوە بە مردووەکە، لەکاتی وادا کەلەپوورەکە هی باوك‌و ایکە، سێیەك: بە بەش هی دایکەو چی مایەوە هی باوکە. رەوا دیتنەکەی ئیبنو مەسعوودیش ئەم تەفسیرە بۆ مەسەلەکە دووپات دەکاتەوە. ئیمام ئەحمەدو دواییان (متأخرين) لە ملیکییەو شافیعییەکان ئەگەر گەنجینەی سامانی موسوڵمانان ریکوپێك نەبوو، لەسەر ئەم شێوەی یەکەمە کەلەپوورەکە دابەش دەکەن بەسەر خاڵواندا، کە بەعەرەبی ناودارن بە زەویلئەرحام.

**رێگەی دووەم:** پێی دەگوترێ رێگەی خزمترین، ئەم دەستەیە، کێ خزمتر بێ بە مردووەکە ئەوە وەپێش دەحەن – بە پێی ریزری باوان، لە باوانا کوری کوڕ دەخرێتەپێش باوکی باوکەوە، جا بەم شێوەیە لە خاڵوانیشدا منالی کچ پێش باوکی دایك دەخرێ!.

## ٢٤٥) بەشە دیاریکراوەکان (الفروض المقدره):

پشکە دیاریکراوەکان (کە لە قورئانی پیرۆزدا روون کراونەتەوە) شەش پشکن: نیوە، چواریەك، هەشتیەك، دوو سێیەك، سێیەك، شەشیەك. خاوەنی ئەم پشکانە چەند تاقمەیەکن، نیوە بەشەپشکی ئەم پێنج تاقمەیە:

**یەکەم**: تاقە کچ، واتە: ئەوەی خوشك‌و برای خۆی لەگەڵدا نەبێ. یەزدانی مەزن دەفەرموێ: {وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ – سورة النساء – ١١/٤} واتە: ئەگەر تاقە کچێکی هەبوو نیوەی کەلەپوورەکەی دەکەوێ.

**دووەم**: تاقە کچێکی کوڕ، نە خوشك‌و برای خۆی‌و نە منداڵی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ، ئەمەیش بە یەکگرتن وایە.

**سێیەم**: تاقە خوشکێکی هەق کە برای لەگەڵدا نەبێ، بەپێی ئایەتی: {وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ – سورة النساء – ١٧٦/٤}.

**چوارەم**: تاقە خوشکی باوکی، کە نە بارو نە خوشکی هەق‌و نە کوڕو کچی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ چونکە ئەمیش بەپێی رووکار (ظاهر)ی ئایەتەکە بەردەکەوێ.

**پێنجەم**: مێرد، کە ژنەکەی منداڵ‌و منداڵی منداڵی خاوەن کەلەپووری نەبێ. خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ – سورة النساء – ١٢/٤} واتە: نیوەی کەلەپووری ژنەکانتان بۆ ئێوەیە، ئەگەر منداڵیان لەپاش بەجێ نەمابوو. دیارە کە بەپێی دەقی ئایەتەکە ئەوەی کە هەق منداڵی خۆی (ولد الصلب) بێ بەردەکەوێ، منداڵی کوڕیش (ئەگەر ئەوە بسەلمێنین کە بەر ناوی منداڵ دەکەوێ ئەوە ئەویش) بەردەقی ئایەتەکە دەکەوێ، ئەم ئایەتەیش نیشانەی ئەم بۆچوونەیە کە دەفەرموێ: (یا بنی آدم)

ئەوەتا خودا لە پاش چەندین پشت بە بەرەی ئادەم دەفەرمویٚ: ئەی کوڕەکانی ئادەم! هەروا ئەم فەرموودەیەیش نیشانەی ئەوەیە کە وشەی (وەلەد – منالٚ) لە قورئانا منالٚی منالٚ دەگرێتەوە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: (أنا ابن عبدالمطلب: من کوڕی عەبدولموطەلیبم) چونکە ئاشکرایە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} منالٚی منالٚی عەبدولموطەلیبە، ئەگەر ئەوە نەسەلمێنین، ئەوە بە یەکگرتن، واتە: بە إجماع، منالٚی کوڕ لە پایەی کوڕدایە، لە کەلەپوورو باوانیدا.

## چواریەکیش بەشە پشکی دوو تاقمە:

**یەکەم:** مێردێ کە ژنەکەی منالٚ یا منالەزای میراتبەری هەبێ.

**دووەم:** ژنێ، یا زیاتر لە ژنێ، تا چوار ژن، کە مێردەکەیان منالٚ یا منالٚی منالٚی نەبێ، بەپێی ئەم ئایەتە: {فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ} هەشتیەکیش بەشە پشکی یەك ژن یا زیاتر لە یەك ژن کە مێردەکەیان منالٚ یا منالەزای کەلەپوور بەری هەبێ. وەك لە قورئانا دەفەرمویٚ: {فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ – سورة النساء – ١٢/٤} یەکگرتنیش لە سەری دامەزراوە. دوو سێیەکیش (واتە: دوو بەش لە سێ بەشی مالٚ) بەشەپشکی چوار تاقمە:

**یەکەم:** دوو کچ، یا زیاتر لە دوو،بەو مەرجە کە برایان لەگەلٚ نەبێ.

**دووەم**: دوو کچی کوڕ یا زیاتر، بەو مەرجە نە لەگەڵ برای خۆیانو نە لەگەڵ چینێکی لای سەرووی خۆیانا نەبن، لە منداڵو لە منداڵی منداڵی مردووەکە.

**سێیەم**: دوو خوشکی باوکیو دایکی یا زیاتر لە دوو خوشك، بەو مەرجە نە لەگەڵ برای خۆیانا وە نە لەگەڵ منداڵی مردووەکەدا نەبن.

**چوارەم**: دوو خوشکی باوکی یا زیاتر، بەو مەرجە نە لەگەڵ برای خۆیانا، وە نە لەگەڵ خوشکی باوکیو دایکی، یا برای باوکیو دایکیدا، وە نە لەگەڵ منداڵی مردووەکەدا نەبن. دوو کچ یا زیاتر بەپێی ئەم ئایەتە دوسێیەکیان دەکەوێ: {فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ} . ئەگەر بگوترێ: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بەشە پشکی زیاتر لە دوو کچ دوو سێیەکە، ئەدی چۆن دەبێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەیش کە بەشەپشکی دوو کچیش هەر دووسێیەکە؟ لە وەڵاما دەڵێین: ئەم ئایەتە بەهۆی مەسەلەیەکی تایبەتەوە هاتووە، کە ئاوایە: ژنەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع، ئەو دوو کچەی کە لە سەعد بوون، هێنانی بۆ لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم دوو کچەم کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعن، باوکیان لە غەزای ئوحوددا لەگەڵ تۆدا بوو، کە شەهیدکرا، ئێستایش مامەکەیان هەرچیماڵیان هەیە بردوویەتی بۆ خۆی وە هیچی بۆ ئەمان نەهێشتۆتەوە، بەبێ ماڵیش کەس نایان خوازێ. فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: خودا بۆ خۆی بۆ ئەم بابەتە بڕیاردەدا، پاش ئەوە ئایەتی دابەشکردنی کەلەپوور هاتەخوارەوە کە دەفەرموێ: {يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ} ئەوجا

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) ناردی بە شوێن مامەکەیاناو فەرمووی: دوو سێیەکی ماڵەکە بدە بە هەردوو کچەکەی سەعد، وە هەشتیەکی بدە بە دایکیان، وە چیمایەوە لە وان ئەوە هی تۆیە. (ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە). ئەوەتا مەوریدی فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بەشی دوو کچیش هەر دووسێیەکە. هەندێ ئاوا بەڵگەسازی دەکەن بۆ ئەم مەسەلەیە: دەفەرموون: کە وشەی (فوق) لە (فوق اثنتین)یدا زائیدەیە، بۆ مەبەستی ڕەوانبێژییە، دەق وەك وشەی ئەو (فوق)ە وایە کە زائیدەیەو وا لەم ئایەتەی تردا کە دەفەرموێ: {فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ} هەندێ تر دەڵێین: مەبەست لە وشەی (فوق الثنتین) لەم ئایەتەدا ئەمەیە: ئەگەر دوو کچ یا زیاتر لە دوو کچ بوون! واتە: ڕواڵەتی ئایەتەکە مەبەست نیە کە بەرواڵەت ئەوە دەگەیەنێ دوو سێیەك بەشی زیاتر لە دوو کچە. هەندێ زانای تر ئەمە دەکەن بە بەڵگە: پەیوەندیی خوشك بە مردووەکەوە بێ هێزترە لە پەیوەندیی کچ، دەی لە شوێنی دوو سێیەك بەشی دوو خوشك بێ، دەبێ باشتر ببێ بە بەشی دوو کچ!. دوو کچی کوڕیش لەبەر ئەمە دوو سێیەکیان دەکەوێ چونکە یاسایەکی ڕەسایە کە هەرکاتێ دوو کچی کوڕ خۆیان بە تەنها بوون ڕێك وەك دوو کچ وان. دوو خوشكو زیاتریش کە دوو سێیەکیان دەکەوێ بەپێی ئەم ئایەتەیە: {فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ} . جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) فەرمووی: نەخۆش بووم، هۆشم نەبوو، حەوت خوشکم هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ سەردانم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! چی لە ماڵەکەم بکەم، میراتو کەلەپوورەکەم بۆ کێیە؟ چونکە من تەنیا

چەن خوشکێکم هەن، کە کەلەپوورم لێبگرن‌و کەسی ترم نیە، نە باوك‌و نە دایك‌و نە منالّ، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەرچوو لەلای من‌و لە پاشا گەڕایەوەو فەرمووی: سەبارەت بە بابەتی خوشکەکانت خودا قورئانی ناردۆتە خوارەوە، وە باسەکەی روون کردۆتەوە، وە دووسێیەکی بۆیان داناوە! جابیر دەیفەرموو: ئایەتی کەلالە هۆی هاتنەکەی من بووم، دەی ئەوا بە پێی ئەم فەرموودەیە دەرکەوت مەبەست لە ئایەتەکە ئەمەیە: پشکی دوو خوشك یا زیاتر لە دوو خوشك دوو سێیەکە.

## سێیەکیش بەشە پشکی دوو تاقمەیە:

**یەکەم**: دایکی مردووەکە، بەو مەرجە کە مردووەکە منالّی نەبێ‌و کوڕەزایشی نەبێ، وە ژمارەیەکیش لە براو خوشکی نەبێ.

**دووەم**: ژمارەیەك لە براو خوشکی دایکی، کە لە دوو کەس کەمتر نەبن، نێرو مێیان تیادا هاوبەشن بە یەکسانی.

هەندێ جاریش سێیەك دەدرێ بە باپیرە کە لەگەلّ براو خوشکی مردووەکە کۆببێتەوە. بەشە پشکی دایك کە لەم دوو کاتەدا ئاوایە لەم ئایەتە وەرگیراوە: {فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ – سورة النساء – ١١/٤} . وەك لە پێشەوە باسکرا کوڕەزایش وەك کوڕ وایە. ئەوەیش کە دەڵێین: ژمارەی براو خوشکەکان لە دووکەس کەمتر نەبن، گەرچی ژمارەکەیان لە ئایەتەکەدا بە داڕێژگە (صیغە)ی کۆیە، کۆ (جەمع)یش

له سێ کەسەوە دەست پێدەکا، نەك لە دووەوە، ئەمە لەبەر ئەمەیە:
چونکە جارو بار بۆ دوویش کۆ بەکار دەهێنرێ!.

ئیبنو عەبباس بە عوسمانی فەرموو: تۆ چۆن بەشی دایك بە دوو برای مردووەکە لە سێ یەکەوە دەبەی بۆ شەش یەك، کەی دووبرا لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (اخوة)؟ عوسمان {رەزای خوالە هەموویان بێ} فەرمووی: هەرشتێ لە پێش جێنیشینیی مندا، لە سەردەمی پێغەمبەرو ئەبو بەکردا سەری گرتبێ‌و بەناو وڵاتو شارانا پەخش بووبێتەوە، من ناتوانم دەستکاری بکەم‌و هەڵی بوەشێنمەوە، مەبەستی ئیمامی عوسمان لەم وەڵامە ئەوەیە: کە پێش ئەوەی کە ئیبنو عەبباس ئەم رەخنەیە بگرێ موسوڵمانان بە کۆمەڵی بەو شێوەیە بەشیان بۆ دایك داناوە، ئەی فەرائیز خوا! بزانە لە دوو وێنەدا دایك سێیەکی ئەوە دەبا، کە پشکی مێرد، یا ژنی لێ دەردەکرێ.

**شێوەی یەکەم:** مێردێك‌و باوك‌و دایکێ. نیوەی هی مێردەکەیە، سێیەکی باقی (کە شەش یەکی سەرجەمی کەلەپوورەکەیە) بۆ دایکەو هەچیش لە دایکەکە مایەوە کە دوو سێیەکی باقییە بۆ باوکە.

**شێوەی دووەم:** ژن‌و باوك‌و دایکی مردوو بکەونە یەك. چواریەکی سەرجەمی کەلەپوورەکە بۆ ژنەکەیە، سێیەکی مەندە (باقی)یەکەی بۆ دایکەکەیە، مەندەکەیشی بۆ باوکەکەیە. کەواتە: پرسیار (ئەسئلە)ی یەکەم لە شەشە، چونکە پشکی مێردەکە نیوەیەو پشکی دایکەکەیش سێیەکی نیوەیەو لێ دەرهێنراو (مەخرەج)ی سێیەکی نیوە شەشەو بەشی مێردەکەی لەناودایە، جا لەو شەشە مێردی

مردووەکە سێ بەش دەباو دایکەکەی بەشێك، چونکە سێیەکی نیوەکە کە ماوەتەوە یەکە، وە باوکەکەیش دوو بەش دەبا. پرسیاری دووەمیش لە دوازدەیە، چونکە بەشی ژنەکە چواریەکەو بەشی دایکەکە سێیەکی چواریەکە باقی یەکانە. لێ دەرهێنراوی سێیەکی چواریەکەکان دوازدەیەو چوار لەناو دوازدەدایە. سێ بەش لە دوازدە، کە چواریەکی سامانەکەیە بۆ ژنەکەیەو، سێ بەشی کەسێیەکی نۆ بەشە باقییەکەیە بۆ دایکەکەیەو، شەش بەشیش بۆ باوکەکەیە.

بەڵام ئیبنو سورەیج رای وایە: کە لەم دوو کاتەیشدا دایك سێیەکی تەواوی سەرجەمی ماڵەکەی بۆ هەیە، بەڵگەیشی ئەوەیە کە رواڵەتی ئاشکرای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ. ئەوەیش کە گوتمان بەشی دوو برای دایکی، یا دوو خوشکی دایکی، یا زیاتر لە هەردوولا، سێیەکە بەپێی ئەم ئایەتەیە: {فَإِن كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ – سورة النساء – ١٢/٤} چونکە ئەم ئایەتە لە بارەی کەلەپووری منالی دایکییەوە هاتووە. شەشیەکیش بەشە پشکی حەوت تاقمە:

**یەکەم**: دایکی مردووەکە، بەو مەرجە مردووەکە کوڕ یا کوڕەزای ببێ، یاخود ژمارەیەکی لە براو خوشك ببێ لە دوو کەمتر نەبن. بەڵگەی ئەمە ئەم فەرمایشتەی زاتی مەزنە: {وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ – سورة النساء – ١١/٤} لەگەڵ ئەم فەرمایشتەیدا: (فان كان له اخوة فلامه السدس) لە پێشەوە باسی

ئەوەمان کرد کە کوڕەزا وەك کوڕ وایە، باسی ئەوەیشمان کرد کە جارو بار داڕێژگەی کۆ بۆ دوویش بەکار دێ.

**دووەم**: نەنکی مردووەکە، بەمەرجێ دایکی نەمابێ، ئیتر خوای دایکی دایکی مرووەکە بێ، یا دایکی باوکی مردووەکە بێ جیاوازی نیە، هەرچەند بەرەو زووریش بڕوا، چونکە قوبەیصەی کوڕی ذوئەیب دەفەرموێ: نەنکێ هات بۆ خزمەتی ئەبو بەکر، داوای بەشە پشکی خۆیی لێ کرد لە هی مردوویەك، فەرمووی: لە قورئانا کە نامەی خودایە، بە دەق هیچ بۆ نەنك دیاری نەکراوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا لە بارەی ئەم پرسیارەی تۆوە خۆم ئاگام لە هیچ وەڵامێ نیە، جا تۆ بڕۆرەوە هەتا پرسیار لە هاوڕێیان دەکەم، جا کە پرسیاری کرد، موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی خۆم بە دیارەوە بووم کە حەزرەت {درووودی خوای لەسەربێ} شەش یەکیدا بە نەنك. ئەبو بەکر پێی فەرموو: کەسی تر لەگەڵ تۆدا هەیە کە ئاگای لەم مەسەلەیە بێ؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیش هەڵسا فەرمووی: منیش بە دیارەوە بووم. جا ئەبو بەکر شەش یەکەکەی داپێی. پاش ماوەیێ نەنکەکەی تریش هات بۆ لای حەزرەتی عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} داوای بەشی خۆی لێکرد، فەرمووی: لە قورئانا کە نامەی خوایە، بە دەق هیچ بۆ نەنك دیاری نەکراوە، ئەو حوکمەیش کە لە سەردەمی ئەبو بەکردا دراوە بۆ نەنکەکەی تر بوو، بۆ تۆ نەبوو، منیش لە خۆمەوە ناتوانم پشکێ لە پشکەکانی کەلەپوور پتر بکەم، وەکی تریش خۆی هەر ئەو شەشیەکەیە، جا ئەگەر ئێوەی نەنك هەردوولاتان یەکتان گرت: ئەوا شەشیەکەکە نیوەییتانە هەر کامێکیشتان هەر تەنها خۆی بوو ئەوە هی خۆیەتی.

زەیدیش {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} شەشیەکی دەدا بە نەنك، مەرجێ دایکی نەمابێ، جا هەر کاتێ دوو نەنك کە لە بەیەك پایەدا بوون کۆبوونەوە ئەوە بەپێی ئەسەرەکەی قوبەیصە شەشیەکەکە ناوکۆییانە. بەڵام ئەگەر نەنکێکیان لەوی تریان لە مردووەکەوە نزیکتربوو، ئەوە سەرنج دەدەین ئەگەر ئەو نەنکە نزیکترە لە لایەنی دایکەوەبوو، وەك دایکی دایك، لەگەڵ دایکی دایکی دایكو، لەگەڵ دایکی باوکی باوکدا یەك بگرن، ئەوە نزیکە کە دوورەکان، بێ بەشی تەواو دەکات، خوای لە لایەنی دایکەوەبن، یا لە لایەنی باوکەوەبن، دایکی خۆی بۆیە بێ بەش دەکات چونکە بەهۆی خۆیەوە دەگاتەوە بە مردووەکە، دایکی باوکی باوکیش بۆیە بێ بەش دەکا چونکە دوور ترە، یاسایەکی ڕەساویشە کە پلەی نزیك پلەی دوور لەکار دەخات. وەلێ ئەگەر ئەو نەنکە نزیکترە لە لایەنی باوکەوە بوو، وەك دایکی باوكو دایکی باوکی دایك، ئەوە نزیکە کە دوورەکە بێبەش ناکا، بەڵکوو هەردوو لایان دەبن بەهاوبەش لە شەش یەکدا، چونکە نەنکێ لە لایەنی دایکەوەبێ بە باوك بێبەش ناکرێ، دەی کەواتە بە نەنکێ کە بەهۆی باوکەوە بگاتەوە بە مردووەکە باشتر بێبەش ناکرێ!.

**سێیەم**: شەشیەك بەشە پشکی کچی کوڕە کاتێ لەگەڵ کچی هەقی مردووەکەدابێ، یا لەگەڵ کچی کوڕێکی لە خۆی نزیکتردابێو برایشی لەگەڵدا نەبێ. چونکە هوذەیلی کوڕی شەرەحبیل {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پرسیار کرا لە ئەبو مووسا: مردووەیەك هەیە، کچێكو کچی کوڕێكو خوشکێکی هەیە، کەلەپوورەکەیان چۆن لێ بەش دەکرێ؟ فەرمووی: نیوەی بۆ کچەکەیەتیو نیوەی بۆ خوشکەکەیەتی، وە کچی

کوڕەکەی هیچی ناکەوێ، وەبشچۆ بۆلای ئیبنو مەسعوود لەویش بپرسە، دەبینی ئەویش هەر وەك من دەڵێ، جا پرسیارکرا لە ئیبنو مەسعوود، وە قسەکەی ئەبو موساشیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر وابێ دەبێ من رێگەم هەڵەکردبێ‌و سەرم لێ شێوابێ، بەلاّم من لەم مەسەلەدا وەك پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەربێ) بڕیار دەدەم‌و حووکم دەکەم: بۆ کچەکە نیوە هەیە، بۆ کچی کوڕەکەیش شەش یەك هەیە، کە بە هەردوولا دەکەنە دوو سێیەك، وە هەرچیش لەوان مایەوە بۆ خوشکەکەیە. جا چووینەوە بۆ لای ئەبو مووساو قسەکەی ئیبنو مەسعوودمان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئێوە کە ئەم زانا گەورەیەتان لە ناودایە لەمن مەپرسن (بوخاری‌و ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نەسائی).

کچی کوڕ ئەگەر لەیەك پتر بوون شەشیەك وەك یەك ناوکۆیی یانە بە یەکسانی، ئەگەر کچی هەقی مردووەکەیش لە یەك زیاتر بوون ئەوە تەواوی دوو سێیەکەکە کە دەبەن بۆ خۆیان‌و هیچ بۆ کچی کوڕ نامێنێتەوە.

**چوارەم:** بۆ خوشکی باوکییە، یەکێ بێ یا زیاتر، بەو مەرجە لەگەڵ خوشکێکی باوکی‌و دایکی دابێ‌و برایشی لەگەڵدا نەبێ. چونکە هەموو خوشکێ لەیەك پلەدان، کە پلەی خوشکایەتییە بەلاّم خوشکی هەق بەهۆی زیاتری تەرەفی خزمایەتییەوە لە پێشترە، بۆیە خوشکی باوکی لەگەڵ خوشکی هەقدا حسێبی کچی کوڕی بۆ دەکرێ لەگەڵ کچی هەقی مرووەکەدا (بنت الصلب للميت). جا خوشکە باوکییەکان یەك بن یا پتر ئەو شەشیەکە ناوکۆییانە، رێك وەك چەند کچێکی کوڕ کە لەگەڵ کچێکی هەقدا کۆببنەوە شەشیەك ناوکۆیيانە ئەمانەیش ئاوا.

**پێنجەم**: بۆ باوکە، بەو مەرجە مردووەکە منالّ یا کوڕەزای هەبێ چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ - سورة النساء – ١١/٤}.

**شەشەم**: بۆ باپیرەیە، بەو مەرجە باوکی مردووەکە نەمابێ، وە مردووەکە منالّ یا کوڕەزای ببێ، ئەمەیش بەپێی یەکگرتن.

**حەوتەم**: بۆ تەنها برای دایکی یا تەنها خوشکی دایکییە. چونکە خوای مەزن دەفەرموێ: {وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ – سورة النساء – ١٢/٤} ئەم ئایەتە بۆیە دەبێ بە بەلّگە بۆ ئەم بڕیارە، چونکە بۆ روونکردنەوەی بەشی برای دایکیو خوشکی دایکی هاتوە، بە بەلّگەی خوێندنەوەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصو ئیبنو مەسعوود (رەزای خوایان لێبێ) کە لە قیرائەتی ئەوانا ئاوایە: {وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ مِن بَعْدِ أم}. چونکە زانایانی شەرع دەفەرموون: (قیرائەتی شاذذە لە پایەی فەرمووەدایە) کەواتە: بڕیاری پێ دەچەسپێ، واتە: حوکمی پێ ثابت دەبێ.

## ٢٤٦) بێبەشبوونی نەنکەکان بەهۆی دایکی مردووەکەوە:

ئەی کەسێ دەتەوێ شارەزای زانستی کەلەپوور زانیبێ! بزانە کە هەموو نەنکێ، خوای لە تەرەفی دایکەوەبێ، وەك دایکی دایك، یا لە تەرەفی باوکەوەبێ وەك دایکی باوك، هەر چەند بەرەو ژورتریش بڕوا،

بە دایکی مردووەکە بێ بەشی تەواو دەبێ. هۆی ئەم بێبەشبوونەیش ئەوەیە ئەم شەش یەکە کە دەدرێ بەمان لە بنەڕەتدا هی دایکە، کەواتە هەرکاتێ دایك خۆی مابوو دەدرێ بە خۆیی‌و هیچ بۆ ئەمان نامێنێتەوە، رێك وەك چۆن ئەگەر باوك مابوو باپیر بێ بەش دەبێ ئاوا.

**لاباسێ:**

**پرسیارێ:** مردوویێ دایکی دایك‌و دایکی باوك‌و باوکی هەبێ. دەڵێین: نەنکی تەرەفی دایك کەس بێبەشی ناکا دایك خۆی نەبێ، بەلام نەنکی تەرەفی باوك بە باوکیش‌و بە دایکیش بێبەش دەبێ، کەواتە لەم پرسیارەدا دایکی باوك کە نەنکی تەرەفی باوکە بێبەش دەبێ بە باوکەکە، بەلام دایکی دایك، کە نەنکی تەرەفی دایکە، شەشیەکی بۆ هەیە بە تەواوی، مەندەی ماڵەکەیش بۆ باوکەکەیە بە باوەنێتی بۆی ماوەتەوە.

## ٢٤٧) بێبەشبوونی تەواوی براو خوشکی دایکی بەهۆی ئەم چەند کەسەوە:

براو خوشکی دایکی بێبەشی تەواو دەبن بە باوك‌و باپیرەو بە منداڵی مردووەکە، خوای نێرینە بن یا مێیینە، بە کوڕەزایش براو خوشکی دایکی دیسان بێبەش دەبن، هەر چەند بەرەو خواریش بوو‌بێتەوە. چونکە خوای گەورە کەلەپووری خوشك‌و برای دایکی لەناو بەشی کەلالەدا داناوە. کەلالە واتە: مردوویەکی کەلەپوور بەخش کە نەوەچەو نە بنەچەی نەمابێ.

## ٢٤٨) بێبەشبوونی تەواوی براو خوشكی باوكی:

براو خوشكی باوكی بە تەواوی بێبەش دەبن بە باوكو بە كوڕو بە كوڕی كوڕو بە برای باوكیو دایكی، چونكە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەموو خاوەن بەشێ، بەشە پشكی دیاری كراوی خۆی پێبدەن، بەپێی دەقی ئایەتەكانی قورئان، ئینجا هەرچی مایەوە لە خاوەن بەشەكان، ئەوە بۆ خزمەترین كەسە، بەمەرجێ كە نێرینەبێ (ش/ د/ ت) دەی بێگومان كە باوكو كوڕو كوڕی كوڕ نزیكترن لە برا، برای باوكیو دایكی پێش دەخرێ لە برای باوكی چونكە لە تەرەفی دایكیشەوە دەگاتەوە بە مردووەكە، پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: برای باوكیو دایكی كەلەپوور لە یەكتری دەگرن، ئەگەر برای باوكییان لەگەڵ بوو، ئەو كەلەپوور ناگرێ.

## ٢٤٩) بێبەشبوونی تەواوی برای باوكیو دایكیو خۆشكی دایكیو باوكی:

ئەمانیش بێبەش دەبن بەم سێ كەسە: بە كوڕو بە كوڕی كوڕو بە باوك، چونكە ئەم سێ تاقمە لە خوشكو برا نزیكترن بە مردووەكە، كەواتە بەر بڕیارە گشتیەكەی فەرمایشتەكەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەكەون كە دەفەرموێ: (.. بۆ خزمترین كەسە..) ➡.

## ٢٥٠) چوار کەس هەن خوشکی خۆیان دەکەن بەباوان (واتە: بەعەصەبە).

کوڕو کوڕی کوڕو برای هەق‌و برای باوکی، خوشکی هاوپایەی خۆیان دەکەن بە باوان، بەم چوارکەسە نەبێ، خوشك بەکەسی تر نابێ بە باوان، جا لەکاتی کۆبوونەوەی ئەمانەدا لەگەڵ خوشکیانا، کەلەپوورەکە ئاوا دابەش دەکرێ: لە بۆ کوڕ دوو هەوەندەی بەشی کچێ هەیە. کوڕ کە خوشکی خۆی دەکا بە باوان بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ} کوڕی کوڕیش (وەك چەند جار دووپاتمان کردەوە) بەرمناڵی مرۆڤ دەکەوێ، ئەگەر بەربکەوێ ئەوا باشەو ئەویش بە پێی ئەم ئایەتە خوشکی خۆی دەکا بە عەصەبە، دەنا بە قیاس لەسەر کوڕ چەسپاوە کە خوشکی خۆی دەکا بە باوان. برایش کە خوشکی خۆی دەکا بە باوان بەپێی ئەم ئایەتەی ترە: {وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ} بۆیەیش تەنیا ئەم چوارکەسە خوشکی خۆیان دەکەن بە باوان‌و کەسانی تر بێجگە لەمانە خوشکی خۆیان بۆ ناکرێ بە باوان چونکە خوشك لە غەیری ئەم چوارکاتەدا بێ کەلەپوورە، چونکە لە دەستەی خاڵۆانە! بۆ نموونە: مامە کە برای باوکە خوشکی خۆی بۆ ناکرێ بە باوان، چونکە خوشکی باوکی مردووەکەیشە، خوشکی باوکیش لە خاڵۆانە!.

## ٢٥١) ئەم چوار تاقمەیش خۆیان کەلەپوور دەگرن، بەڵام خوشکەکانیان کەلەپوور ناگرن:

مامەو کوڕی مامەو کوڕی براو باوانی ئازدکەر، مامەو کوڕی مامەو کوڕی برا بۆیە کەلەپوور دەگرن چونکە خۆیان لە باوانن، بەڵام خوشکەکانیان لە خاڵوانن، باوانی ئازادکەریش بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەلەپوور دەگرن: سەرداریی واتە: ولاءی بەندەی ئازادکراو دەق تانو پۆیە وەك تانو پۆی رشتەی هاوپشتی، نەدەفرۆشرێو نە دەبەخشرێ بە کەسێکی تر. (ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حەببانو حاکم گێڕاویانەتەوە) حاکم دەفەرموێ: رشتەکەی ساغە، بەڵام بەیهەقی دەفەرموێ: (زەدەدارە) دیارە کە هاوپشتیی رەچەڵەك برێتییە لە بەرەی باوان. جا هەرکاتێ مافی سەرداریی بۆ کەسێ دامەزرا، وە خۆی مرد ئەو مافە دەچێ بۆ باوانەکانی. کۆگر (ضابط)ی ئەو کەسەی کە بەهۆی سەرداریییەوە کەلەپوور دەگرێ: هەموو نێرینەیێ کە ببێ بە باوانی ئازادکەر. جا لەسەر ئەم بنیاتە هەرکاتێ بەندە ئازادکراوەکە لەپاش ئازادکەرە کەی مرد، وە لە هاوپشتی خۆی باوانی نەبوو، ئەوە کەلەپوورەکەی (یا ئەوەی لە بەشەپشك دەمێنێتەوە) دەدرێ بەنێرینەی باوانی ئازادکەرەکەی، بۆ نموونە: کۆنە بەندەیێ مرد، خاوەنە ئازادکەرەکەی نەمابوو، بەڵام ئازادکەرەکەی کوڕێكو کچێكو باوكو دایكو بایەكو خوشێکی بوو، کەلەپوورەکەی بۆ نیچرینەکەیانە، بەشی مێینەکانی لێ نادرێ.

## ٢٥٢) کەلەپووری باپیرە لەگەڵ براو خوشکدا:

هەرکاتێ باپیرەی تەرەفی باوك لەگەڵ براو خوشکی باوکیو دایکیدا، یا لەگەڵ براو خوشکی باوکیدا کەوتنە یەك، ئەوە ئەگەر خاوەن پشکیان لەگەڵدا نەبوو، کام بەشێ زۆرترە لە سێیەکی هەموو کەلەپوورەکە، یا لە برابەشی لەگەڵیاندا، باپیرە ئەوە دەبا، ئەوەیش بوزانین کە برایەك بە دوو خوشك دەژمێررێ، هەرکاتێ باپیرە بە برابەشی کەلەپووری گرت وەك یەك برا وایە، ئەگەر سێیەکی برد پاشماوەکەی کەلەپوورەکە لە نێوان خوشکەکاندا دابەش دەکرێ. جاری وا هەیە برابەشیو سێیەك وەکوو یەکن، وەکوو ئەوە ژمارەیان دوو قاتی باپیرەبێ، وەك باپیرە لەگەڵ دوو برادا، یا باپیرە لەگەڵ برایەكو دوو خوشکا، یا باپیرە لەگەڵ چوار خوشکا، لەم وێنانەدا سێیەكو برابەشی بۆ باپیرە وەك یەکن، بەڵام جاری وا هەیە سێیەك باشترە بۆی، دەستوری کۆگر بۆ ئەمە ئاوایە: ئەگەر براو خوشکەکان ژمارەیان کەمتر بوو لە دوو قاتی باپیرەکە، ئەوە برابەشی قازانجی زۆرترە، ئەگەر ژمارەیان دوو قاتی باپیرەبوو ئەوە سێیەكو برابەشی وەکوو یەکن، ئەگەر ژمارەیان لە دوو قاتی باپیرە پتر بوو، ئەوە سێیەك قازانجی زۆرترە. جۆری یەکەمی ئەم کۆگرە ئەم پێنج شێوەیەی هەیە:

١) باپیرە لەگەڵ یەك خزشکدا، لێرەدا پرسیارەکە لە سێیە، دوو بەش بۆ باپیرەکەو بەشێ بۆ خوشکەکە.

٢) باپیرەو دوو خوشك، پرسیارەکە لە چوارە، دوو بۆ باپیرەکەو دوو بۆ خوشکەکان.

٣) باپیرەو برا یەك، مەسەلەكە لە دووە، یەكێ بۆ باپیرەو یەكێ بۆ براكە.

٤) باپیرە لەگەڵ براو خوشكێكدا، پرسیارە كە لە پێنجە: دوو بۆ باپیرەكەو دوو بۆ براكەو یەك بۆ خوشكەكە.

٥) باپیرەو سێ خوشك. پرسیارەكە لە پێنجە دوو بۆ باپیرە، سێ بۆ سێ خوشكەكان.

**جۆری دووەم:** لە پێشەوە باسكرا.

**جۆری سێیەمیش:** شێوەی زۆرەو صورەتەكانی لەبەر زۆری نازمێرێ، وەك ئەوە كە باپیرە كۆببێتەوە لەگەڵ سێ برادا. لێرەدا مەسەلەكە لە سێیە، چونكە سێیەك باشترە بۆ باپیرە، یەكێك بۆ باپیرەو دوو بۆ سێ براكە، كە بەشناكرێ بە سەریاندا، جا سێ دەدەین لە سێ دەبێ بە نۆ، سێ بۆ باپیرەو شەش بۆ سێ براكە، یەكی دوو بەش.

هەتا ئێستا قەسەمان لەوەبوو كە خاوەن پشكیان لەگەڵدا نەبێ، بەلام ئەگەر خاوەن پشكیان لەگەڵدابوو ئەوە تەماشا دەكەین و بە پێی ئەم دەستوورەی دواوە بڕیار دەدەین، جارێ بابزانین ئەو خاوەن پشكانە كێ و كێن كە دەگونجێ لەگەڵ باپیرەو براو خوشكا كۆببنەوە: بریتین لەكچ و كچی كوڕو دایك و نەنك و مێردو ژن، كە شەش تاقمن[1].

---

[1] بەراستی لێرەدا ئەصڵەكە زۆر كورتەوەكراوە، بۆیە كەمێ درێژە بە باسكە دەدەین تا خوێنەری ئازیز بە باشی لێی حاڵی ببێ. من بۆ ئەوەی بۆ خۆم لە عیبارەتی ئەصڵەكە حاڵی ببم دەبێ زۆر بە وردی موتالای ئەم سەرچاوانەی تری بۆ بكەم: (كفایة

جا کاتێ باپیرەو خوشكو براو خاوەن بەشەپشكی دیاری كراو لە پرسیارێكا كۆبوونەوە، ئەوە سەرنج دەدەین: ئەگەر خاوەن پشكەكان هەموو كەلەپوورەكەیان دەبرد بۆ خۆیانو هیچ بۆ باپیرە نەدەمایەوە، یا بەس شەشیەك دەمایەوە لێیان، یا كەمتر لە شەشیەك دەمایەوە لێیان ئەوە لەم سێ حاڵەتەدا خوشكو براكان بێ بەشی تەواو دەبنو شەشیەك دلەسەر ئەم سێ شێوەی دواوە دەدرێ بە باپیرە.

١- **حاڵی یەكەم:** باپیرەو براو خوشكو دوو كچو دایكو مێرد. ئەم پرسیارە لە دوازدەیە، بەهۆی عەولەوە زیادی دەكەین بۆ سیازدە بۆ تەواوكردنی بەشی دایكەكە، وە بۆ پازدەیش بۆ پەیداكردنی شەشیەكی باپیرەكە. وە لەم ژمارەیەدا هەشتی بۆ دوو كچەكەو سێی بۆ مێردەكەو دووی بۆ دایكەكەو دووی بۆ باپیرەكەیەو براو خوشكەكە بێ بەشن بەهۆی ئەوەوە كە خاوەن پشكەكان هەموو كە لەپوورەكەیان داگرتووەو هیچ بۆ ئەوان نەماوەتەوە بە استغراق.

٢- **حاڵی دووەم:** باپیرەو دوو كچو دایكو برایەك. لێرەدا كچەكان دوو سێیەك دەبەنو دایكەكە شەشیەك دەبا، مەسەلەكە لە شەشە: چواری بۆ كچەكانو یەك بۆ دایكەكەو یەك بۆ باپیرەكە،

---

الاخیار ومغنی المحتاجو شەریعەتی ئیسلامو فتح المعینو سەرچاوەكانی حەدیثیش. كەواتە زۆر نەستەمە كە ئەم لاوانەی تێی ورووكاون بە باشی لێی حاڵی بن. خوایاربێ ئەم وەرگەڕاوە باشترین شەرحو راڤەدەبێ بۆ ئەم كتێبە پیرۆزە.

- وەرگێڕ -

براکەیش بێبەش دەبێ، چونکە خاوەن بەشەکان هەموو بەشەکانیان داگرتووە.

**حاڵی سێیەم:** باپیرەو برایەك‌و دوو كچ‌و مێردێ. دوو کچەکە دوو سێیەك‌و مێردەکە چواریەك دەبا. جا لەبەر ئەوە کەسێ‌و چوار موتەبایینن، سێ زەرب دەکەین لە چواردەبێ بە دوازدە، هەشتی بۆ کچەکان‌و سێی بۆ مێردەکە یەکێکی دەمێنێتەوە شەشیەکی دوانزە تەواو ناکا، ژمارەی مەسەلەکە دەگەیەنینە سیازدە دوو بەشەکە دەدەین بە باپیرەکەو، براکە بێبەش دەبێ بەهۆی داگرتنی هەموو کەلەپوورەکەوە لە لایەنی خاوەن پشکەکانەوە.

هەتا ئێستا قسەمان لەوە بوو کە لە خاوەن پشکەکان شەشیەك، یا کەمتر لە شەشیەك بمێنێتەوە، یا هیچ نەمێنێتەوە لێیان، بەڵام ئەگەر زیاتر لە شەشیەکیانی لێمایەوە، ئەوە ئەم سێ حاڵەتە کامیان قازانجتر بوو بۆ باپیرە ئەوەیان بۆ هەیە:

١) **حاڵی یەکەم:** برابەشی لەگەڵ براو خوشکەکاندا.

٢) **حاڵی دووەم:** سێیەکی پاشماوەی پشکەکان.

٣) **حاڵی سێیەم:** شەشیەکی سەرجەمیماڵەکە.

جا دەستووری ئەوەیش کە بزانین کام لەم سێ حاڵە قازانجی پترە بۆ باپیرە ئەمەیە: دەڵێین: ئەگەر پشکە دیاریکراوەکە نیوە بوو، یا لە نیوە کەمتر بوو، وەك چوار یەك، یا سێیەك، یا شەشیەك، ئەوە ئەگەر ژمارەی براو خوشکەکان کەمتر بوو لە دوو ئەوەندەی باپیرە،

ئەوە برا بەشی قازانجی زۆرترە. وە ئەگەر لە دوو ئەوەندەی باپیرە زیاتر بوو، ئەوە سێیەکی پاشماوەی بەشە پشکەکان قازانجی پترە، وە ئەگەر رێك دوو قاتی باپیرە بوو ئەوە برابەشیو سێیەکی پاشماوە هەردوولا وەکوو یەکن. وە ئەگەر پشکەکان دوو سێیەك بوو ئەوە تەنها لەم شێوەیەدا برابەش قازانجی پترە بۆ باپیرە کە یەك خوشکی لەگەڵدابێ، دەنا هەر شەش یەکی سەرجەمی کەلەپوورەکە قازانجی پترە بۆی. وە ئەگەر بەشە پشکی خاوەن بەش لە نێوانی نیوەو دووسێیەکدابوو، وەك نیوە هەشت یەك، ئەوە لەم سێ شێوەدا کە ژمارەی براو خوشکەکان ئەوەندەی باپیرەن یا کەمترن برابەشی قازانجترە، سێ شێوەکان ئەمانەن: باپیرەو برایێ، باپیرەو دوو خوشك، وە ئەگەر ژمارەی براو خوشکەکان لە باپیرە زیاتر بوون، وەك باپیرەو دوو برا، باپیرەو سێ خوشك ئەوە شەشیەك قازانجترە.

**بزانن:**

خوشکی مردوو لەگەڵ باپیرەدا بەشەپشکی بۆ دانانرێ، دەنا دەبێ لە باپیرە زیاتر بەرێ، لە راستیدا ئەم باپیرەو خوشكو برایانە، وەکو کۆمەڵێ براو خوشك وانە کە کەوتبنە یەك، وە ئەو نیوەی ماڵە، یا ئەو دووسێیەکە کە لە هەندێ شوێنا پێیان دەدرێ لەسەر شێوەی خاوەن پشكیو پشك وەرگرتن نەبوو. تەنیا مەسەلەیەك هەیە لەو شوێنەدا پشك بۆ خوشك لەگەڵ باپیرەدا دادەنرێ، کە ناوداره بە ئەکدەرییە کە برێتییە لە باپیرەو مێردو دایكو خوشکی هەق یا خوشکی باوکی. جالەم مەسەلەیەدا مێرد نیوەو دایك سێیەكو باپیرە شەش یەكو

خوشك نیوه دەبا. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە، وە بەعەول (واتە: پتر کردن) پتر دەکرێ بۆ نۆ جا لەم ژمارەیە شێی بۆ مێردەکەیەو دووی بۆ دایکەکەیەو یەکێکی بۆ باپیرەکەیەو سێی بۆ خوشکەکەیە، واتە: ۹/۳ مێرد ۹/۱ بۆ باپیرە ۹/۳ بۆ خوشك ۹/۲ بۆ ایك = ۹/۳ + ۹/۱ + ۹/۳ + ۹/۲ = ۹/۹ =۱ ئەمجا لەبەر ئەوە کە باپیرە لەگەڵ ئەو خوشکەدا وەك براو خوشك وایە، دەبێ بە دەستووری کۆبوونەوەی چەند باوانێ، ئەو یەك بەشەی باپیرەکە لەگەڵ سێ بەشەکەی خوشکەکەدا دابەش بکرێ بە سەریانا، واتە: دەبێ لەم چواربەشە باپیرە دوو ئەوەندەی خوشکەکە ببا، چونکە بەپێی یاساو دەستووری باوان نێرینە دوو ئەوەندەی مێیینە دەبا، جا لەبەر ئەوە کە چوار ناشکێیەوە بەسەر سێدا، سێ زەرب دەکەین لە نۆ، دەبێ بە بیستو حەوت. نۆی بۆ مێردەکەو شەشی بۆ دایکەکەو دوازدەی دەمێنێتەوە بۆ باوانەکان کە باپیرەو خوشکەکەن، هەشتی بۆ باپیرەو چواری بۆ خوشکەکە.

**لێرەدا دەڵێین:** بۆیە لەم مەسەلەی ئەکدەرییەدا پشك بۆ خوشك دادەنرێ، چونکە ئەگەر پشکی بۆ دانەنرێ کەسێکی خاوەن پشك بەبێ بەڵگە بێبەش دەکرێ، چونکە لەم مەسەلەیەدا کەسێ نیە کە خوشك لە بەشی خۆی بێ بەش بکا، ئەگەر باپیرەیش بیکا بە باوان ئەوە پشکی خۆی کە شەشیەکە کەم ەکا، چونکە مەسئەلەکە ئاوا دەکرێتەوە: مێردەکە نیوە دەبا، دایك سێیەك دەبا، باپیرەو خوشکەکەیش دامان نان بە باوان، مەخرەجی نیو دووە، مەخرەجی سێیەکیش سێیە، جا لەبەر ئەوە کە دوو و سێ موتەبایینن دوو زەرب دەکەین لەسێ، دەبێ بە شەش، سێی بۆ مێردەکەو دووی بۆ دایکەکەو یەکێك دەمێنێتەوە،

دابەش ناكرێ بەسەر سێدا، كە ژمارەی باوانەكانە، چونكە باپیرە بە دوو دادەنرێ، زەربی ژمارەی سەری باوانەكان دەكەین لە شەش دەبێ بە هەژدە، نۆی بۆ مێرد، شەشی بۆ دایك، سێی دەمێنێتەوە كە رێك شەشیەكی هەژدەیە، بەلاّم بەتەواوی بەر باپیرناكەوێ، چونكە دووی بۆ ئەوەو یەكێكی بۆ خوشكی مردووەكەیە، كەواتە: خوشكەكە خاوەن بەش بێ بۆ هەردوولا قازانجترە!.

بەلاّم ئەگەر لەم پرسیارەدا لە جیاتیی خوشكەكە برایەك بوایە، ئەوە بەهۆی داگرتن (استغراق)ی كەلەپوورەكەوە لە لایەن خاوەن پشكەكانەوە بێبەش دەبوو، وە هیچی دەست نەدەكەوت، چونكە برا لە باوانە لە قورئانا، لە خاوەنی پشكی دیاری نیە، لەو باوان نەیشەوە كە بەئیستیغراق بێبەش دەبن، بەلاّم خوشكی مردوو ئەگەر یەك بوو، وەنەیش دەكرا بە باوان، پشكی دیاریكراوی خۆی بەپێی ئایەت نیوەیە، لەبەر ئەوە شیاونیە بەهۆی استفراق واتە: گرتنەوەی كەلەپوورەوە بێبەش بكرێ!.

وە ئەگەر لەم پرسیارەدا لە جیاتی خوشكەكە دوو خوشك بوونایە، پرسیارەكە عەول (پتركردن)ی تێ نەدەكەوت مەسەلەكە لە شەش دەبوو، سێ بۆ مێرد، یەك بۆ دایك، چونكە پشكی دایك لەم كاتەدا شەشیەكە، چونكە ژمارەیەك لە خوشك هەن لە مەسەلەكەدا، پاشماوەكەیش كە دووە بۆ باپیرەو دوو خوشكەكەیە، بەپێی دوو بۆ نێرینەو یەك بۆ مێینەیە. جا ژمارەی سەری باوانەكان كە چوارە دەدەین لە شەش دەبێ بە بیستو چوار، دوازدەی بۆ مێردەكەو، چواری

بۆ دایکەکە، هەشت دەمێنێتەوە، چواری بۆ باپیرەکەیەو دووی بۆ هەر یەك لە دوو خوشکەکە. لێرەدا باپیرە لە بەشی خۆی دانەپەڕیوە، کە شەشیەکە، بەڵکوو بە تەواوی وەری گرتووە. (لەم شوێنەدا عیبادەتی ئەصڵەکە ئەم هەڵەیەی تیایە کە دەفەرموێ: (**ولو كان بدل الاخت اخا سقط لحجبه بالجد**. لە کفایەکەو مغنی دابەس ئەوەنەیە: **ولو كان بدل الاخت أخ سقط**). لە راستیدا برا بە باپیرحەجب نابێ، ئەگەر لە باتی خوشك برا بێ بەئیستغراق حەجب دەبێ نەك بە باپیر – وەرگێڕ).

## ٢٥٣) باسی راسپێری (وەسێت):

**(بڕ: تەجرید/ ٣ل – ٢٦٨ ز: ٥٩ ).**

راسپێری لە شەرعا بریتییە لەوە کەسێ مافێکی خۆی بدا بە کسێکی تر لە پاش مردنی خۆی. راسپێری سوننەتێکی دامەزراوە، وایش دەبێ پێویست دەبێ، لە سەرەتای ئیسلامەوە پێویست بوو لەسەر موسوڵمان کە هەموو سامانەکەی بە وەسێت بدا بە خزمەکانی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: {**كَتَبَ عَلَيكم إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرٌ الْوَصِيَّةِ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ – سورة البقرة– ٢/١٨٠**} بەڵام لە دواییدا ئەم جۆرە راسپێرییە هەڵوەشایەوە، بەهۆی هاتنی ئایەتەکانی کەلەپوور دابەشکردنەوە، ئێستایش سوننەتێکی گەورەیە بەم دوو مەرجە:

**یەکەم**: لە سێیەکی ماڵ پتر نەبێ.

**دووەم**: بۆ کەلەپوور گرنەبێ. خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ کە بیەوێ راسپێری لە بارەیەوە بکا، هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ، هەتا راسپێرینامەکەی بە نووسراوەیی لە ژوور سەری دادەنێ. (شەیخان). ئەوەی دەفەرموێ: شافیعی دەفەرموێ: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەمەیە: جەخت کردنە، نەك دوشەوو سێ شەو، دووربینیش ئەوەیە: سوننەتە زۆر بە زوویی وەسێت بکا، بەڵکوو وا سوننەتە کە لەکاتی لەش ساغیدا وەسێتەکەی بنووسێ. بە یەکگرتنی سەرجەمی موسوڵمانان راسپێری سوننەتە.

**بنیات ( رکن )ەکانی راسپێری:**

**راسپێری ئەم چوار بنیاتەی هەیە بەبێ ئەمانە دانامەزرێ:-**

**یەکەم**: دارێژگەی گرێدان، واتە: ئەو گوتەیە کە راسپێرییەکەی پێ دەکرێ.

**دووەم**: کراو بە راسپێری (مُوصی بِهِ) مەرجەکەی ئەوەیە نافەرمانی نەبێ چونکە راسپێری خۆی بۆ ئەوەیە ببێ بە مایەی چاکەو بۆ بەسەر گرتنەوەی خێرێکە کە لەکاتی خۆیدا نەکراوە، دیارە کە بێ فەرمانی خوا پێچەوانەی ئەوەیە، وەك لە فەرموودەدا دەفەرموێ: لەکاتی سەرەمەرگا خودا خێرێکی گەورەی پێکردوون کە رێگەی پێ داون سێیەکی ماڵەکانتان بکەن بە خێر بۆ خۆتان، هەتا ببێ بە زیادە

چاکەو بچێتە سەر چاکەکانی پێشووتان، هەتا بیکا بەسەرباری کردەوە باشەکانتان. (ئیبنو ماجە/ بەزار/ بەیهەقی/ دارە قوطنی). فەرموودەکە بەلگەی ئەوەیە: بۆیە رێگەی راسپێری دراوە کە سێیەکی سامان بکرێ بەخێر هەتا ببێ بە زیادەخێرو چاکە، دەی راسپێریکردن بە کردنی گوناە ئەوپەڕی تاوانەو خواو پێغەمبەری خوا رێگەی شتی وایان نەداوە، نە لە قورئانداو نە لە سوننەتدا.

دەی هەرچی سوودو بەهرە لێ وەرگرتنی نارەوابێ، راسپێری لە بارەیەوە دانامەزرێ چونکە شتی حەرام بەپێی شەرع بێ بەهرەو بێ سوودە، ئەمەیش وەك سەگی نەهێنگرو مەیو بادەو بەرازو تلیاك، چونکە ئەم جۆرە شتانە حەرامنو حەرامە سوود لێ وەرگرتنیان، تەنانەت ئەگەر لە دەستی کەسێکیشدا بن بەوە نابن بەهی ئەو! بەلام مەرج نیە کە راسپێری پێکراو زات بێ، بەلکوو دروستە بەهرەی شت بکرێ بە راسپێری، وەك بەهرەی خانوو و شتی وا بکرێ بە راسپێری. هەروا دروستە راسپێری کاتیی بێ یا ئێجگاری بێ، هەتا دروستە بەشتی دیاری نەکراویش، وەك ئەوە بلێ: مەرێ لە مەڕەکانم خێربێ، هەروەها بە شتێکیش کە لەژێر رکێفدا نەبێو نەتوانێ بیدات بە دەستەوە، وەك مەل بەحەواوە، هەروەها بەشتی نەبووش وەك ئەوە راسپێری بکا کەسکی ئەم هوشترە مێنگەیە خێربێ، چونکە ئەم بابەتی راسپێرییە لەوانی تر فراوانترە.

**بنیاتی دووەم:**

راسپێریکەر، مەرجەکەی ئەوەیە گەردان (تەصەڕروف)ی لە ماڵی خۆیدا دروست بێ، کەواتە راسپێریی شێتو کەللەیی‌و شێتۆکەو بەرسامدار دانامەزرێ، هەروا راسپێریی منداڵیش دانامەزرێ، چونکە گەردانی منداڵیش دانامەزرێ، وەلێ بۆ نەفام راجیایی هەیە، فەرمایشتی راست ئەوەیە کە راسپێری نەفام (سفیە) دادەمەزرێ.

**بنیاتی سێیەم:**

راسپێری بۆ کراو (موصی لە) ئەوەیش کە راسپێرییەکەی بۆ کراوە ئەگەر لایەنێ بێ مەرجی ئەوەیە گوناه نەبێ، جا ئەگەر رایسپارد کە جێگەیێ بۆ هەندێ شتی ناڕەوا دروست بکرێ، ئەوە راسپێرییەکەی پووچەڵە، ئەگەر گوتی ئەمە راسپێری بێ بۆ خەباتی رێگەی خوا، دەدرێ بەو غەزاکەرانەی کە زەکاتیان دەدرێتێ!.

**راسپێری بە سێیەکی ماڵ:**

دروستە کە سێیەکی ماڵ بکرێ بە راسپێری، بەڵام لەپاش دانەوەی قەرز، چونکە بەرای کوڕی مەعروور (خۆشنوودیی خودای لێبێ) راسپێریکرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە سێیەکی ماڵەکەی بۆ بکا بەخێر، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لێی قەبووڵکردو لەپاشا گێڕایەوە بۆ کەلەپووربەرەکانی.

هەروەها بەپێی ئەم فەرموودەیەیش: سەعد فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی باشە دوو بەشی ماڵەکەم بکەم بەخێر لەپاش خۆم دروستە؟ فەرمووی! نەء، عەرزیم کرد: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەء، عەرزیم کرد: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەکی دەبێ، بەڵام سێیەکیش هەر زۆرە، لە سێیەکیش کەمتربێ باشترە، چونکە تۆ لەپاش مردنت میراتبەرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت گەلێ لەوە باشترە کە بە هەژاری بەجێیان بهێڵی، کە لەپاش تۆ سواڵ بکەنو لەپ لەمو لەو پان بکەنەوە (شەیخانو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە).

شیاو نیە کە مرۆڤ راسپێری بە پتر لە سێیەکی ماڵی خۆی بکا، وە ئەگەر بە زیاتر لە سێیەك راسپێری کرد ئەوە دوو راهەیە، هەندێ دەڵێن: دانامەزرێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رێگەی زیاتری بۆ سەعدنەداوە، رێگە پێنەدانیش ئەوە دەخوازێ کە شتەکە دامەزراوە. بەڵام قسەی راست ئەوەیە ئەگەر کەلەپووربەرەکان رازی بوون راسپێرییەکە جێبەجێ دەکرێ، دەنا راسپێرییەکە بە زیاتر لە سێیەك پووچە، بۆیە دەڵێین: زیاتریش بێ دروستە بە مەرجێ رازیبوونی ئەوا چونکە ئەم راسپێرییە لە کاتێکدا رووی داوە کە ئەو شتە ملکی خۆی بووە. جا ئەم راسپێرییە لە کاتێکدا رووی داوە کە ئەو شتە ملکی خۆی بووە. جا ئەم هەڵوەشاندنەوەو رێگەپێدانە دەبێ لەپاش مردن بێ چونکە هەتا راسپێریکەر خۆی مابێ ئەو ماڵە هی خۆیەتی، مافی کەسی تری پێوە نیە. ئەگەر گریمان کەلەپووربەری نەبوو ئەوە راسپێرییەکەی بە زیاتر لە سێیەك پووچەڵە، چونکە جارێ پیاوێکی ئەنصاری، هەموو ماڵەکەی تەنیا شەش بەندە بوو، لەسەرە مەرگا هەرشەشیانی ئازادکرد،

پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} بانگی کردن‌و کردنی بەسێ بەش‌و تیرو پشکی لە نێوناکردن‌و ئەو دوانەیانی ئازادکرد کە دەوەکەیان بۆ دەرچوو، وەچواریانیشی بە کۆیلەیی هێڵایەوە. هاوڕێیانی مەزهەبی شافیعی دەفەرموون: ئەم پیاوە میراتبەری نەبووە، دەنا پێغەمبەر دامەزرانی زیاتر لە سێیەکی دەبەست بە رازیبوونی ئەوانەوە.

## راسپێری بۆ میرا پبەر دروستە یانا؟:

زاناکان لەمبارەیەوە رایان جیاجیایە، گوتراوە: بەهیچ کولۆجێ دانامەزرێ، چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: (راسپێری بۆ کەلەپووربەر دروست نییە) ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی جوانی ساغە، لەسەر فەرمایشتی ئیمامی تیرمیزی (تەماشای سنن الترمزی-مع تحفة الاحوزی -٩/٣٠٩ بکە) بەلام فەرمایشتی هەرە دروست ئەوەیە کە دادەمەزرێ بە مەرجێ کەلەپوور بەرەکان رێگەی بدەن، چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: راسپێری بۆ میراتبەر دانامەزرێ مەگەر کەلەپوور بەرەکان ئارەزوو بکەن. (دارە قوطنی) کاتێ بە کەلەپووربەر دادەنرێ کە لەکاتی مردندا کەلەپووربەر بووبێ، ئەگەر راسپێری بۆ ژنێ کرد، ئەوجا مارەی کرد، ئەوە راسپێرییە بۆ میراتبەر.

**راسپێری بۆ ئەم شتانە پەسەندە:** بۆ دانەوەی قەرزو بۆ گێڕانەوەی شتی بەناهەقی براو بۆ خاوەنی‌و، بۆ جێبەجێ کردنی راسپێرییەکان‌و بۆ کارو باری منالان. ئەوەوی دەفەرموێ: راسپێری لەم چەند حاڵەدا فەرزە: بۆ گێڕانەوەی مافی بە ناڕەوا براو، بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەی کە لە حازردا نەتوانێ بیداتەوە.

**(سەرووەسێت):**

**مەرجی سەرووەسێت ئەم پێنج شتەیە:**

**یەکەم:** موسوڵمان بێ، دروست نیە موسوڵمان پەیماندار (واتە: ذیممی) بکا بە سەرووەسێتی خۆی، چونکە راسپاردەیی (ویصایەت) سپاردەو هەقدارییە، واتە: ویصایەت ئەمانەتو ولایەتە، کافریش شیاویی بۆ ئەم دوو پایەیە نیە، دانانرێ بە ئەمیندارو هەقداری موسوڵمان.

**دووەم:** باڵقیو رەسیدە بوونە، دروست نیە کە منداڵ بکرێ بە سەرووەسێت، چونکە منداڵ شیاوی هەقداریی نیە، چونکە ئەو خۆی لەژێر سەرپەرشتی هەقداردایە، کەواتە چۆن چۆنی دەبێ بە سەرپەرشتو سەرورسێتی کەسێکی تر، شێتیش رێك وەك منداڵ وایە، لە هەمان کاتدا شێت دەستەڵاتی گەردانی نیە بۆ خودی خۆی، دەی بۆ کەسێکی تر چۆن ئەو دەسەڵاتەی دەبێ.

**سێیەم:** ئازادییە. چونکە کۆیلە بە کەڵکی ئەوە نایەت کە تەصەڕروف (گەردان) لە ماڵی کوڕی خۆیدا بکا، دەی ئیتر چۆن دەبێکە بکرێ بە سەرووەسێت بەسەر کەسێکی ترەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوە کە لەبەر خزمەتی ئاغاکەی دەستی ناپەرژێ بۆ شتی وا.

**چوارەم:** دەستپاکیو سپاردە پەروەرییە، کەواتە: دروست نیە کە بەدکار بکرێ بە سەرووەسێت، چونکە بەدکار شیاو نیە بۆ هەقداریو چاودێریی، کە مەبەستی هەرەمەزن لێی دەستپاکیو ئەمینداریە، دیارە کە بەدکار ناوی خۆی بە خۆیەوە، نائەمینە.

**پێنجەم:** دەبێ سەروەسێت دوژمنی ئەو منالە نەبێ کە کاروباری ئەوی پێ دەسپێررێ. دروستە ژن بکرێ بە سەروەسێت، بەڵکوو ژن لەم کارەدا لە کەسانی تر باشترە، دروستە کوێریش بکرێ بە سەروەسێت لەسەر قسەی فەرمایشتی هەرە دروست. ئەگەر کەسێ وەسێتی کرد کە خێرەکەی بدرێ بە هۆشیارترین کەس لە ناوشاردا، دەدرێ بەو کەسەیان کە لە هەموویان زیاتر دنیا نەویستە، زاتە: زاهیدە، ئەمەیش بەپێی دەقی قسەی شافیعی خۆی {رەزای خوای لێبێ}.

## ٢٥٤) راسپێری پێویست (الوصية الواجبة):

لە یاسای ژمارە (٧١) ساڵی (١٩٤٦)، ماددەی (٧٦) دەڵێ: ئەگەر مردوویێ لە پێش خۆیدا، یا لەگەڵ خۆیدا، منداڵی بمرێ، با مردنی بڕیار – کوکم –یش بێ، وە وەچەی ئەو منداڵە مردووەمابێ، وە مردووەکە بەقەد ئەو بەشە پشکە، کە منداڵەکەی ئەگەر زیندووبوایە لە کەلەپوور دەیگرت لێی، ئەگەر مردووەکە بەقەد ئەو پشکە راسپێری نەکردبوو بۆ وەچەکەی، ئەوە بۆ وەچەی ئەو منالە مردووە، لە کەلەپووری بنچەکەیدا، راسپێری بەقەد بەشەپشکی کاتی ژیانی پێویت دەبێ، مەرجێ ئەم راسپێرییە لە بەشەپشك زیاتر نەبێ، وە لە سێیەکیش تێنەپەڕێ، بە مەرجێ ئەوەیش کە ئەو وەچەیە لە مردووی حازری کەلەپوور بەرنەبێ، هەروا نابێ مردووی حازری بۆ ئەو وەچەیە لە لایەکی ترەوە بە خۆڕایی هەقی ئەوەی بۆ کردبێتەوە. تەنانەت ئەگەر لە رێگەیەکی ترەوە شتێکی بە پیاوەتی دابوو بەو وەچەیە بەڵام

نەدەگەیشتە ئەم ئەندازەیە کە بەپێی ئەم ماددەیە بۆی دانراوە، ئەوە لەسەر ئەوەوە راسپێرییە پێویستەکەی بۆ تەواو دەکرێ؟.

وە ئەم راسپێرییە بۆ ئەم کەسانەیە: بۆچینی یەکەمی منالی کچ، وە بۆ هەموو چینێکی منالی کوڕ بە مەرجێ لە پشتەوە بگاتەوە بە مردووەکە، نەك لە سکەوە، هەرچەند بەرەو خواریش بڕوا.

لەگەڵ رەچاوکردنی ئەمەدا: گشت بنەچەیێ وەچەی خۆی، نەك وەچەی کەسێکی تر، بێ بەش دەکات، وەپشکی هەموو بنەچەیێ بەسەر وەچەکەی خۆیدا، هەر چەند بەرەو خواریش بووبنەتەوە، دابەش دەکرێ بەسەریاندا لەسەر شێوەی کەلەپوور، وەوا دادەنرێ کە ئەو بنەچەیە، یا ئەو بنەچانە، کە ئەو دەگەیەننەوە بە مردووی حازری لە پاش مردووەکە مردوون، وە وایش دادەنرێ کە بەریز ئەو بنەچانە هەر کەسەیان لە پێش چینی دوای خۆیدا مردووە. مادە (٧٦) تەواو.

دەستووری دابەشکردنی کەلەپوریش ئاوایە: لە پێشدا ئەندازەی راسپێری واھ راسپێری پێویست بێ یا راسپێری ئاسایی بێ، لە کۆی کەلەپوورەکە جیا دەکرێتەوەو دابەشدەکرێ بەسەر خاوەنەکانیدا، ئەوجا باقی مەندەی سامان بەسەر کەلەپوورەکندا دابەش دەکرێ.

## چەند سەرنجێ:

لەم یاسایەدا ئەم چەند سەرنجە رەچاو دەکرێ: لە هەندێ شێوەدا وەچەی ئەو منداڵەی کە لەپێش باوکی یا دایکی خۆیدا مردووە زیاتر لەو منالە مردووە دەگرێ، کە ئەم دەگەیەنێ بە مردووی حازری،

یا زیاتر له منالّی هەقی مردووی حازری دەگرێ. هەق وابوو له حالّی وادا راسپێری بە هیچ شێوەیێ لە پشکی مندالّه مردووەکه زیاتر نەبێ چونکه ئەو هۆی ئەوەیە کە ئەم وەچە زیندووەی لەم مردووی حازرییە کەلەپوور بگرێ. وە مەبەستی تێکرای ئەم یاسایەیش هەر ئەوەیەو بەس، بەلاّم تەعبیرەکە کورت هەلّهێنەو بووە بەهۆی ئەم کێشەیە، ئادەی بفەرموون لەگەلّ شیکردنەوەی ئەم چەند نموونەیەدا:

أ) بۆ نموونە ئەگەر پیاوێ، کورێکی لەپێش خۆیدا مردبوو، کورەکەی کچێکی لە پاش بەجێ مابوو، لەپاشدا خۆشی مرد، ژنێك و دووکچی هەبوو، ئەندازەی راسپێری پێویست بۆ کچی کورە مردووەکەی، سێیەکی سەرجەمی مالّەکەیە، گریمان ئەم پیاوە (٣٦) دیناری لەپاش بەجی دەمێنێ، دوازەدەی بۆ کورەزاکەیەتی، سێی بۆ ژنەکەیەتی، بیست و یەکی بۆ دوو کچەکەیەتی، شازدەی بەپشك و پێنجی بەرەتکردنەوە، بەهەر حالّ پشکی کچی کوری کابرای مردوو، لە پشکی کچی هەقی خۆی زیاترە، شتی وایش بەراستی جێگەی سەرسامییە!.

ب) گریمان پیاوێ کورێك و کچێکی لەپێش خۆیەوە دەمرن، کوری کچی ئەم کچە مردووەی ئێستا ماوە، دایکی ئەم کورەیش مردووە، گریمان ناوەکانیان ئاوایە: نەریمان کوری جەیران کچی رەیحان کچی وسمان. هەروا کچی کوری ئەم کورە مردووەیش ئێستاماوە، باوکی ئەم کچەیش مردووە، گریمان ناوەکانیان ئاوایە: خانزاد کچی ئازاد کوری فەرهاد کوری وسمان وسمان کە دەمرێ کورو کچێکی لەپاش بەجێ دەمێنێ، لەگەلّ نەریمان و خانزاددا. دیارە کە راسپێری پێویست لەکاتی

وادا نەریمان ناگرێتەوە، چونکە کوڕی کچی کچە، چونکە وەچەی کچ بەس چینیی یەکەمیان بەردەکەون، کەواتە راسپێرییەکە هەمووی بۆ خانزادە، کە وەچەی کوڕی کوڕەو لە پشتەوە دەگاتەوە بەوەسمان، ئەندازەی ئەم راسپێرییەیش سێیەکی سەرجەمی ماڵەکەیە، چونکە راسپێری نابێ لە بەشەکەلەپوور زیاتربێ، وە لە هەموو کاتێکیشدا نابێ لە سێیەکی ماڵ زیاتربێ، گریمان وەسمان (٤٥) دیناری لەپاش بەجێماوە، گریمان فەرهادی کوڕی ماوە، لەم بارەدا کەلەپوورەکەی ئاوا دابەش دەکرێ، ژمارەی سەری کەلەپووربەرەکان ئەصڵی مەسئەلەکەیە، کە دوو کوڕو یەك کچن، کەواتە مەسەلەکە لە پێنجە، چلو پێنج تەقسیم پێنج دەکاتە نۆ، کچەکە نۆ دیناری دەکەوێ، هەر کوڕەی هەژدە دیناری دەکەوێ، دەرکەوت کە پشکی بنەچە مردووەکەی خانزاد لە سێیەکی ماڵ کە پازدەیە پترە، کەواتە دەبێ راسپێری پێویست بۆ خانزاد لە سێیەك کەمترو زیاتر نەبێ، جا ئەو کاتە ماڵەکە ئاوا دابەش دەکرێ ٤٥ ٪ ٣ = ١٥ راسپێری پێویست بۆ خانزاد، مایەوە (٣٠) دینار، دابەشی دەکەین بەسەر کوڕو کچەکەی وەسماندا بیستی بۆ کوڕەکەو دەی بۆ کچەکەی، دیسان پشکی کچی کوڕی کوڕی مردووەکە، کە خانزادە لە پشکی کچی هەقی مردووەکە خۆی زیاترە، چونکە کچی کوڕی کوڕەکەی سێیەکی هەموو ماڵەکەی بردووە کە پازدەیە، بەلام کچەکەی خۆی سێیەکی دوو سێیەکی هەموو ماڵەکەی بردووە کە دەیە.

ج) گریمان پیاوێ کوڕێکی دەمرێ، کوڕەکەی کچێك و کوڕێکی دەبێ، کوڕی کوڕەکەیش دەمرێ، بەلام کچێکی لەپاش بەجێ دەمێنێ. واتە وەچەی کوڕە مردووەکەی کچێك و کچی کوڕێکە. لە پاشا ئەم پیاوە

دەمرێ، ژنێك و كوڕێك و كچێكی دەبێ. لەم كاتەدا ڕاسپێری پێویست سێیەكە، ئەو سێیەكە دابەش دەكرێ بەسەریەكەم چینی دوا كوڕە مردووەكەدا كە بریتین لە خوشك و برایەك، خوشكەكە سێیەكی سێیەكەكە دەگرێ، براكەی دوو سێیەكی دەگرێ، چونكە ئەم برایە خۆی مردووە بەشەكەی ڕێك دەدرێ بە كچەكەی.

گریمان ئەم پیاوە (١٨٠) دیناری لەپاش بەجێماوە، (٦٠) دیناری ڕاسپێرییە (٢٠) دیناری بۆ كچی كوڕەكەیەتی، (٤٠) دیناریشی بۆ كچی كوڕی كوڕەكەیەتی! ئەمەیش دیسان جێگە سەرسوڕمانە لەم یاسایەدا.

ئەمە چەند نموونەیێ بوو عەتنیكەیی ئەم یاسایە دەچەسپێنێ[1].

---

[1] دانەر {ڕەحمەتی خوای لێبێ} لێرەدا سێ چارەسەر بۆ حەلكردنی كێشەكانی ئەم یاسایە دادەنێ، ئەم یاسایە وەكوو یاسا جیایە لە شەرع، لەبەر ئەوە ئێمە مولزەم نین پێی، چارەسەری كێشەكانیشی بكەین كەس بە قسەمان ناكا، كەواتە: با لەمە زیاتر كات بەفیڕۆ نەدەین. لە نموونە (أ) دا، دانەر دەفەرموێ: ئەگەر سەرجەمی كەلەپوورەكە (١٨٠) پشك بێ (٦٠) پشكی بۆ كچی كوڕە مردووەكەیە، بە هەردوو كچی مردووەكە خۆشی (٨٠) پشك دەبەن، كە دووسێیەكی باقی مەندەی (١٨٠) پشكەكەیە. ئەمە سەهوە، ئاوا حەل دەكرێ ١٨٠ ٪ ٣ = ٦٠ پشك، سێیەك بۆ كچی كوڕە مردووەكە، مایەوە سەدوبیستی، هەشتیەكی بۆ ژنەكەیە، كە دەكاتە پازدە، سەدو پێنجیشی بۆ دوو كچەكەیە، هەشتای بە پشك و بیست و پێنجیشی بە گەڕانەوە، واتە بە (رد)

— وەرگێڕ -

## ٢٥٥) باسی ژنهێنان (النكاح):

(بڕ: تەجریدی بوخاری/٥ ز: ٧٠).

ژنهێنان لە عورفی شەرعدا بریتییە لە گرێدانێکی ناوداری زانراو، کە دەبێ بەهۆی دروستبوونی دروستبوون لەگەڵ ژندا، وشەی (نكاح) کە عەرەبییە، بەم مەبەستانە هاتووە، بە خودی گرێدانەکە دەگوترێ، کە بریتییە لە ژن مارەبڕین، خوای گەورە دەفەرموێ: {فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء - سورة النساء - هەروا دەفەرموێ: {وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ - سورة النور - ٣٢/٢٤} وشەی (نكاح) لەم دوو ئایەتەدا بەواتا مارەبڕینە، هەروا لەم فەرموودەیەیش بە هەمان واتایە کە دەفەرموێ: (انحوا الولود الودود) (واتە: ژنی سکوزاکەری بزۆکی مێرد پەروەر بهێنن) جاروبار مەبەست لە (نكاح) دروستبوونە لەگەڵ ژندا وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ - سورة البقرة - ٢٣٠/٢}.

**بڕیار (حوكم)ی ژنهێنان:**

سەر بەڵگەی ڕەوایی ژنهێنان نامەی خوداو ڕێگەی ڕەهبەرو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلامە. خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: {وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ} پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: (تناكحوا تكثروا فاني اباهي بكم الامم: واتە: ژن بهێنن زۆر دەبن، چونکە من لە ناو گەلانا شانازیتان پێوە دەکەم).

بزانن مەردوم لە بارەی ژنهێنانەوە دوو جۆرن: هەیە حەزی لێدەکا، هەیە حەزی لێناکا، جا ئەوی کە حەزی لێ دەکاو پێویستی پێی هەیە، یا تفاق‌و ئامادەیی هەیە بۆ ژنهێنان یا نییەتی، جا ئەگەر ئامادەیی هەبوو ئەوە سوننەتە کە ژن بهێنێ، چونکە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەی دەستەی لاوان! ئەی گەلی حوانان! هەر کەسە تەوانایی سەرجێیی‌و ژنداریی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ئەوە چاوی تێردەکاو داوێنێ لە تاوان دەپارێزێ، ئەو کەسەیشی کە لە کێشیدا نیە ژن بهێنێ با بە رۆژووبێ، چونکە رۆژوو دەیخەسێنی‌و ئارەزووی تەواو کەم دەکاتەوە هەتا خودا دەووری لێ دەکاتەوە.

ئەوەتا فەرموودەکە فەرمان دەکا بەو کەسانە کە توانای ژنهێنانیان هەیەو ئارەزوویان لەسەریەتی کە ژن بهێنن، ئەم جۆرە فەرمانە، بەپێی بۆچوونی زاناکان، ئەوە دەگەیەنێ کە کارەکە سوننەتە نەك پێویست، ئەمە کاتێ وایە کە پیاو لەناو ولاتی جەنگستان (دار الحرب) دانەبێ، دەنا ژنهێنان سوننەت نیە بۆی، چونکە مەترسی ئەوەی هەیە کە منداڵەکەی ببێ بە بێبڕوا، یا بکرێ بە کۆیلە، جا لە کاتی وادا وا دادەنرێ کە توانای ئەرکی ژنهێنانی نیە، لەبەر ئەوە لە سەریەتی بۆ مراندنی ئارەزووی دەروونی بەرۆژوو بێت. بەلام ئەو کەسەی کە ئارەزووی هەیە بەلام توانای ئەرکی ژنهێنانی نیە، وەك مارەیی‌و شتی تری وا، ئەوە چاتر وایە بۆ ئەم جۆرە کەسە، کە ژن نەهێنێ، بەلکوو وەك فەرموودەکە دەفەرموێ: ئارەزووی دەروونی بە رۆژوو دابمرێنێ. وەلێ ئەگەر بە رۆژوویش ئارەزووی دانەدەمرا ئەوا با ژن بهێنێ، ئومێدە کە خوای گەورە بە بەخششی خۆی دەووری لێ بکاتەوەو بێ نیازی بکا.

بەلام هەرکاتێ مەترسی ئەوەی هەبوو کە لەبەربێ ژنی تووشی شەروال پیسی دەبێ، ئەوە پێویستە لەسەری کە ژن بهێنێ، چونکە خۆپاراستن لە نادروستی کارێکی پێویستە، خوای مەزن لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا – سورة الطلاق – ٤/٦٥} واتە: هەرکەسێ پارێز لە نافەرمانی خودا بکاو ترسی خودای هەبێ، خودایش بەرەحمەتی خۆی کاری بۆ ئاسان دەکاو دەرووی خێری لێ دەکاتەوە).

ئەو کەسەیشی کە حەز لە ژنهێنان ناکاو پێویستی پێی نیە، ئەمە ئەم دوو حاڵەتەی بۆ هەیە:

**یەکەم:** ئەگەر ئامادەیی‌و تفاقی ژنهێنانی نەبوو ئەوە ناباشە بۆی کە ژن بهێنێ، چونکە دەبێ بچێتە ژێر ئەرکێ کە پێویستی پێی نیە!.

**دووەم:** ئەوەیە کە توانای ژنهێنانی هەیە، بەلام پێویستیی پێی نیە، وە هۆیەکی وایش نیە کە رێگەی سەرجێیی لێ بگرێ، ئەوە بۆ ئەم جۆرە کەسە ژنهێنان باشە، ناباش نیە، بەڵێ ئەوەندە هەیە لەکاتی وادا خۆی تەرخان بکا بۆ خوا پەرستی ئەوەی باشترە، بەلام ئەگەر بە خواپەرستییەوە خەریك نەبوو، ئەوە ژنهێنان باشترە بۆی، چونکە نەوەکا دەسبەتاڵی‌و بێ ئیشی تووشی کاری ناشایستەی بکەن.

## ٢٥٦) سوننەتەکانی ژنهێنان:

سوننەتە ژنێکی بەدین بهێنێ، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەی ژن خوازی هۆشمەند! ئافرەتی ئایینداری بە دین لە کیس خۆت مەدە، تا لە ژنهێنانا دەستەشکێن نەبی. سوننەتە کچیش بێ، چونکە دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: ئەی جابیر! بیا کچێکت دەهێنا، پێکەوە دەسبازیتان دەکردا. سوننەتە ژنێکی بنەچەپاك بێ، چونکە دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: پەرېگرن لە سەوزەگیای ناو بۆگە!.

یاران {رەزای خوایان لێبێ} عەرزیان کرد: قوربان مەبەست لە سەوزەگیای ناو بۆگەچییە؟ فەرمووی {درودی خوای لەسەربێ}: ژنی جوانی ناخانەدانە. هەروا سوننەتە تەماشای دەمووچاوو دەستەکانی لەپێش خوازبێنیدا بکا، هەر چەند بەبێ رێگە پێدانیش بێ.

## ٢٥٧) کۆکردنەوەی چوار ژن بەیەکەوە دروستە:

دروست نیە بۆ پیاوی ئازد پتر لە چوار ژن لە خۆی مارە بکا، چونکە ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی لە سەردەمی نەزانیدا دە ژنی هێنابوو، کە خۆی ئیسلام بوو ئەوانیش هەر دەیان لەگەڵیا ئیسلام بوون، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکرد کە چوار ژنیان هەڵبژێرێو ئەوانی تریان بەرەڵڵا بکا. بەڵام کۆیلە دروست ینە بۆی کە زیاتر لە دوو ژن بهێنێ،

چونکه دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): نابێ کۆیلە لەیەك کاتا زیاتر لە دوو ژنی هەبێ. (عەبدولحەق گێڕاویەتەوە. کەسانی تریش ڕاگوێز دەکەن کە یەکگرتنی هاوڕێیانی پێغەمبەر لەسەر ئەم بڕیارە هەیە).

## ٢٥٨) بڕیاری مارەکردنی کەنیزەك بۆ ئازاد:

دروست نییە بۆ ئازاد کە نێزەکی کەسێکی تر مارە بکا لەخۆی مەگەر بەچەند مەرجێ:-

**یەکەم:** توانای مارەیی ژنی ئازادی نەبێت.

**دووەم:** مەترسی ئەوەی هەبێت کە لەبەر بێ ژنی تووشی شەڕوالپیسی ببێ.

**سێیەم:** توانای هێنانی ژنێکی موسوڵمانی ئازادی نەبێ، هەروا توانای خاوەننامە (کێیابی)یەیشی نەبێ، لەسەر رای فەرمایشتی دروست جا ئەگەر ژنی ئازاد هەر دەست نەدەکەوت، یا دەست دەکەوت بەڵام پێشگیرێ هەبوو لە هێنانی، وەك ئەوە تات بوو، یا گول بوو، یا نەیدەتوانی ئەرکی هێنانو گواستنەوەی ئافرەتی ئازاد بکێشێ، ئەوە بۆی هەیە کەنیزەك بهێنێ. بەڵگەی ئەمەیش دەقی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: {وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلاً أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مِّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ – سورة النساء – ٤/٢٥} هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: {ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ} . ئەوەتا خودای گەورە باسی هەر سێ مەرجەکەی

کردووه چونکه (الطول) مارەییە، مەبەست لە (المحصنات) ژنی ئازادە کە کەنیزەك نەبێ، مەبەست لە (خشی العنت) ئەوە کە مەترسی شەڕواڵ پیسی هەبێ، لەبەر ئەمەیە کە جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هەر کەسێ توانای مارەیی ژنێکی ئازادی لە شارەکەی خۆیدا هەبێ، دروست نیە کە ژنی کەنیز بهێنێ بەڵام ئەگەر کەسێ توانای مارەیی ژنی ئازادی هەبوو، بەڵام ژنی ئازادە لە شوێنەکەی خۆی نەبوو، لە شوێنێکی تر هەبوو، وەك شارێکی تر، وە ئەستەم بوو کە لەوێوە بیهێنێ، ئەوە دروستە بۆی کەنیزەك مارە بکا. کەنیزەك واتە: ئەمەتە.

**چوارەم**: ئەوەیە ژنی ئازادی وای نەبێ کە بتوانێ لەگەڵیا دروست ببێ، بەڵام ئەگەر هەیبوو، بەڵام نەیدەتوانی دروست ببێ لەگەڵیدا، لەبەر ئەوە کە ژنەکە بچووك بوو، یا پیربوو، یا دیارنەبوو، یا شێت بوو، یا گول بوو، یا بەڵەك بوو، یا هەرشتێکی تری لەم بابەتە ئەوە لە سەر رای فەرمایشتی دروست دروستە کەنیزەك بهێنێ.

**پێنجەم**: دەبێ کەنیزەکەکە موسوڵمانبێ ئەوجا مارەی لە موسوڵمان دێ، خوای گەورە دەفەرموێ: {فَمِن مِّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ}.

## هۆی پێشگیریی لە هێنانی کەنیزەك:

هۆکەی پێشگیرییە لە کۆیلەیی منالّ، چونکە منالّ لە کۆیلەیی و ئازادیدا دەچێتەوە سەر دایك. خودای داناو زانا کە خۆی یاسادانەری ئیسلامە چاوی بڕیوەتە نەهێشتنی کۆیلایەتی. هەتا ئەگەر کەنیزەکی

موسوڵمان هی بێبڕوایەك بوو دروست نیە موسوڵمان بیهێنێ، هەتا بێبڕوا نەبێ بە خاوەنی منالّی موسوڵمان، گوتراویشە: دروستە مارەبکرێ، چونکە مادەم دایکەکە موسوڵمانە منالّەکەیشی لە ئاییندا دەچێتەوە سەر ئەوو بە موسوڵمان دادەنرێ. بزانە کە منالّی کەنیزەکی شووکردوو دەبێ بە ملکی خاوەنەکەی، خواه مێردەکەی ئازاد بێ، یا بەندەبێ.

## ٢٥٩) تەماشاکردنی ژنو پیاو بۆیەکتر:

### تەماشاکردنی پیاو بۆ ژن حەوت جۆرە:

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە کە کاری بەو تەماشاکردنە نەبێ، ئەوە لەکاتی وادا تەمارکردنی پیاو بۆ شەرمگای ژنی بیانی بەبێ مەرج ناڕەوایە، مەبەست لە پیاو نێرینەی رەسیدە. مەبەست لە ژنیش ئافرەتی رەسیدەیە. گەرچی لە هەندی کاتدا دەموچاوو هەردوو دەست لە شەرمگانین، بەلاّم ئەگەر مەترسی ئاژاوەی هەبوو تەماشاکردنی ئەو شوێنانەیشی نادروستە، وەلیّ ئەگەر مەترسی نەبوو ئەوە راجیایی هەیە: فەرمایشتی راستو دروست ئەوەیە کە حەرامە، چونکە بە یەکدەنگیی واتەی موسوڵمانان ژنان رێگەیان پێ نادرێ کە بەسەری رووتو بە مۆدەیی لەماڵ دەرچن، لەبەر ئەوەیش تەماشاکردن سەرەتای ورووژانی ئاژاوەیەو بزوێنەری ئارەزووە، لەبەر ئەوە بۆ شەرع وا جوانە کە ئەو دەرگایە دابخاو جڵەو بۆ بەر بەرەڵلایی شل نەکا، هەر وەك نادروستە پیاوو ژنی بیانی دوو بە دوو لە جێگەیەکی چۆڵدا کۆببنەوە. تێکڕای

واتای گشتی ئەم ئایەتە بەلگەی ئەم بڕیارەیە: {قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ – سورة النــور – ٢٤/٣٠} مێرد منداڵ (موراهیق)یش وەك باڵق وایە، چونکە ئاگای لە شەرمگای ژن هەیەو بەرەبەرە کاری پێی دەبێ، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر ژن شەرمگای لە ئاستی بپۆشێ، هەروا لە ئاستی شێتیش. بەڵام کێروگون لە بندا خشت کراو راجیایی لە بارەیەوە هەیە، زۆرینە دەفەرموون: تەماشاکردنی بۆ ژنی بیانی وەك تەماشاکردنی پیاو وایە بۆ ژنی خۆیی، فەرمایشتی دووەم: دەفەرموێ: وەك پیاوی کەڵ وایە لەگەڵ ژنی بیانیدا. بەڵام پیاوێ بەس چووکی لە بنداخشتکرابێ، یا هێلکە گونەکانی دەرهێنرابن، یا شلەپەتەبێ، یا پیرێکی ئیختیار بێ، حوکمی ئەمانە وەك حوکمی کەڵەپیاو وایە، لە سەر فەرمایشتی زوربەی زاناکان. پیاوێکیش کە بەندەی ژنێ بێت رای راستتر ئەوەیە کە وەك پیاوی خۆیی وایە، چونکە حەزرەتی عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەگوانی بەندەی خۆی بەرنوێژیی بۆ دەکرد. ئەوەویش لە (نکت المهذب)دا دەفەرموێ: بەندەی ژن لە ئاستی خاوەنەکەی کە خانمەیەتی وەك پیاوی بێگانە وایە، ئیبنو رەفعە لە (المطلب)دا ئەم فەرمایشتەی ئەوەوی بە راست دەزانێ. کەسانێ کە دەفەرموون تەماشاکردنی دروستە، بە مەرج دەگرن کە ئەو بەندەیە متمانەبێ. ئەوە کە دەڵێین: وەك خۆیی وایە، جۆرە چاولێخشانێکی تیادایە، چونکە ئەگەر لە یەکتر بکەون مسۆگەر کە دەسنوێژی هەردوولایان دەشکێ، دەی کەی خۆیی لە خۆیی دەسنوێژی دەشکێ؟

ئەمەی کە باسمان کرد مەبەست تەماشاکردنی پیاوە بۆ ژنی ئازاد، بەڵام ئەگەر ژنەکە کەنیزەك بوو، واتە: ئەمەتەبوو، ئەوە ئەم درێژە پێدانەی تیاهەیە: ئەگەر کەنیزەکەکە شێواو (شوهاء) بوو ئەوە بەس تەماشای نێوانی ناوکیو ئەژنۆی دروست نیە، تەماشاکرنی شوێنەکانی تری ناباشە، بەڵام ئەگەر جوان بوو، قسەی راست ئەوەیە کە ددان بنرێ بەمەدا: کە وەك ژنی ئازاد، تەماشاکرنی نادروستە، چونکە ئەوەی کە دەبێ بەهۆی نادروستیی تەماشاکردن جوانییە، چونکە جوانی دەبێ بەهۆی ئاژاوەو گیرۆ دەبوون. ئەگەر ژنی ئازاد پیرێژن بوو، غەزالی دەفەرموێ: پیرێژنیش وەك گەورەکچ وایە، چونکە ئارەزوو زەوت ناکرێ. بەڵام رەویانی دەفەرموێ: ئەگەر گەیشتە رادەیەکی وا کە دووربوو لەوە کەسێ گرفتاری ببێ، ئەوە دروستە کە تەماشای روخسارو هەردوو دەستی هەتا هەردوو مووچی بکرێ. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا – سورة النور – ٢٤/٦٠} . تەماشاکردنی ژنیش بۆ پیاوی بیانی راجیایی تیایە، لەسەر ئەم شێوەیە:

**یەکەم**: بەلای رافیعییەوە بۆی هەیە تەماشای هەموو لەشی بکا، نێوانی ناوكو ئەژنۆی لێ دەرچێ.

**دووەم**: ژن بۆی هەیە تەماشای ئەو شوێنانە لە لەشی پیاو بکا کە پیاو بۆی هەیە تەماشایان لە لەشی ئافرەت بکا. نەوەوی دەفەرموێ: لەلای کۆمەڵێ ئەم فەرمایشتە راسترە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ – سورة النور –

۳۱/۲٤} واته: ئەی پێغەمبەر! بە ژنە بڕوادارەکانیش بفەرمووو: با تەماشای ناڕەوای پیاوی بیانی نەکەن!) وە هەروەها پێغەمبەری سەرومر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خۆ ئەوا ئەو کوێرە، خۆ ئێوە کوێر نین، گوایە ئێوەیش ئەو نابینن![1].

**جۆری دووەم:** تەماشاکردنی پیاو بۆ ژنی خۆی‌و بۆ کەنیزەکی خۆی کە مێرددار نەبێ، دروستە تەماشای هەموو شوێنێکیان بکا، ئەوەندە هەیە ڕاستتر ئەوەیە کە تەماشاکردنی شەرمگایان ناباشە، واتە: مەکرووهە، هەروەها ناباشە بۆ مرۆڤ کە تەماشای شەرمگای خۆی بکا بەبێ بەهانەی ڕەوا. جا ئەگەر کەنیزەکەکەی شووی کردبوو، یا کاغەز پێدراو (مکاتبە) بوو، یا هاوبەش بوو لە نێوانی ئەو و کەسێکی تردا، یا مەجووسییە بوو، یا بتپەرست بوو، یا لە ئیسلام وەرگەڕاوبوو، ئەوە تەماشاکردنی نێوانی ئەژنۆو ناوکی ناڕەوایە. تەماشاکردن ژنیش بۆ مێردی خۆی وەك تەماشاکردنی مێرد وایە بۆ ژنە خۆی. هەروەها تەماشاکردنی کە نیزەکیش بۆ خاوەنەکەی وەك تەماشاکردن خاوەنەکەی وایە بۆ ئەو.

---

[1] تەماشای ریاض الصالحین بەرگی چوارەم لاپەڕە (۱۱۹۹) بفەرموو چاپی یەکەم یا ژمارە: ۱۹۲٦/٥ – ۹۱ بەرگی /۲ ل – ۷٤ چاپی دووەم.

- وەرگێڕ –

۲۰۰٦/۸/۱۹

**جۆری سێیەم:** تەماشاکردنی ژنی خۆیی (مەحرەم)و کەنیزەکێ کە شووی کردبێ. دروستە تەماشای هەموو لەشیان بکا، نێوانی ناوك‌و ئەژنۆیان نەبێ، چونکە ئەم ئەندازەیە شەرمگایە، ئایەتی: {وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ - سورة النور - ٣١/٢٤} بەلگەی دروستبوونی ئەم تەماشاکردنەیە، وەکی تریش خۆیەتی (مەحرەمی) حاڵێکە نادروستیی خواستن‌و شووپێکردن پێویست دەکا، کەواتە وەکوو دوو پیاو وان، نابینی کە پیاوو ژنی خۆیی دەسنوێژیان لە یەکتر ناشکێ. لەسەر فەرمایشتی دروست بەهۆی خزمایەتییەوە خۆیی بن، یا بەهۆی ژن‌و ژنخوازییەوە، یا بەهۆی شیرخواردنەوە هەموو بۆ تەماشاکردن وەك یەکن. لە قیلێکا: پیاو هەر مافی ئەوەندەی هەیە: چەندەی ژنی خۆیی لەکاتی کارو فرمانا دەردەکەوێ، تەماشای ئەوێی بکاو بەس.

روانینی پیاو بۆ هەموو شوێنێکی لەشی پیاو دروستە نێوانی ئەژنۆو ناوکی نەبێ، راجیایی لەمەدا نیە. بەلام بەبێ راجیایی تەماشاکردنی کوڕێ خەتی نەدابێ بە حەزلێ کردنەوە ناڕەوایە، بگرە روانین بۆ کوڕێ کە مووی لێ نەهاتبێ لەهی ژن نارەواترە، هەروەك بەبێ راجیایی تەماشاکردنی خۆیی بەشەهوەتەوە حەرامە، بەلام ئەگەر بەبێ ئارەزووی دەروون بوو حەرام نیە.

تەماشاکردنی ژن بۆ ژن وەك تەماشاکردنی پیاو بۆ پیاو وایە، بەمەرجێ هەردوو ژنەکان موسوڵمان بن، بەلام تەماشای ژنەبێبڕوا بۆ ژنە موسوڵمان وەك تەماشای پیاوی بیانی وایە، لەسەر فەرمایشتی دروست، چونکە زاتی پاك دەفەرموێ: (أو نسائهن) دەی کەی ژنەکافر

بەرژنــە موســوڵمان دەكــەوێ؟ بــەڵكوو عیــززی كــوڕی عەبدوســەلام دەفەرموێ: ژنـی بـەدكاریش حـوكمی ژنـە كـافری نیمـی هەیـە، كەواتـە پێویستە لەسەر كاربەدەستەكان كە ڕێگە نەدەن ژنە بێبڕوای پەیمانـدارو ژنە موسوڵمانی بەدكار لەگەڵ ژنە موسوڵمانی داوێن پاكدا پێكـەوە بـچن بـۆ گـەرماو، جـا ئەگـەر لەبـەر كەمتەرخـەمی كاربەدەسـتان ئـەم قەدەغەكردنە ئەستەم بوو، با ژنە موسوڵمانی ئازاد خۆی خـۆی لەشـتی وا بپارێزێو مەودا نەدا كە ژنە موسوڵمانی فاسقەو ژنـە كـافر تەماشـای نـاڕەوای بكـەن. بـزانن هەرچـی لـەكاتی جیانەبوونـەوەدا تەماشـاكردنی نادروست بێ، لـەكاتی جیابوونەوەیشدا دیسان تەماشاكردنی نادروسـتە، وەك چووكی نێرینەو باسكی ژنی ئـازادو مـووی سـەرىو پارچـە نینـۆكی پێـیو مـووی بـەری پیـاوو ژنو ئـەو پارچـانەی تریـان كـە داپۆشـینیان پێویستە، لەبـەر ئـەوە پێویـستە ژنو پیـاو كاتـێ مـووی بـەریان دەتاشـن مووەكە بشارنەوە، هەروا ژن كاتێ سەرشـانە دەكا دەبـێ ئـەو مـووەی بـە دەم شانەكەوە دێتەوە بیشارێتەوە، نەبادا بیانی چاوی پێی بكـەوێ. هـەر شـوێنێكی مـرۆڤ كـە تەماشـاكردنی بـۆ پیـاو یـا بـۆ ژن نارەوابـێ، دەس لێدانیـشی ناڕەوایـە، بگـرە پتریـش چونكە دەس لێ دان لـە تەماشـاكردن خۆشترە، بۆیە دروست نیە بۆ پیاو بەبێ پەردە دەست بدا لە ڕانـی پیـاو، هـەتا ئەگـەر رووتـیش نـەبێ، بـەڵام مەترسـی ئـاژاوەی هـەبێ، جـاری وا هەیـە دەسـتلێدانی شـوێنێ دروسـت نیـە بـەڵام تەماشـاكردنی دروسـتە، هەندێ شوێنی خۆیی تەماشاكردنی دروستە بـەڵام دەس لێـدانی دروسـت نیە، وەك سكو پشتو پێو شوێنی تریش، تەنانەت ژنەكە دایكیـشی بـێ یـا كچیـشی بـێ دەس لێـدانی ئـەو شـوێنانەی ژنـی خـۆیی دروسـت نیـە،

هەروا حەرامە ماچکردنی دەمووچاوی ژنی خۆیی، قەففال دەفەرموێ: حەرامە بۆ پیاو لەگەڵ پیاوێکی تردا لەیەك نوێندا پێکەوە پاڵ بکەون، هەروا بۆ ژنیش لەگەڵ ژنێکی تردا حەرامە لە یەك نوێندا بخەون. بەڵام نەوەوی دەفەرموێ: ئەمە کاتێ وایە کە هەردوولا ژنیان نەهێنابێ، واتە، رەبەن بن. خوشكو برای منالیش کە تەمەنیان بوو بە دەساڵ ئیتر پێویستە نوێنی خەوتنیان بۆ جیابکرێتەوە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: منالتان کە تەمەنیان بوو بە حەوت ساڵ فەرمانیان پێبکەن بە نوێژ، کە بوون بە دەساڵو بە پێگوتن نوێژیان نەدەکرد لەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن، لەم تەمەنەدا نوێنی نوستنیان بۆ جیابکەنەوە لە یەکتری.

**جۆری چوارەم:** تەماشاکردن بە نیازی مارەکردن، کە تەماشاکرنی وا کارێکی پێویستە، چونکە پێویستی جۆری زۆرە جۆرێکیان ئەم تەماشاکردنەیە.

جا هەرکاتێ پیاوێ خواستی کە ژنێ بخوازێ سوننەتە کە تەماشای بکا، چونکە موغیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: داخوازی ژنێکم کرد بۆ خۆم، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی پێم: تەماشای بکە هەتا ببێ بە هەوێنی ئەڤینیو مایەی تەبایی لە نێوانی هەردوولاتاندا، وە ببێ بە مایەی پایەداریی خۆشەویستیو هاوسەرێتی هەتا سەر لە نێوانتانا. (نەسائیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی بە جوانی دادەنێ، ئیبنو حیببان بە دروستی دادەنێ!) وە دەفەرموێ: بەپێی مەرجی هەردوو پیرە، واتە: بەپێی شەرتی شەیخەینە. بەڵکوو دروستە

چەند جارێ تەماشاکردنەکەی دووبارە بکاتەوە، هەتا بە باشی کارەکەی بۆ روون ببێتەوە. ئەگەر خۆی ئەمەی بۆ نەدەلوا با ژنێ بنێرێ بە وردی سەرنجی بداو ئەوجا بیگێڕێتەوە بۆ ئەو کە چۆنەو چۆن نیە، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئوممو سولەیمی نارد بۆ تەماشاکردنی ژنێ وە پێی فەرموو: سەرنجی شادەمارەکانی سەرقنگەپاژنەی بدەو بۆن بکە بە لۆچەکانی لاملیەوە.

بۆ ژنیش هەمان شت لە هەمان کاتدا بۆ هەمان مەبەست دروستە، چونکە ئەوەی لە ژەندا سەرنجی پیاو رادەکێشێ، لە پیاویشدا سەرنجی ژن رادەکێشێ. وەك ئیمامی عومەر وا دەفەرموێ {رەزای خوای لێبێ}. ئەوەندە هەیە دەبێ بەس تەماشای روخساریو هەردوو دەستی تا مووچەکانی بکاو بەس، فەرقی بەری دەستیو پشتی دەستی نیە. ئەم تەماشاکردنە بە نیازی هاوسەری رەوایە، تەنانەت ئەگەر مەترسی ئاژەویشیان هەبێ. کاتی ئەم تەماشاکردنە لە پاش قرم خۆشکرنە لە مارەکردنی، بەلام لە پێش خوازبێنیدا، نەبادا لە پاش خوازبێنی تەماشاکردن ببێ بەهۆی وازلێهێنانی، کە ئەوە ئازادی دەدا، جا ئەگەر تەماشای کردو بە دڵی نەبوو با بێ دەنگ بێو نەڵێ: نامەوێ، چونکە ئەوە ئازاری دەدا.

**جۆری پێنجەم:** تەماشاکرنە بۆ دەرمانکردن، جا لەکاتی وادا هەر شوێنی پێویستی بە دەمانکردن بێ تەماشاکردنی دروستە، وەك خوێن لێ گرتن، یا کەڵەشاخ لێگرتن، یا هەر جۆرە تیمارکردنێکی تر. چونکە ئوممو سەلەمە {رەزای خوای گەورەی لێبێ} داوای لە پێغەمبەر کرد کە رێگەی

بدا کە کەڵەشاخ لە خۆی بگرێ، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ڕێگەی ئەوەی داو فەرمانی بە ئەبو طەیبە کرد کە کەڵەشاخی لێ بگرێ (موسلیم).

بەڵام پێویستە لەکاتی تیماکردنەکەدا خۆیی – مەحرەم ـێك یا مێردی ژنەکە بە دیارەوەبێ، نەبادا پێکەوە بوونی دوو بەدوو (خەڵوە) ڕوویدا، کە شتی وا لەگەڵ پیاوی بیانیدا نارەوایە. بەو مەرجە کە ئەو دەرمانکردنە بەژن نەکرێ، یا لەو شوێنەدا ژن نەبێ کە بیکا، هەروا ئەگەر تیمار کراو پیاو بوو دەبێ پیاو دەس نەکەوێ ئەوسا دروستە ژن تیماری بکا. چاك وایە هەتا موسوڵمان هەبێ هاوپەیمان کاری وا ئەنجام نەدا.

**جۆری شەشەم:** تەماشاکردنەکە لەبەر ناچاری تر، وەك شایەتیدان و سەوداو مامەڵەکردن، جا لەکاتی وادا بە تایبەتی تەماشاکردنی روخساری ژن دروستەو بەس، چونکە ناچاری ئەوە دەخوازێ، ئەو ناچارییەیش بەوەندە چار دەکرێ کە تەماشای دەمووچاوی بکا بە تەنهاو بەس.

**جۆری حەوتەم:** تەماشاکردنی کەنیزەکە لەکاتی کڕیندا، دروستە تەماشای ئەو شوێنانەی بکرێ کە لەکاتی ئەم دیودیوکردندا پێویستی بە دیتن هەیە، وەك روخسارو هەر چوار پەلی، دروست نیە سەیرکردنی شەرمگای، مەگەر قژی چونکە مەبەستەکانی کڕین پەیوەندی بە قژەوە هەیە.

## ٢٦٠) گرێدانی مارەبڕین (عقد النكاح):

بەبێ هەقدارێکی نێرینەو دوو شایەتی دادپەروەر گرێدانی مارەبڕین دانامەزرێ، ئەوەتا سەبارەت بە هەقدار خوای گەورە دەفەرموێ: {فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ اَن يَنكِحْنَ اَزْوَاجَهُنَّ - سورة - ٢٣٢/٢} هۆی هاتنی ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە: مەعقیلی کوڕی یەسار خوشکێکی هەبوو، مێردەکەی تەڵاقی دابوو، خوشکەکەی دەیویست شوو بکاتەوە بە مێردەکەی، بەڵام مەعقیل سوێندی خوارد کە لێی مارەنابڕێتەوە. ئەم فەرموودەیە لە بوخاری شەریفدا هەیە. دەی ئەگەر ژن خودسەر خۆی مافی ئەوەی هەبێ کە خۆی مارەببڕێ لە کەسێ بەبێ فەرمانی هەقداری، ئیتر خودای گەورە بۆ نەیی دەکرد لە عەضلیان. عەضل ئەوەیە: کە هەقداری ژن رێگەی نەدا شوو بکا بە هاوکوفی خۆی. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سەبارەت بە پێویستبوونی هەقدارو دوو شایەت بۆ مارەبڕین دەفەرموێ: بەبێ هەقداری ژن‌و دوو شایەتی راست‌و دروستی دادپەروەر ژن مارەی نایەت، هەر مارەبڕینێ ئاوا نەبێ ئەوە بەتاڵە. (ئیبنو حیببان لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە)و فەرموویەتی: سەبارەت بە باسکردنی پێویستبوونی دووشایەت لە مارەبڕیندا جگە لەم فەرموودەیە، فەرموودەی تری وا نیە کە بگاتە پایەی فەرموودەی ساغی دروست. ئەبو هورەیرەیش دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژن مافی ژن مارەبڕینی نیە، تەنانەت ناتوانێ کە خۆشی مارەببڕێ لە کەسێ. جاران ئێمە لە ناوخۆماندا دەمانگوت: هەر ژنێ بەبێ رەزابوونی هەقداری

خۆی مارە ببڕێ لە کەسێ داوێنپیس خۆیەتی! (دارە قوطنی گێڕاویەتەوە، رشتەکەی بەپێی مەرجی صەحیحە) عائیشەیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر ژنێ بەبێ را لەسەر بوونی هەقدارەکانی شووبکا شووەکەی پووچو بەتاڵە. حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} سێ جار لەسەر یەك بۆ تەئکید فەرمووی: شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە (ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە) تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە. ئیبنو حیببانو حاکمیش گێڕاویانەتەوە، حاکم دەفەرموێ: بەپێی مەرجی هەردوو پیر ئەم فەرموودەیە دادەنرێ بە دروست (صحیح). ئیمامی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەگەر لەناو کاروانێکا ژنێ هەبوو، هەقداری نەبوو، پیاوێکی کرد بە هەقداری خۆی کە مارەی ببڕێ لە کەسێ دروستە، چونکە شتی وا جۆرێکە لە ناوبژیوانی (تەحکیم) ناوبژیوانیش رۆڵی فەرمانڕەوا دەبینێ.

**مەرجەکانی هەقدار:**

**مەرجی هەقدار ئەوەیە:** موسوڵمانو رەسیدەو هۆشیارو ئازادو نێرینەو عادڵ بێ، مەبەست لە عادڵ ئەوەیە کە فاسق نەبێ. ئیسلام بۆیە مەرجە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – سورة التوبة – ٩/٧١} واتە: موسوڵمانان لەناو خۆیانا، بە پیاوو ژنیانەوە دۆستی یەکترین، پشتو پەای یەکترین، کەسو هەقداری یەکترین. کەواتە پیاوی بێبڕوا نابێ بە هەقداری ژنی موسوڵمانو لەسەری ناکاتەوە چونکە ئایینیان جیایە لە

یەك، هەروا دروست نیە بۆ پیاوی موسوڵمان كە ببێ بە هەقداری ژنە بێبڕوا. چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – سورة المائدة – ٥١/٥} واتە: ئەی موسوڵمانینە! جوولەكەو گاور مەگرن بە دۆستی خۆتان. ئەوان كە میللەتی كوفرن پشتی یەكتری دەگرنو دۆستو هەقداری یەكترن). ئەوەتا خودای پاكو پیرۆزو گەورە لەم ئایەتەدا رشتەی دۆستایەتیو هەقداری لە نێوان موسوڵمانانو بێبڕوایانا بڕیوە، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە كە پیاوی بێبڕوا دەبێ بە هەقداری ژنەبێبڕوا.

رەسیدەبوونو هۆشی ساغیش بۆیە مەرجن، چونكە مناڵو شێت دروست نین ببن بە هەقداری كەسێ لەكاتی وادا هەقداریی دەگوێزرێتەوە بۆ هەقداری پاش ئەو مندالە یا هەقداری پاش ئەوشێتە، وە هەتا هەقدار دەست بكەوێ، چ نزیك، چ دوور هەقداریی ناڕوا بۆ قازی.

بزانن كە تێكچوونی بیرو هۆش لەبەر پیری، یا لەبەر شێتی، یا بەهۆی پێشهاتەوە، پێشگیری لە هەقداریی دەكاو لە هەقداری نزیكەوە دەیگوێزێتەوە بۆ هەقداری دووری پاش خۆی، حیجر لە سەردانانیش لەبەر نەفامی پێشگیری لە هەقداریی (ویلایەت) دەكا، چونكە نەفام كە لە عورفی شەرعا پێی دەگوترێ سفیە ئەقڵی بە خێرو شەڕی خۆی ناشكێ، كەواتە چۆن ئەقڵی بە بەرژەوەندی كەسێكی تر دەشكێ، بەپێی دەقی فەرمایشتی شافیعی (رەزای خوای لێبێ) كەئەصحابی مەزهەبیش

پەیڕەوییان لێی کردووە تێکچوونی بیر بەهۆی نەخۆشیو ئێشو ئازاری زۆرەوە ئەویش هەقداریی راگویز دەکا بۆ هەقداری دوورتر.

ئازادییش بۆیە بە مەرج گیراوە لە هەقداردا چونکە کۆیلە دەست نادا بۆ خاوەنێتیو بوون بە هەقدار، تەنانەت خاوەنی خۆشی نیە، ئیتر چۆن کەسێکی تر بدا بەشوو.

نێرینەییش بۆیە مەرجە چونکە ژن نابێ بە هەقداری خۆشیو ناتوانێ سەربەخۆ بەبێ رەزای هەقدارەکەی خۆی بدا بەشوو، دەی بۆ کەسێکی تر چۆن دەگونجێ کە ببێ بە هەقداریو بیدا بەشوو، نێرو مێیش واتە: خونسا - هەروا دەست نادا بۆ هەقداریو ناتوانێ ژن بدا بەشوو. عەداڵەتیش بۆیە مەرجە چونکە حەزرەت {درودی خودای لەسەربێ} دەفەرموێ: بەبێ هەقدارێکی خاوەن روشد مارەبڕین دانامەزرێ. دەی بەدکار کەی بە خاوەن روشد دادەنرێ، لەبەر ئەوەیش کە بەدکاریی، واتە: فاسقی، شایەت لە شایەتی دەخا، دەی هەقداریش لە هەقداریی دەخا، تەنیا ئاغای کەنیزەك لەم بڕیارە چەرت دەکرێ، ئەو دەتوانێ ئەگەر بەدکاریش بێ، کەنیزەکی خۆی مارەببڕێ لە کەسێکی تر، چونکە لەسەر رای فەرمایشتی راستتر ئاغا بە سیفەتی ئاغاییو خاوەنێتی کەنیزەکی خۆی دەدا بە شوو، نەك بە سیفەتی هەقداریی.

رافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: زۆرینەی چینی دووەمی زانایانی مەزهەبی شافیعی رەوایان داوە کە فاسق (واتە: بەدکار) دەبێ بە هەقدار لە مارەبڕینداو دروستە ژن بدا بەشوو، بە تایبەت خوراسانیەکان رایان وایە، رەویانیش ئەم رایەی بە پەسەند داناوە.

ئـــەوەوی دەفـــەرموێ: لـــە بـــارەی هەقـــداریی بـــەدکارەوە لـــە غـــەزالی پرسیارکراوە، فەرموویەتی: ئەگەر هەقداریی لە بەدکار قەدەغە بکەین دەبێ نـەقڵ ببـێ بـۆ حوکمڕانـێ کـە شتی وا دەکا پێـی بـەدکار دەبـێ. کـەرولاڵ دەتوانـێ هـەم ژن بهێنـێو هـەم ژن بـدا بـە شـوو، بـە مـەرجێ خەتی هەبێ، یا ئاماژەیەکی تێگەیەنەری هەبێ. بزانن ئـەو مەرجانـەی کـە بوونیـان پێویـستە لـە هەقـداردا، هـەبوونی هـەمان مـەرج لـە شایەتەکانیـشدا مەرجە. لەبـەر ئـەوە مـارەکردن دانامـەزرێ مەگـەر بـە ئامادەبوونی دوو شایەتی موسوڵمانی موکەللەفی، واتە: ئـەرك لـە سەری ئازادی: نێرینەی دادپەروەری بیسەری بینای زرنـگ، کـە زمـانی هـەردوو لا ژن مارەکـەرو ژن مـارەبڕ بـزانن، بەڵگـەی ئـەم بڕیـارەیش ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەرە (درودی خوای لەسەربێ) کـە دەفـەرموێ: بـەبێ هەقدارێکی خاوەن روشدو دوو شایەتی راسـتو دروسـت مـارەبڕینی ژن دانامەزرێ.

**واتـە**: مکلـف. هـۆی ئەمـەیش دووربینییـە بـۆ نـاموس، هـەتا مارەکردن تووشی حاشا لێکـردن نـەبێ، وە رشـتەی بنەچـە لـە تێکچوون رزگاری ببێ. ئامادەبوونی ئەم چوار کەسـە لـەکاتی مارەبڕینـدا پێویـستە بـۆ دامەزرانـدنی: هەقـدارو مێـردو دووشـایەتی راسـتو دروسـت، وەڵێ هەقدارو مێرد بۆیان هەیە کە وەکیل بگرن.

**نزیکترین هەقدار:**

نزیکترین هەقدار باوکە، چونکە گشت هەقـدارەکانی تـر بـەهۆی ئەوەوە دەگەنەوە بە ژنەکە، لـەپاش بـاوك لـە پێـشترین هەقـدار بـاپیرەی

باوكییــه، هەرچــەند بــەرەوژووریش ببێتــەوە، چــونكە بــاپیرە هــەم هەقدارەو هەم باوانە، لەبەر ئەوە پێش دەخرێ لەسـەر كەسێ كـە هـەر بـاوانی رووت بـێ، ئـەمجار بـرای بـاوكیو دایكـی؛ ئـەمجا بـرای بـاوكیو، ئەمجا كوڕی برای باوكیو دایكی، ئەمجا كـوڕی بـرای بـاوكی، هـەر چـەند دووریـش بكەونـەوە، چـونكە هـەموویان بـەهۆی باوكـەوە دەگەنـەوە بـە ژنەكـە، ئـەمجا مـامی بـاوكیو دایكـی، ئـەمجا مـامی بـاوكی، ئـەمجا كـوڕی مــامی بــاوكیو دایكــی، ئــەمجا كــوڕی مــامی بــاوكی، بــا زۆریــش دووربكەونەوە، هەروەها ئەم مافە دەگا بە مامـەی بـاوكی ژنەكـەو كـوڕی ئـەوو مـامی بـاپیرەیو كـوڕی ئـەویش. ئـەمجا گشت باوانـەكانی تـریش. بزانن كە ریـزی هەقـدارانی ژن بـە شـوودان دەق وەك ریـزی میراتبـەران وایە، تەنیا لە باپیردا نەبێ، چونكە لـە ژن مارەبڕینـدا بـاپیرە پـێش بـرا دەخرێ، كوڕیش بـە كـوڕێتی هـەقی ژن بـە شـوودانی نیـە، بـەڵام ئەگـەر ئامۆزازای دایكی بێ، یا ئازادكەری بێ، یا قازی بێ، بەو سیفەتە، نەك بـە سیفەتی كوڕێتی، دەتوانێ دایكـی خـۆی مـارەببڕێ لـە كەسـێ. جا ئەگـەر ژنێ هەقداری بنەچەی نـەبوو سـەروەرە ئـازاد كەرەكـەی ئـەو مافـەی بـۆ هەیە، ئەمجا باوانی ئازادكـەر، ئـیتر هـەروەها دەق لـە سەرشـێوەی ریـزی میراتبـەرەكان، چونكە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفـەرموێ: سـەرداریی تــانو پۆیــە دەق وەك تــانو پــۆی بنەچــە. ئەگــەر ئازادكــەر ژن بــوو، فەرمایشتی راستتر ئەوەیـە كـە كـێ ژنـە ئازادكەرەكـە دەدا بـە شـوو هـەر ئەویش ژنە ئازادكراوەكە دەدا بەشوو، بەڵام لەسەر رەزای خۆی.

ئـەمجا حوكمـداری ئـەو شـوێنەی كـە ژنەكـەی لێیـە، چـونكە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: فەرمانڕەوا هەقداری ئەو كەسەیە

کە هەقدارى بايەخدارى ترى نيە. (شافيعىو ئەبو داوودو ئيبنو حيببانو كەسانى تريش گێڕاويانەتەوە. بەشێكە لە فەرموودەكەى عائيشە).

جا ئەم ريزە لەسەر ئەم شێوەيە بۆ ئەو هەقدارانەى كە مافى ژن مارەبڕينيان هەيە مەرجە بۆ دامەزراندنى مارەبڕين.

كەواتە هەتا نزيك وەستابێ دوور مافى ئەوەى نيە كە ژن بەشوو بدا، چونكە ئەم مافەى بەهۆى باوانەتييەوە بۆ ماوەتەوە، دەق وەك كەلەپوور وايە، تا نزيك هەبێ دوور بێ بەشە.

## ٢٦١) باسى خوازبێنيى ژن:

**سوننەتە:** بۆ ژنخواز، يا بۆ جێدارى، خوازبێنى بكا لە ژنەكە خۆى، يا لە هەقدارەكەى، بە مەرجێ ئەو ژنە بێ مێردبێو لە عيدەدا نەبێ، خواى ئەو خوازبێنييە بە قسەى راستەو خۆو بێ پێچو پەنا بێ، يا بە مەعنابێ. وە بە هيچ جۆرێ دروست نيە خوازبێنيكردنى ژنێ كە لە ژێر ركێفى مێرددابێ، يا لە عيددەى رجعيدابێ، چونكە ژن لە عيددەى رجعيدا هەر بە ژن حلێبە، بەلاّم ژنێ كە لە عيددەى مێرد مردندا بێ، يا لە عيددەى تەلاّقى بائينەدابێ، يا لە عيددەى هەڵوەشانەوەى مارەبڕين دابێ، دروستە بە مەعناوە خوازبێنيى لێ بكرێ، بەلاّم بە راشكاوى دروست نيە، بەپێى ئەم ئايەتە: {وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء - سورة البقرة -

٢٣٥/٢}. لەبەر ئەوەیش کە فاطیمەی کچی قەیس مێردەکەی بە ئێجگاری تەڵاقی دەدا، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی دەفەرموێ: کاتێ عیددەت تەواو بوو، کە کاتی ئەوەیە شوو کردنت حەڵاڵ دەبێ، ئاگادارم بکەرەوە.

جیاوازی نێوانی خوازبێنی ئاشکراو خوازبێنی بە مەعنا ئەوەیە: ئەگەر بە ئاشکرا ئارەزووی خوازبێنی ئەو ژنە بکا دوور نیە، کە لەبەر زۆر بۆ هێنانی ئارەزووی دەروون، یا لەبەر هەر هۆیەکی تر، بە درۆ بڵێ عیددەکەی تەواو بووە، بەڵام ئەگەر خوازبێنییەکە بە مەعناوە بێ شتی وا روو نادا.

خوازبێنی بێ پێچو پەنا بە قسەیێ دەڵێن کە سوور ئەوە بگەیەنێ کە ئەو کەسە ئارەزووی لە خوازبێنیی ئەو ژنەهەیە، وەك ئەوە کە پێی بڵێ: ئارەزوو هەیە کە مارەت بکەم بۆ خۆم، یا وەك ئەوە پێی بڵێ: هەرکاتێ عیددەکەت تەواو بوو من مارەت دەکەم. خوازبێنی بە مەعنایش (تەعریض) قسەیەکە ئەوەیش هەڵ بگرێو واتای تریش بگەیەنێ، وەك ئەوە پێی بڵێ: کێ هاوڕێی وەك تۆی دەست دەکەوێ. یاخود بڵێ: تۆ داخوازیکەرت زۆرە. یاخود بڵێ: هەرکاتێ کە عیددەت تەواو بوو پێم بڵێ!. یا وێنەی ئەم گوتانە.

ئەمە هەمووی بۆ ئەوکاسانەیە کە خۆیان خاوەنی عیددەکە نین، بەڵام خاوەن عیددەیێ کە مافی ئەوەی هەبێ لەو عیددەیەدا مارەی بکا، ئەوە بۆی هەیە کە بە راشکاوی داخوازی بکا.

## ٢٦٢) هۆیەکانی هەقداری (أسباب الولایه):

بزانن بە هێزترین هۆی هەقداری (ویلایەت) باوکایەتییە، ئەمجا باپیرایەتییە، چونکە ئەم دوو کەسە ئەوپەڕی دڵسۆزییان هەیە بۆ جگەرگۆشەکانیان، جا لەبەر ئەوە ئەم دوو کەسە مافی ئەوەیان هەیە کە کچ، گەورەبێ یا بچووك، مارەببڕن لە هاوکفی خۆی، لەسەر مارەیی وێنەی خۆی، لەبەر بەرژەوەندیٚ کە خۆیان رەچاوی بکەن، ئەم بەزۆر بەشوودانە بەستراوە بە کچێنییەوە، نەوەك بە گچکەییەوە، وەك ئەبو حەنیفە دەفەرمویٚ.

جا ئەگەر کچێ شێتو منالٚ بوو باوکو باپیرە دەتوانن بەبێ را وەرگرتن، مارەی ببڕن، چونکە شێتی کە چووە پاڵ منداڵی هەقدرایی پتەو تر دەبێ، بەرژەوەندیش ئەوە دەخوازێ کە بدرێ بەشوو، بۆ ساخبوونەوەی بەرژەوەند ئەوەنە بەسە کە کچەکە مارەییو ژیوار (نەفەقە)ی دەست دەکەوێ، رێی تێ دەچێ کە چاکیش ببێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەشێتی رەسیدە ببێ، بە گەورەییش باوکو باپیرە بەبێ فەرمانی خۆی بۆیان هەیە کە بیدەن بەشوو، هەروا دروستە بۆ فەرمانڕەوایش، ئەگەر باوکو باپیری نەبوو، بیدات بەشوو، بەمەرجێ نیشانەی پێداویستی دیاری بدا، وەك ئەوە گومانی ئارەزووکردنی لێبکرێ، یا پزیشك بڵێ: بەهۆی شووکردنەوە هیوای چاك بوونەوەی لێدەکرێ.

وا سوننەتە کە باوکو باپیرە داوای فەرمان (ئیذن) لە کچی گەورەی رەسیدە بکەن، هەتا دەربازبین لە راجیایی کەسانێ کە دەڵێن:

پێویسته ئیذن له کچی ڕەسیده وەربگیرێ، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ}: بێوەژن (بۆ مارەبڕینی خۆی) خۆی زیاتر مافی ئەوەی هەیە لە هەقدارەکەی، کچیش پرسی پێ دەکرێ، جا ئەگەر قسەی نەکردو نارەزایی دەرنەبڕی ئەوە مانای وایە کە ڕازییە (موسلیم).

بەلام بێوەژنی هۆشیار (ئاقڵ)ی ڕەسیده بەبێ فەرمانی خۆی مارەناکرێ، فەرمانەکەیشی دەبێ بە قسەبێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بێوەژن دەبێ قسەی لێ وەربگیرێ بۆ مارەبڕینی کە ڕازییەو ڕەخنەی نیە. بەپێی یەککگرتنیش قسە لێ وەرگرتن دەبێ لەپاش ڕەسیده بوون بێ. بێوەژن کەسێکە کچێنیی بە هۆی یەکێ لەم حاڵەتانەوە نەمابێ: بەهۆی بەدەست گرتنی ڕەواوە، یا بەهۆی چوونەلای شوبهەوە، یا بەهۆی داوێنپیسییەوە، بەلام ئەگەر بەهۆی ئەم شتانەی دواوە کچێتیی نەمابوو ئەوە لەسەر فەرمایشتی دروست وەك کچ وایە: بەهۆی کەوتنەوە، یا بەهۆی پەنجەوە، یا بەهۆی خوڕزمیی بێنوێژییەوە، یا بەهۆی قەیرەییەوە، کە گەورەکچ هەتا قەدرە دەبێ شووناکا، ئەگەر بە زۆر بە دەست گیرابوو، یا لە خەودا، یا بە شێتی ئەوە ڕاستتر وایە کە وەك بێوەژن وایە، لە (قیل)ێکا دەڵێ: ئەم حاڵەتانەیش هەروەك کچ وایە، گریمان ئەگەر ژنێ لە بنەڕەتدا بە سروشت کچێنیی نەبوو هەر بەکچ دادەنرێ.

## ٢٦٣) باسی ئەو ژنانەی کە مارەیان نایەت:

ئەو ژنانەی کە مارەکردنیان نادروستە سێ جۆرن، چونکە سێ هۆ هەیە بۆ حەرامبوونی ئێجگاری، کە بریتین لە خزمایەتیو شیرخواردنو ژنو ژن خوازی (مصاهره).

**هۆی یەکەم:**

کە خزمایەتییە، بەهۆی خزمایەتییەوە حەوت تاقم مارەیان نایەت، بەپێی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ - سورة النساء - ٢٣/٤} واتە: بە فەرمانی خوا لەسەر ئێوەی موسوڵمان، مارەکردنی ئەم ژنانە حەرامکراوە: دایکتانو کچتانو خوشکتانو خوشکی باوکتانو خوشکی دایکتانو کچی براتانو کچی خوشکتان). بەڵام ئامۆزاو پوورزاو خاڵۆزاو میمکزا، دووربن یا نزیك، مارەیان دێت لە ئامۆزاو خاڵۆزاو پوورزای خۆیان.

**هۆی دووهەم:**

بریتییە لە مەمك خواردن، بەم هۆیەوە دووکەس مارەیان نایەت، دایکی شیریو خوشکی شیری. بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ}.

جا بزانە هەر ئافرەتێ لە بنەچەدا بەهۆی خزمایەتیەوە حەرام بێ، بە شیرخواردنیش حەرامە. چونکە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ)

دەفەرموێ: هەرچی بە خزمایەتیو زاوزێ حەرام ببێ بەهۆی مەمکخواردنیشەوە حەرام دەبێ. (شەیخان) لە گێڕانەوەیەکدا: هەرچی بەهۆی سکوزاو کەسایەتییەوە قەدەغە بێ بەهۆی شیرخواردنیشەوە قەدەغە دەبێ.

**بەڵێ هەندێ کەس هەن لە بنەچەدا قەدەغەن نەك لە شیردا.**

**یەکەم**: ژنێ کە شیری دابێ بە برات یا بە خوشکت، ئەوە لە شیرپێداندا قەدەغە نیە لێت، چونکە بێگانەیە لێت، بەڵام لە بنەچەدا حەرامە لێت، چونکە یا دایکتە یا باوەژنتە.

**دووەم**: دایکی شیریی کوڕەزات یا کچەزات. ئەمە لە شیرپێداندا حەڵاڵە، کەچی لە بنەچەدا حەرامە، چونکە یا کچی خۆتە یا بووکتە، واتە: ژنی کوڕتە.

**سێیەم**: نەنکی منالّت، یا دایکی ژنێ کە شیری دابێ بە منالّی تۆ، ئەمەیش لە شیرپێدانا دروستەو لە بنەچەدا نادروستە، چونکە یا دایکتە یا خەسووتە یا دایکی شیریی ژنتە!.

**چوارەم**: کچی ژنێ کە مەمکی دابێ بە منالّی تۆ. ئەمەیش لە شیرپێداندا حەڵاڵەو لە بنەچەدا حەرامە، چونکە یا کچی خۆتە یا هەنەزاتە، واتە : کچی ژنتە[1].

---

[1] لێرەدا هەڵەیەکی چاپ، کە بووە بەهۆی وەهمێکی گەورە لە دەقە عەرەبییەکەدا هەیە دەڵێ: (وهی في النسب حرام لانها أم بنتك) راستەکەی ئاوایە: (.. لانها إما

**پێنجەم:** نەنکی منداڵت، چونکە یا دایکی خۆتە، یا دایکی ژنتە.

**بێدارین:**

**چوار ژن هەن حەلاڵن پێت کەچی بەدیمەن لە حەرام دەچن.**

**یەکەم:** خوشکی بنەچەیی برای بنەچەییت، واتە: خوشکی نەسەبیی برای نەسەبیت، کە خوشکی بەنەچەیی خۆت نەبێ، وەك ئەم نموونەیە: شیرین شوو دەکا بە هێمن هێڤی لە هێمن دەبێ، لە پاشا هێمن دەمرێ شوو دەکا بە رۆستەم لە رۆستەم نەریمانی دەبێ، رۆستەم لە ژنێکی تری کوڕێکی هەیە ناوی زۆرابە، برای باوکیی نەریمانە، دەی خوشکەکەی نەریمان کەناوی هێڤییە بە زۆراب دەشێ کە برای باوکیی نەریمانە.

**دووەم:** خوشکی شیریی برای بنەچەییت.

**سێیەم:** خوشکی بنەچەیی برای شیریت. بۆ نموونە: برایەکی دایکی شیریت هەیە، کە ئەویش خوشکێکی بنەچەیی هەیە، لە باوکەوە یا لە دایکەوە، یا لە باوكو دایکەوە. تۆ دەتوانی ئەو خوشکەی مارەبکەی.

---

بنتك..). لە زنجیرە (٢٥٨)دا، لە (نزیکترین هەقدار)دا ئەم هەڵەیەی تریش هەیە، دەڵێ: (والا في الابن فانه لا یزوج بالبنوة وان قدم في النكاح انه لا مشاركة..) راستەکەی ئاوایە: (وان قدم في الارث، لانه لا مشاركه.. الخ.

- وەرگێڕ -

**چوارەم: خوشکی شیریی برای شیریت. بۆ وێنە: کوڕێ شیری دایکی تۆی خواردووەو شیری ژنێکی تریشی دیسان خواردووە، وە ئەو ژنە شیردەرە کچێکی هەیە کە خوشکی شیریی براشیرییەکەی تۆیە، دەی تۆ دەتوانی ئەو کچە مارە بکەی[1].**

---

[1] لەم شوێنەدا لە (الفقه الميسر)ەکەداو لە ئەصڵەکەیدا ئەمە نووسراوە: (.. وقد نظمها بعضهم فقال):

**أربع في الرضاع هن حلال**

**واذا ما ناسبتهن حرام:**

**جدة ابن، واخته، ثم أم**

**لاخيه، وحافد، والسلام**

ئەم دوو شیعرە هەق وابوو لە پێش ئەم (بێداری)یەدا بوایە. چونکە ئەم دوو شیعرە قسە لەو چوار جۆرە ژنە دەکەن کە لەپێش ئەم بێدارییەوە باسمان لێ کرا، نەك لەم چوار ژنەی کە لەپاش ئەم بێدارییەوە باسیان لێدەکرێ. ئەم تێهەڵکێش کردنەیش مرۆڤ بە هەڵەدل دەبا، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ. بەندە بەهۆی مغنی محتاج و شەریعەتی ئیسلامەوە توانیم راستی بکەمەوە. وەرگێڕ. ئەمەیش بەشیعر وەرگەڕاوەکەیانە:

**هێنی بنەچەت ئەم چوار ژنانە**

**حەرامن، هی شیر بە پێچەوانە:**

**نەنکی منداڵتو، خوشکی، پاش ئەوەت:**

**دایکی براو خوشك، دایەنی نەوەت!**

**هۆی سێیەم:**

بڕێتییە لە ژنو ژنخوازی، بەهۆی ئەمیشەوە بە ئێجگاری هەتا هەتایە چوار تاقم حەرام دەبن:

**یەکەم**: دایکی مارەبڕاوی پیاو، هەر بەزاتی مارەبڕینی ژنێ لە پیاوێ، دایکی بنەچەیی‌و دایکی شیری ئەو ژنە لەو پیاوە بۆ هەمیشە حەرام دەبێ، بەپێی ئایەتی: (وأمهات نسائكم).

**دووەم**: کچی ژن کە لە مێردێکی تری ئەو ژنە بێت کە پێی دەگوترێ هەنەزا، هەر چەند بەرەو خواریش بڕوا، وەك کچو کچەزای هەنەزا، بەو مەرجە کە چووبێتەلای دایکەکە، ئەگینا بە تەنیا مارەبڕینەکە کچی مارەبڕاوەکەی لێ حەرام نابێ. بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ}.

کچی شیریی مارەبڕاوی بە دەستگیراویش ڕێك وەك کچی بنەچەوایە، مارەی نایەت لە مێردی دایەنەکەی. ڕستەی (فِي حجوركم)

---

ئیبنو رفعه ئەم چوار جۆرە ژنەی تریشی پتر کردووە: ژنێ کە شیری دابێ بە مامت، یا بە خاڵت، یا بە پوورت، یا بە میمکت (لە مغنیداو شەریعەتی ئیسلامدا ئاماژە بۆ ئەم مەبەستە دەفەرموێ: جیاکردنەوەی ئەم شێوەکارانە لە ڕاستیدا شتێکی دیمەنکارییەو بە ڕواڵەت جیاکردنەوەیە. چونکە ئەمانە ئەو هۆیانەیان تیادا نیە کە دەبن بە هۆی حەرامبوون هەتا جیا بکرێتەوە).

- وەرگێڕ -

لەم ئایەتەدا بەیانی حاڵی غالیبە دەنا بۆ ئەوە نیە ئەگەر ئەو هەنەزایە لە لای باوە پیارەکەی نەبێ مارەیی لێی دێ.

**سێیەم**: مارەبڕاوی باوكو باپیرەو بەرەوژووورتریش، خوای باپیرەی باوکی بێ، یاخود باپیرەی دایکی بێ، یا باوكو باپیرەی بنەچەبن، یا باوكو باپیرەی شیری بن! بەپێی ئایەتی: {وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء – سورة النساء – ٢٢/٤}.

**چوارەم**: مارە بڕوای کوڕو کوڕەزاو بەرەو خوارتریش، خوای کوڕو کوڕەزای نەسەب بن یا هی شیری بن. بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: {وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ} ئەم ئایەتە سەبارەت بە کوڕی پشتە، ژنی کوڕی شیریش بەپێی یاسای: هەرچی بەهۆی خزمایەتیو زاوزێو سکوزاوە حەرام بێ بەهۆی شیر خواردنیشەوە قەدەغە دەبێ. بەپێی رستەی (من أصلابكم) لە ئایەتەکەدا، کوڕی جەعلی بەر ئەم قەدەغەکردنە ناکەوێ، وە ژنەکەی مارەی دێ لە بەناو باوکەکەی!.

مارەبڕاوی کوڕو کوڕەزا بە تەنها مارە بڕینەکە لە باوكو باپیرەیان قەدەغە دەبێ.

### حەرام بوون لەکاتی کۆکردنەوەدا:

قەدەغەیە لەسەر پیاوێ کە دوو خوشك بەیەکەوە کۆبکاتەوە لە نیکاحی خۆیدا، خوای خوشکی بنچینەیی بن، یا هی شیری بن، قورئان دەفەرموێ: {وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ} لە

سوننەتیشدا دەفەرموێ: لەعنەت لەو کەسەبێ کە ئاوی خۆی لە منالْدانی دوو خوشکدا کۆدەکاتەوە. هەروەها قەدەغەیە کۆکردنەوەی ژنو پووری، جا خوشکی باوکی بێ یا خوشکی دایکی بێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژن بەسەر پوورو میمکی خۆی مارە ناکرێ، هەروەها پوورو میمکیش بەسەر برازاو خوارزای خۆیان مارە ناکرێن (شەیخان). هەروەها حەرامە کۆکردنەوەی ژن لەگەڵ کچی برایدا، یا لەگەڵ کچی برازایدا، یا لەگەڵ کچی خوشکیدا، یا لەگەڵ کچی خوشکەزایدا، بۆ ئەمەیش براو خوشکی بنچینەییو براو خوشکی شیری چون یەکن.

مەبەست لە قەدەغەکردنی ئەم جۆرە کۆکردنەوەیە پێشگیرییە لە روودانی برینی رشتەی خزمایەتی. کۆگر بۆ ئەو ژنانەی کە دروست نین لەگەڵ یەکتردا کۆبکرێنەوە ئەوەتە: هەر دوو ژنێ کە خزمایەتییەکی وەهایان لە نێواندا بێ، بە بنەچە یا بەشیر، کە ئەگەر فەرز بکەین یەکێکیان پیاو بێو ئەوی تریان ژنبێ، مارەیان لە یەکتر نەیەت ئەو جۆرە دوو ژنە کۆ کردنەوەشیان لە ژنێتیی یەك کەس دا دروست نیە. بزانن هەموو دووژنێ کە حەرام بێ لە نیکاحدا لەگەڵ یەکتردا کۆبکرێنەوە، حەرامە بەهۆی کەنیزەکیشەوە ئاغاکەیان بڕواتە لای هەردوولایان. واتە: بە نموونە ئەگەر دوو خوشك، یا خوشکەزاو پوورێ کەنیزەکی پیاوێ بوون، دروستە بڕواتە لای یەکێکیانو بەس.

## ٢٦٤) باسی ئەو نەنگانەی کە دەبن بەهۆی هەڵوەشانەوەی مارەبڕین:

ئەگەر پیاوەکە یا ژنەکە نەنگێکی لەم نەنگانەی دواوە دۆزییەوە بەویتریانەوە ئەوە مافی هەڵوەشاندنەوەی مارەکردنەکەی هەیە. ژن بەم پێنج نەنگە دەدرێتە دواوە: بە شێتیو بە گولیو بە بەڵەکیو بەتاتیو بەهۆی ئەوەیشەوە کە پارچە ئێسکێ بەری شەرمی گرتبێ.

پیاویش بەهۆی ئەم پێنج نەنگەوە دەدرێتە دواوە: بەهۆی شێتیو گولیو بەڵەکیو خپبوونی چووكو شلەپەتکەیی.

چونکە ژنهێنان بۆ رۆژو دوو رۆژ نیەو مەبەستی سەرەکی لێی رابواردنی راوایە، دەی ئەم نەنگانەیش هەیانە رێگەی دروستبوون دەگرێ، وەك چووك بڕاویو شلەپەتکەیی لە پیاوداو، وەك تاتیو ئێسکی بەری شەرمگا لە ئافرەتدا، هەیشیانە دڵ تێك هەڵ دەشێوێنێو ناهێڵێ لەززەتو خۆشی تەواو لە هاوسەر وەربگیرێ، وەك شێتیو گولیو بەڵەکی.

جا لەبەر ئەوە مافی پەشیمان بوونەوە لە مارەبڕین لەکاتی وادا دامەزراوە، هەتا نەبێ بەهۆی زیانی هەمیشەیی. لە ئیسلامیشدا: نەزیان نە وەڵامی زیان بەزیان، یاسایەکی دامەزراوە.

سەربەڵگەی ئەم کارەیش ئەم فەرموودەیەیە کە دەفەرموێ: کەعبی کوڕی زەید {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە بەنی غیفار ژنێکی هێنا، کە چووە ناو پەردەوە بۆیو جلەکانی داناو

لەسەر نوێنەکە دانیشت، سەیری کرد قەبرغەی تووشی بەڵەکی بووە، جا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لە نوێنەکە دەکشێتەوەو دەفەرموێ: جلەکانت بدەرەوە بە خۆتاو بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوانت، لەبەر ئەم عەیبە من تۆم ناوێ، بە کەسوکاری ژنەکەشی فەرموو: ئەم نەنگەتان حەشاردابوو، لە منتان شاردبۆ وە. (بەیهەقی لە – السنن الکبری – داو حاکم لە مستدرکا گێڕاویانەتەوە) جاوا بەپێی ئەم رووداوە هەڵوەشانەوە بەهۆی بەڵەکییەوە دامەزراوە، نەنگەکانی ترش بەم پێودانە پێوراون، چونکە لە ریزی ئەون، بگرە هەیانە خراپتریشە، وەك گولی کە زۆر خراپترە لە بەڵەکی.

عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هەر پیاوێ ژنێ بهێنێ، ژنەکە شێت بێ، یا گول بێ، یا بەڵەك بێ، ئەگەر بچێتە لایو بە دەستی بگرێ ئیتر ژنەکە مارەیی تەواوی دەکەوێ، بەڵام مێردەکە ئەوە بەهەقداری ژنەکە دەبژێرێ[1].

---

[1] مالیكو شافیعی {رەزای خوایان لێبێ} گێڕاویانەتەوە. لە بلوغ المرام دەفەرموێ: سەعیدی کوڕی مەنصورو مالیكو ئیبنو ئەبی شەیبە گێڕاویانەتەوە، پیاوانی رشتەکەی هەموویان بڕواپێکراون. لە ئەصڵەکەو لە ئەصڵی ئەصڵەکەدا ئەم ئەسەرە مەوقووفە لەسەر ئیبنو عومەر. بەڵام لە تاج الاصولو بلوغ المرامدا مەوقووفە لەسەر ئیمامی عومەر. لە مغنی المحتاجیشدا دەفەرموێ: ئەم سێ عەیبە بە صەحیحی لە عومەرەوە شافیعی ریوایەتی کردووە. بۆیە بەندە نووسیم: عومەر، وەنەم نووسی: ئیبنو عومەر، بەزەینم ئیبنو عومەر لە (کفایة الاخیار)ەکەدا هەڵەی چاپە لە فیقهول موسەیەرەکەیشدا نەقڵو روونووسی بێ تەحققە. هەر چۆن بێ خوا پاداشی باشی

سەرەڕای ئەم بەڵگانەیش بەڵگەی تریش بۆ هەڵوەشانەوە هەیە، چونکە ژنهێنان گرێدانێکە بەرابەر بە وەجەڵ، پووچبوونەوە قەبووڵ دەکا، کەواتە دروستە بەهۆی نەنگی کاریگەرەوە پووچ بکرێتەوە، ڕێك وەك کڕین و فرۆشتن. لە شێتیدا جیاوازی نیە لە نێوانی شێتیی هەمیشەیی و شێتیی پچڕپچڕدا، یا لە نێوانی شێتیی بێ چارەو شێتییەك کە چارەو تیماربکرێ. بە کورتی نەنگەکان حەوتن: سیانیان هاوبەشن، هەم لە مێرددا هەم لە ژندا روو دەدەن، بریتین لە شێتی و گولی و بەڵەکی، دوانیشیان تایبەتن بە مێردەوە، کە بریتین لە کێربڕین و شلەپەتکەیی. دوانیشیان تایبەتن بە ژنەوە، کە بریتین لە تاتی بەهۆی پارچە گۆشتەوە، یا لە تاتی بەهۆی پارچە ئێسکەوە کە بەری شەرمی ئافرەت بگریّ و ڕێی پەیوەندی ژنومێردی بگرێ.

## ٢٦٥) سوننەتە ناوبردنی مارەیی (تسمية المهر):

مارەیی لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ: صیداق یا مەهر، کە بریتییە لە سامانێ پێویست دەبێ لەسەر مێرد، کە بیدات بە ژن بەهۆی مارەکردنیەوە، یا بەهۆی دروستبوون لەگەڵیدا بەهۆی چوونە لای هەڵە (وطء الشبهه) وە. مارەیی لە عەرەبیدا گەلێ ناوی تری هەیە، وەك:

---

هەموو لایەك بداتەوە، ئەوەی کە گومانم تیادا نیە: ئەوان زۆر لە من مەلاتربوون، وە نیازیشیان رەزای خوا بووە، بەندە مەبەستم راستکردنەوەی دەقەکانە، دەنا نە مەبەستم زانایی خۆمەو نە مەبەستیشم خوانە خواستە تانەو رەخنەی ناهەقە لەوان.

— وەرگێڕ -

نحلەو فەریضەو ئەجرو سیداق، کە ئەم چوار ناوەی لە قورئانی پیرۆزدا هەن، لە سوننەتیشدا ئەم ناوانەی تری هەیە: مهرو علیقەو عقر.

سەر بەلگەی مارەیی نامەی خواو ڕێگەی ڕەهبەرە، خوای مەزن دەفەرموێ: {وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً - سورة النساء - ٤/٤} وشەی نیحلە لەم ئایەتەدا بە واتا خەڵاتو بەخششو بەخشینە، بۆیە وا ناونراوە چونکە رابواردنی ژن لەگەڵ پیاودا بەرابەر بە رابواردنی پیاوەکەیە لەگەڵیدا، کەواتە مارەیی وەك خۆراییو بە بەلاش بێ وایە، پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} بە پیاوێکی فەرموو کە داوای ژنێکی کرد: ئایا هیچت هەیە کە بیکەی بە مارەیی؟ گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا!.. تا ئەوێ کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: شتێك پەیدا بکە، با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ. جا لە ئەنجامدا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەوە کە فێری ئەو قورئانەی بکەی کە خۆت ئێستا لەبەرتە، ئەم ژنەم مارەکرد لە تۆ. دەی کە ئەمەت زانی بزانە کە سوننەت وایە لەکاتی مارەبڕیندا ناوی مارەیی ببڕێ، هەتا پەیڕەویی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بکرێو سوننەتی ئەو بکرێ بە سەرمەشق، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەبێ ناوبردنی مارەیی هیچ مارەبڕینێکی گرێ نەداوە، لە راستیدا ناوبردنو دیاریکردنی مارەیی لەکاتی گرێداندا دەبێ بەهۆی بنەبڕکردنی کێشەو بەرە.

بەڵام مارەیی بنیات (روکن)ێ نیە لە بنیاتەکانی دامەزراندنی مارەکردن، بەلگەی ئەم قسەیەش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {لاَّ جُنَاحَ

عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً – سورة البقرة – ٢٣٦/٢} ئەوەتا بەپێی ئەم ئایەتە ژن تەلاقدان لە پێش بەدەست گرتنداو ژن مارەبڕین بەبێ ناوبردنی مارەیی بە گوناه دانانرێ، ئەوەیش بەلگەیە لەسەر ئەوە کە گرێدان بەبێ دیاریکردنی مارەیی دروستەو دادەمەزرێ، ئەمەیش وەك ئەوە ژنێکی فامیدەی رەسیدە، بێوەژن بێ یا کچ، بە هەقداری خۆی بڵێ: بەبێ مارەییبمدە بەشوون هەقدارەکەیشی وا بکا، ئەوە مارەی دێ، جا خوا هەقدارەکەی لەکاتی مارەبڕینەکەدا ناوی مارەیی نەهێنێ، یا بە دەق بڵێ: ئەوا بەبێ مارەیی ئەو ژنەم مارە کرد لەتۆ.

بەهۆی یەکێ لەم سێ شتەوە مارەیی ئاسایی (مهر المثل: مارەیی وێنەی خۆی) پێویست دەبێ بۆ ژن لەسەر مێردی:

**یەکەم**: کاتێ قازی مارەیی دابنێ بۆ ژن لەم دوو حاڵەتەدا:-

**یەکەم**: مێرد نەیەوێ مارەیی دیاری بکا بۆ ژنەکە.

**دووەم**: ژن‌و مێرد کێشەیان بێ لەسەر ئەندازەی ناوبراو.

**دووەم**: ژن‌و مێرد خۆیان بڕیاری مارەیی ئاسایی بدەن.

**سێیەم**: کاتێ مێردەکە لە پێش ئەوەدا قازی مارەیی دابنێ بۆ ژنەکە، ئەو بڕواتە لای، یا لەپێش ئەوەدا کە خۆیان بڕیاری مارەیی ناوبراو بدەن ئەو بە دەستی بگرێ، لەم سێ شێوەیەدا مارەیی عادەتی لەسەر مێردەکە بۆ ژنەکەی دادەمەزرێ. لە مارەیی ئاساییدا بایەخ بە رۆژی مارە بڕینە، ئەگەر لە پێش دانانی مارەییدا، یا لەپێش

بەدەستگرتندا یەکێ لە ژن‌و مێرد مرد ئەوە مارەیی عادەتی پێویست دەبێ. ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نەسائی (بە رشتەیەکی ساغ) دەگێڕنەوە: پرسیارکرا لە ئیبنو مەسعوود {رەزای خودای لەسەربێ} ئەگەر پیاوێ ژنێ مارە بکاو مارەیی بۆ دیاری نەکاو بە دەستیشی نەگرێ تا خۆی دەمرێ مارەیی ئەم ژنە چییەو چی نیە؟ فەرمووی: مانەندی مارەیی کەسوکاری خۆی مارەیی بۆ دادەنرێ، وەك دایکی، یا خوشکی، یا پووری، بەبێ کەم‌و زۆر، وە بەشە کەلەپووریش دەگرێ، وە عیددەی (وەفات)یشی لەسەرە.

مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعیش هەڵسا فەرمووی: پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} لە شانی بەروەعەی کچی واشیقدا دەق وەك ئەم بڕیارەی تۆ بڕیاری دا، ئیبنو مەسعوودیش ئەم قسەیەی گەلێ پێ خۆشبوو (تەماشای تاجول ئوصولْ، بەرگی سێ، لاپەڕە (٨٣) بە کوردی، بکە – وەرگێڕ).

بزانن کە مانەندی مارەیی بەو ئەندازەیە دەگوترێ کە دەکرێ بە مارەیی ژنانی هاوشانی خۆی، جاکێ لە کەسوکاری‌لە ژنەکەوە نزیکتربێ مارەیی ئەو رەچاو دەکرێ وەك خوشکی، یا دایکی، یا پووری، تەنانەت ئەگەر پیاوێ ژنێکی تەلاقدا، لەپێش بەدەستگرتن‌و ناوبردنی مارەییدا، ئەوە پێویستە موتعەی بداتێ، کە برێتییە لە ماڵێ کە پیاوەکە دەیدا بەژنەکە لەپاش جیابوونەوە لە یەکتر. بەپێی مەفهوومی ئایەتی {وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ – سورة البقرة – ٢٣٧/٢} ئەوەتا بەپێی دەقی ئەم ئایەتە نیوەی مارەیی دەدرێ بەوژنە کە مارەیی بۆ دیاریکرابێ،

بەڵام لەپێش بەدەست گرتندا تەڵاق درابێ، دەی ئەگەر مارەیی بۆ دیاری نەکرا، وە لەپێش بەدەست گرتندا تەڵاقدرا ئەوە هەقی موتعەی هەیە بەپێی ئایەتی {وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ - سورة البقرة - ٢/٢٣٦}.

**خوا حەزکا لە دواوە باسێکی موتعە دەکەین.**

**مارەیی ئەندازەی بۆ دیاری نەکراوە:**

لەبەر ئەوە هەرچی دروست بێ ببی بە بەهاو نرخ بۆ زاتێ، یا بۆ کەڵکێ، دروستە بیشکرێ بە مارەیی، بەپێی فەرموودەکەی صەحیحەین کە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) بە پیاوەکەی فەرموو: شتێ پەیدا بکە با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ. کە لە دواییەکەیدا پێی فەرموو: ئەوا لەسەر ئەوە کە فێری ئەو قورئانەی بکەی کە خۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارەکرد لەتۆ. ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەم دوو شتەیە:

**یەکەم:** ئەو پەڕی کەمی لە مارەیی دا ڕەچاوبکرێ.

**دووەم:** دروستە کەڵك بکرێ بە مارەیی. بەپێی ئەم فەرموودەیەیش: عامیری کوڕی ڕەبیعە فەرمووی: ئافرەتێکی بەنی فەزارەیی لەسەر جووتێ سۆل شووی کردبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە جیاتی خۆت و ماڵت بە جووتێ سۆل ڕازی بووی؟ گوتی: بەڵێ. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) مارەبڕینەکەی دامەزراند (ئیبنو ماجەو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی

جوانه، هەروا بەپێی ئەم فەرموودەیەتریش: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: مارەیی جێبەجێ بکەن. یاران فەرموویان: چی دەبێ بە مارەیی؟ فەرمووی: هەرچی هەردوولا پێی رازی بوون دروستە بکرێ بە مارەیی.

ئەمەکاتی وایە کە ژنەکە فامیدە بێ، وە ئاغا کانیزەکی خۆی مارەببڕێ لە کەسێ، بەلاّم ئەگەر هەقدار ژنێکی حیجر لەسەر دانراوی لە کەسێ مارەبڕی، ئەوە بۆی نیە کە لەسەر کەمتر لە مارەیی مانەندی خۆی مارەی بڕی. بەهەر حاڵ سوننەتە کە مارەیی لە دە درەم کەمتر نەبێ، هەتا لە راجیایی ئەبو حەنیفە دەرباز ببین، چونکە لەلای ئەو پێویستە مارەیی لە دە درەم کەمتر نەبێ، هەروا سوننەتە لە ئەندازەی مارەیی هاوسەرەکانی پێغەمبەریش زیاتر نەبێ، کە برێتی بووە لە پێنج سەد درەم. بەلاّم مارەیی ئوممو حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر {دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرەکانی} کە چوار سەد دیناری زێڕی ئەو کاتە بووە، ئەوە پێغەمبەر خۆی نەیکردووە، بەڵکوو ئەوە نەجاشی بە پیاوەتی کردوویەتی {رەزای خوای لێبێ} وە لە ماڵی خۆی داوێتی، بۆ رێزو قەدری حەزرەت ئەوەی کردووە، کەواتە ئەم بڕیارە بەم حاڵەتە هەڵ ناوەشێتەوە.

## کەی نیوەی مارەیی لە کۆڵ دەکەوێ؟.

بزانن کە ژن دەبێ بە خاوەنی مارەیی خۆی تەنیا بە گرێدانێکی دروست، یا بەناو بردنی مارەیی، بە مەرجێ ناو بردنەکە لەسەر شێوەیەکی رەوابێ. دەنا مانەندی مارەیی دەکەوێ.

**مارەیی ژن لەسەر مێرد دادەمەزرێ بەهۆی یەکێ لەم دوو ڕێبازگەیەوە:**

**یەکەم:** بەهۆی چوونەلاوە، هەر چەند چوونەلاکەیش نادروست بێ، وەك ئەوە مێرد لەکاتی بێنوێژیدا، یا لەناو ئیحرامدا بڕواتە لای ژن، بەلگەی ئەم حاڵەتەیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ – سورة النساء – ٢١/٤)} واتە: چۆن زات دەکەنو لە خوودا ناترسنو ئەو مارەییە وەردەگرن لەو ژنە داماوانە، ئەمە لە کاتێکا کە ئێوەی ژنو مێردو حەلاڵو هاوسەر دەرپێ تێکەل بوون. دەی ئەمە بەلگەی ئەوەیە کە بەدەستگرتنی ژن لەلایەن مێردەوە دەبێ بەهۆی دامەزراندنی مارەیی.

**دووەم:** مارەیی دادەمەزرێ بەهۆی مردنی یەکێکیانەوە، هەر چەند هێشتا بەدەستیشی نەگرتبێ چونکە بە مردنی لایەك مارەبڕین دێتە کۆتایی، کەواتە ڕێك وەك حاڵەتی بەکرێدان وایە دەبێ کرێ لەسەر دراو بەتەواوی بدرێ بە خاوەنی. بەلام ئەگەر نەچوونەلا رووی دا ، وە نەرمردن رووی دا، وە بەبێ هۆیەك لە ژنەکەوە، یا لە مێردەکەوە، جیا بوونەوە رووی دا، وەك ئەوە لە خۆیەوە تەلاقیدا، یا تەلاقدانی سپارد بە ژنەکە خۆیو ژنەکەیش وایکرد، یا تەلاقدانی تەعلیق کرد بەشتێکەوە، وەك چوونە ناو خانویەك، یا خولعی لەگەڵدا کرد، لە هەموو ئەم حاڵانەدا مارەیی دەکرێ بە دوو کەرتەوە، نیوەی دەگەڕێتەوە بۆ مێردەکەو نیوەی دەمێنێتەوە بۆ ژنەکە، بەپێی ئایەتی: {وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ} .

## ٢٦٦) باسی هەقی موتعە:

**موتعە**: ناوە بۆ ماڵێ کە مێرد دەیدا بەژنی خۆی لە پاش جیابوونەوە لێی. جیا بوونەوە دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم**: جیابوونەوە بەهۆی مردنەوە، ئەمە بە یەکگرتنی رای زاناکا، نابێ بەهۆی پەیدابوونی مافی موتعە.

**جۆری دووەم**: جیا بوونەوەی کاتی ژیانی هەردوولا، جا جیا بوونەوەی وا ئەگەر لەپێش بەدەستگرتن دابوو وە ناوی مارەییش نەبرابوو ئەوە حەقی موتعە هەیە بۆ ژنەکە، بەلاٌم ئەگەر لەپاش بەدەست گرتن تەلاٌقی دابوو ئەوە مانەندی مارەیی خۆیی دەکەوێ، لە مافی موتعەدا موسوڵمانو پەیماندارو پیاوی ئازادو پیاوی کۆیلەو ژنی ئازادو کەنیزەك چون یەکن، وا سوننەتە کە موتعە لە سیی درەمی زیو کەمتر نەبێ، پیاوو ژن لەناو خۆیاندا لەسەر هەرچی پێك بێن ئەندازەی پێویستی پێ جێبەجێ دەبێ، بەلاٌم ئەگەر بوو بە کێشەو بەرەیان ئەوە قازی بەپێی کۆشش واجتهادی خۆی، وە بەپێی دەوڵەمەندیو هەژاریی کابرای مێردی ژنەکە ئەو مافەی بۆ دیاری دەکا، دروستە کە ماڵی موتعە لە نیوەی مارەییش زیاتربێ، چونکە ئایەتەکەی موتعە بەرەهایی باسی موتعە دەکا، کە دەفەرموێ: {وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ – سورة البقرة – ٢/٢٣٦}.

## ٢٦٧) بڕیاری ژن بە ژن:

ژن بەژن پووچەڵە، چونکە لە حەدیثێکی بوخاریو موسلیمدا دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} جڵەو گیریی دەکرد لە ژن بە ژن، ژن بە ژنیش ئەوەتانێ کە دوو پیاو بە کچی خۆیان ژن بە ژن بکەن بەبێ مارەیی. بەپێی ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی تر ژن بە ژن ئەوەتانێ کە پیاوێ بە پیاوێ تر بڵێ: هەقدارەکەی خۆتم لێ مارە بکە منیش هەقدارەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم، بە مەرجی ئەوە کە بە دەستگرتنی هەرکامێکیان ببێ بە مارەیی ئەوی تریان، ئەویش قەبووڵی ئەوەبکا. بەڵام ئەگەر بە دەستگرتن نەکەن بە مارەیی، وەك ئەوە هەردوولا لەکاتی مارەبڕیندا باسی مارەیی نەکەن ولێی بێ دەنگ بن، ئەوە مارەبڕینی هەردوولا دادەمەزرێ، چونکە لەسەر ئەم شێوەیە تەنیا ئەوەی تیایە کە بۆ دامەزراندنی گرێدانی مارەبڕینی یەکەم مەرجە گرێدانی مارەبڕینی دووەمیش سەربگرێ، شتی وایش مارەبڕین پووچەڵ ناکاتەوە، وە لەم کاتەدا ئەو دووژنەی کە بەبێ مارەیی ژن بە ژنیان پێکراوە، هەر کەسەیان مانەندی مارەیی خۆیی بۆ هەیە.

## ٢٦٨) نانی شایی:

نانی شایی بەعەرەبی پێی دەگوترێ وەلیمە، لە (ولم) دروست بووە، کە بەواتا کۆبوونەوەیە، چونکە ژنو مێرد لەم کاتەدا کۆدەبنەوە.

ئیمامی شافیعی {رەزای خودای لەوروەی لێبێ} دەفەرموێ: (ولیمە بەو دەعوەتە دەگوترێ کە بە بۆنەیەکی خۆشەوە ساز دەدرێ، وەك شایی ژنهێنانو منداڵ سوننەتکردنو شتی تری لەم بابەتانە).

وەلیمە لە عەرەبیدا بەپێی شوێن‌و بۆنە ناوەکەی دەگوترێ، لە کوردیشا هەروایە، دەعوەتی ژنهێنان پێی دەگوترێ: وەلیمە، واتە: نانی شایی، دەعوەتی سوننەتکردن پێی دەگوترێ: اعذار واتە: ئاهەنگ، دەعوەتی مندالْ بوون پێی دەگوترێ: عەقیقە، واتە: حەوتم، دەعوەتی رزگاربوونی ئافەرەت لەکاتی مندالْبووندا پێی دەگوترێ: خورس، واتە: مەولوودی، دەعوەتی هاتنەوە لە سەفەر پێی دەگوترێ: نەقیعە، واتە: قاوەلْتوون، دەعوەتی خانوو دروستکردن پێی دەگوترێ: وەکیرە، واتە: بەرەدرگانە، نان دروستکردن بە بۆنەی ناخۆشەوە پێی دەگوترێ: وەضیمە، نانی شین، نانی پرسە. نان دروستکردن بەبێ بۆنەیەکی تایبەت پێی دەگوترێ: مەئدوبە، واتە: دەعوەت، یا بانگهێشتن تەماشای (مختصر المزني بهامش الأم – ٣٩/٤) لەگەل القاموس ماددەی (ولم) بفەرموو).

**حوکمەکەی:**

نانی شایی سوننەتە، لە قیلێکا دەلْێ: پێویستە. چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە عەبدورەحمانی کوڕی عەوفی فەرموو: نانی شایی دروست بکە، هەر هیچ نەبێ مەڕێ بکە بە نانی شایی. (شەیخان گێڕاویانەتەوە). لەبەر ئەوەیش کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نە لە مالْەوەو نە لە سەفەردا نانی شایی تەرك نەکردووە.

بەلاّم فەرموودەی رۆشنتر ئەوەیە کە سوننەتە، چونکە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: مافێ کە لە ساماندا هەیە بۆ خەلْکی تر هەر زەکاتەو بەس. لەبەر ئەوەیش چونکە هەر تایبەت نیە بە ئاتاجەکانەوە،

دەوڵەمەندیش لێی دەخوات، کەواتە دەق وەك قوربانی وایەو سوننەتەو پێویست نیە، بە قیاس لەسەر هەموو جۆرە قاوەڵتیو دەعوەتێکی تریش. فەرموودەی (نانی شایی دروست بکە..) دەبڕین بەسەر ئەوەدا کە زۆر سوننەتێکی گەورەیەو لە هەمووان دروست کردنێکی تری لەم بابەتە سوننەترە.

لای کەمی نان دروستکردن بۆ شایی مەڕێکە چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە مەڕێکی کرد بە نانی شایی، ئەوەندە هەیە هەرشتێ بەم بۆنەیەوە سوودو قازانجی هەبێ بریتی نانی شایی دەکەوێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە صەفییەی گواستەوە قاوتو خورمای بۆ کرد بە نانی شایی.

گوتمان دروست کردنی نانی شایی سوننەتێکی گەورەیە بەلام ئەگەر کەسێ بانگ کرا بۆ سەر شایی بۆ نانخواردن پێویستە بڕوا، لەسەر فەرمایشتی سەنگین، چونکە چەن فەرموودەیەکی دروستو ساغ لەم بابەتەوە هەیە، وەك ئەوە دەفەرموێ: ئەگەر خوڵك کران بۆ سەر نانی شایی بچن بۆی. لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خراپترین نان نانی شاییو شیرینیو شتی وایە، چونکە دەوڵەمەندان بانگ دەگرێن بۆیو هەژاران بانگ ناگرێن، ئەو کەسەشی خوڵك بکرێو نەچێ ئەوە لە خوداو لە پێغەمبەری خوا یاخی دەبێ! (موسلیم گێڕاویەتەوە) بەلام بانگکردن بۆ سەر غەیری نانی شایی، بەهەر بۆنەیەکەوە بێ سوننەتە، هەروا ڕۆیشتنیش بۆی سوننەتە.

## ٢٦٩) مەرجی پێویستبوون یا سوننەتبوونی چوون بۆ سەر دەعوەت:

١) بانگهێشتنەکە دەبێ لەسەر ئەم شێوەیە گشتی بێ، بۆ گشت هۆزەکەبێ، یا بۆ گشت دەرو دراوسێ بێ، یا بۆ گشت هاوپیشەکان بێ، بە دەوڵەمەندو هەژاریانەوە، نابێ بە تایبەت بۆ هەندێ کەس بێو بۆ هەندێ کەسی تر نەبێ، یا هەر بۆ دەوڵەمەندان بێو هەژاران لێی بێبەش بن، خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بەدترین نان نانی شاییو شیرینییە، ئەوەی کە خۆی دەیەوێ بچێ بۆی رێگەی نادەن، ئەوەی دەعیەی نایبا خولکی دەکەن بۆ سەری، ئەو کەسەیشی خولکی بکرێو نەچێ ئەوە لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ! (موسلیم) لە فەرموودەیەکی تردا خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بەدترین نان نانی شاییو شیرینییە، تێروتەسەل بانگ دەکرێ بۆیو لە برسی قەدەغە دەکرێ (طەبەرانی).

٢) ئەوەتە بە تایبەت خۆی پێی بڵێ، یا کەسێ بنێرێ بە شوێنیدا. بەڵام ئەگەر دەرگای ماڵی خستە سەرپشتو گوتی: کێ دەیەوێ بابێ، بەوە چوون بۆ سەرنانی شایی پێویست نابێ.

٣) ئەوەیە کە لەو کۆڕو دانیشتنەدا کەسێکی وا نەبێ کە ئەم پێی نارەحەت بێ، وەکوو مەردومی خوێڕیو هیچو پووچ، خۆشی خانە دانو خاوەن رێزبێ.

٤) ئەوەیە لەوێ کارێکی ناشایستە نەبێ وەك بادەنۆشی‌و رەشبەڵەك‌و دەهۆڵ‌و زورناو هەڵپەرکێ‌و سەمای نارەوا، لەکاتی وادا چوون نە پێویستەو نە سوننەت، مەگەر بەهۆی رۆیشتنی ئەمەوە ئەو وەزعە ناشایستەیە لابچێ، ئەوە لەسەریەتی کە ئامادەی ببێ هەتا ئەو بارە خراپە نەمێنێ. ئەمە قسەمان لەوەیە کە لە پێشا بە ناشایستەکەی زانیبێ، بەڵام ئەگەر هەتا کاتی ئامادە بوون پێی نەزانێ ئەوە نەیان لەو بێ شەرعییە لێ دەکا، جا ئەگەر وازیان نەهێنا دەبێ لەوێ دەربچێ، نابێ لەگەڵیان دابنیشێ، چونکە دانیشتنی وا نادروستە، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ – سورة الأنعام – ٦/٦٨}.

٥) ئەوەیە کە دەعوەتی شایی ژن گواستنەوە لە رۆژی یەکەم دابێ‌و دەعوەتەکانی تر یا رۆژی یەکەم یا رۆژی دووهەم بێ، لە رۆژی دووهەما چوون پێویست نیە بۆ سەرنانی شایی، بەڵکوو لە رۆژی سێهەما چوون ناباشە.

٦) دەبێ بانگکەر موسوڵمان بێ، دەنا ئەگەر بانگکەر ناموسوڵمان بوو ئەوە دروست نیە کە بچێ، چونکە شتی وا دۆستایەتی‌و خۆشەویستیی بێبڕوا دەگەیەنێ. کە خودا نەیی لێ دەکاو دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ – سورة الممتحنة – ٦٠/١} تا کۆتایی ئایەت. هەندێ لە زاناکان دەفەرموون: دۆستایەتی‌و خۆشەویستیی موسوڵمانی بەدکاریش بەر بڕیاری ئەم ئایەتە دەکەوێ، کەواتە هانشینیی بەدکاران بۆ دەمە تەقێ‌و

شتی وا نادرستە، بۆیە جارێ سوفیانی ئەوری تەوافی بەیتی دەکرد، لەو حەلەدا وا رێکەوت هاروونە رەشید هات بۆ تەوافی بەیت، سوفیان تەوافەکەی بڕیو رۆیشتو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ} تاکۆتایی ئایەت. ئیبنو ئەبی وەرادیش وایکرد، ئەم زاتانە لەم بۆچوونەیاندا پەیرەوی تێکڕایی فەرمایشتەکە دەکەن (تێکڕایی فەرمایشت – عموم اللفظ).

گریمان چەن کەسێ خوڵکی بکەن، دەچێ بۆ سەر دەعوەتی هەرە پێشینەکەیان، خۆ ئەگەر هەموویان پێکەوە خوڵکیانکرد، دەچێ بۆ سەر دەعوەتی خزمترینیان، ئەوجا هی ئەوەیان کە ماڵەکەی زۆر نزیکترە.

## ٢٧٠) نۆرەکاریی (قەسم) لە نێوانی هاوسەراندا:

پێویستە لەسەر ژنو مێرد دوو هاوسەری تەبا بنو پێکەوە بە خۆشی بە شێوەیەکی رەوا ژیان بگوزەرێننو هەر کەسەیان مافی سەری بەرابەر بەهاو سەری جێبەجێ بکا، زوڵمو زۆرو ناهەقیو چاووراو لە یەکتر نەکەنو لەگەڵ یەکتردا رووخۆشو گونجاوو سازاوبن. زاتی پاك دەفەرموێ: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ – سورة البقرة – ٢٢٨/٢} واتە: پیاوو ژن بەپێی شەیعەت هەقو مافیان چون یەك لەسەر یەکتری هەیە، تەنیا ئەوەندە هەیە کە پیاوان یەك پلەیان هەیە

بەسەر ژنانەوە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَعَاشِرُوهُنَّ – سورة النساء – ١٩/٤} واتە: لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا بە جوانی ژیان پێکەوە ببنەسەر بەپێی یاسای چاکە خوازی). شافیعی دەفەرموێ: شیرازەو سەر روشتەی هەموو چاکەیێ ئەوەیە: کە واز لە ئازاری خەڵك بهێنێ، ئەگەر مافی کەسێکیشت لەسەربوو، بەسەر راستی بیدەیتە دەستی، ناچاری ئەوەی نەکەی کە ئەو بە شوێن تۆدا بگەڕی هەتا هەقەکەی بدەیتەوە! (چاکە واتە: مەعروف – وەرگێڕ).

کاتێ پیاوێ چەند ژنێکی هەبوو، دەبێ لە نێوانیاندا هەقانیی بێ، ستەم لە کەسیان نەکا، بەشەو بەسەرە لەلایان بێ، دەبێ بەهۆی دەووتیرو پشکەوە نۆرە ئەویان بۆ دیاری بکا، یا لەسەر رەزای ژنەکانی تری لە ژنێکەوە دەست بە نۆرەکاری لە نێوانیاندا بکا. چونکە فەرمان کراوە بە داد لە نێوانیاندا، شتی وایش بەشێکە لە دادپەروەری لەم بارەیەوە. بۆ ئەمە کاتو شوێن رەچاو دەکرێن، لە لایەنی جێگەوە دروست نیە کە ژنەکانی لەیەك ماڵدا کۆبکاتەوە، ئەگەر بۆ تەنیا شەوێکیش بووە، مەگەر لەسەر رەزامەندیی خۆیان چونکە سەر دەکێشێ بۆ ناکۆکی زۆر، ئەوەیش دەبێ بەهۆی لە فەرمان دەچوونیانو دەبێ بە ماکی ئاژاوەی ناو خێزان، چونکە ئەوان بە سروشت نامۆیی لە یەکتری دەکەن، ئەوەیش دوورە لە موعاشەرە بە مەعرووف، کە خودا لە قورئاندا فەرمانی پێ دەکا. وەکی تریش هەرژنێ لەوان مافی ماڵی سەربەخۆی خۆی هەیە، هەروەك چۆن لە جلو بەرگا دەتوانێ هاوبەشی کەسی تر نەکا لە خانوویشدا هەروا.

لە لایەنی وەختیشەوە سەرەکی (ئەصڵ) لە دابەشکردنی کاتدا بەسەر ژناندا شەوە، چونکە شەوکاتی حەسانەوەیەو خوا دایناوە بۆ حەوانەوە، بەڵام رۆژ بۆ هەوڵو تێکۆشانو گەڕانە بە شوێن کارو فرمانا، گەرچی ئەمە زوربەی کات وایەو مەرج نیە کە هەموو کەس لە شەوا وچان بگرێو بە رۆژ رەنج بدا، جا لەبەر ئەمە ئەگەر کەسێ بە شەو ئیشی دەکردو بە رۆژ بێ ئیشبوو، وەك ئێشکچیی شەو، ئەم جۆرە کەیانە دەبێ رۆژ دابەش بکەن بەسەر ژنەکانیاندا، لەم حاڵەدا شەودەبێ بە پاشکۆی رۆژ. بۆ رێبواریش کاتی لادانو وچان گرتن دەکرێ بەسەرچاوەی نۆرەکاریی، لەکەم کەمو لە زۆر زۆر، حەرامە پیاو لە سەرەی ئەصڵی ژنێکا بڕواتە لای ژنێکی تری، مەگەر لەبەر ناچاری، بەڵێ ئەگەر لە رۆژا بۆ ئیش چوو بۆ ماڵی یەکێکیان ئەوە دروستەو قەزای ئەوەی لەسەر نیە، وەك ئەوە بچێ شتێ لەوێ دابنێ، یا شتێ وەربگرێ، یا نەفەقە تەسلیم بکا، یا بۆ کاری تری لەم جۆرە. بەڵام ئەگەر لەبەر ناچارییەك چوو، وەك نەخۆشی سەخت، یا مەترسیدار، ئەوە دەبێ زۆرنەمێنێتەوە، دەنا ئەگەر زۆر مایەوە دەبێ بۆ ژنە خاوەن سەرەکە نۆرەکەی قەزا بکاتەوە بەقەد ئەو ماوەیە. لە حەدیثدا دەفەرموێ: ئەبو هورەیرە فەرمووی: خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کەسێ دوو ژنی هەبێ بەڵام یەکێکیانی پتر بوێ ولایەنی ئەو زیاتر بگرێ ئەوە لە رۆژی قیامەتا کە دێت لایەکی لارەسەنگە. (ئەبو داوودو ترمیذیو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە. ئیبنو حەببان بە فەرموودەیەکی ساخی دروستی داناوە) حاکمیش دەفەرموێ: بەپێی

مەرجی هەر دوو پیرە، کە دایان ناوە بۆ فەرموودەی دروست (هەر دوو پیر واتە: شەیخەین: بوخاریو موسلیم).

پیاو ئەگەر بەپێی شەرع ئەوەندەی لەبەر چاوە، لەنگەری هاوسانی لە نێوانیاندا رابگریٚ ئیتر گلەیی ئەوەی لیٚ ناکریٚ کە بەدڵ هەندێکیانی زیاتر خۆش بویٚ، تەنانەت هاوسانی لە دروست بوونیشدا مەرج نیە، هەروا لە هەموو لەزەت وەرگتنێکی تردا، بەڵام لەم لایەنەیشەوە هەر یەکسانی لە نێوانیاندا سوننەتە، لە راستیدا حەزی دڵ بە دەست مرۆڤ خۆی نیە، عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرمویٚ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نۆرەکاریو لەنگەری دادگەریی لە نێوان ژنەکانیدا رادەگرت، وەك پەك نازی دەگرتنو وەك یەك جلو بەرگی بۆ دەکردنو وەك یەك بەشەو لەلایان دەمایەوە، ئینجا دەیفەرموو: خودایە! ئەمە نۆرەکاریی منەو من هەر ئەم دابەشکردنەم لە دەست دیٚ، ئیتر لەسەر ئەوەی کە بە دەستی تۆیەو دەستەڵاتی منی تیادا نیە، کە حەزو مەیلی دڵە، لەسەر ئەوە سەر کۆنەو سەرزەنشتم مەکە. (ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی بە رشتەیەکی باش — سند صالح — گێڕاویانەتەوە، ئیبنو حەببان بەساخی داناوە، حاکمیش دەفەرمویٚ: بەپێی مەرجی موسلیمە).

بزانن کە دابەشکردنی وەخت بە هاوسانی پێویستە ژنی نەخۆشو تاتو بێنوێژو زەیستان بگرێتەوە، هەروا ژنی ئیحرامدارو ژنیٚ کە مێردەکەی ئیلای لەگەڵ داکردبیٚو ژنیٚ ظیهاری لەگەڵدا کرابیٚو ژنی منداڵکارو ژنی شێت، ئەگەر شێتەکە جێگەی مەترسی نەبوو، چونکە

مەبەست هاودەنگیو دەمەتەقێیە. بەڵام ژنێ کە لە فەرمانی مێردەکەی دەرچووبێو یاخی (ناشزە) بێ لێی مافی شەو چوونەلای نیە، هەروا ژیوارو نەفەقەشی ناکەوێ.

## ٢٧١) دەوکردنی کاتی ڕێبواری:

کاتێ مێرد ویستی ژنێکی خۆی لە سەفەردا ببا لەگەڵ خۆی دەبێ تیروپشك لە نێوان ژنەکانیدا بکا، جاپشك بە ناوی هەر کامێکیانەوە دەرچوو ئەوەیان دەبات لەگەڵ خۆی. سەر بەڵگەی ئەم بڕیارە ئەم فەرموودەی عائیشەیە (خۆشنوودیی خودای لێبێ) کە دەفەرمێ: دەستووری پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وابوو کاتێ دەیویست بچێ بۆ سەفەر، تیروپشکی دەکرد لە نێوان ژنەکانیدا پشك بەناوی هەر ژنێکییەوە دەربچوایە ئەوەیانی دەبرد لەگەڵ خۆی بۆ ئەو سەفەرە. (شەیخان).

جا ئەگەر بەهۆی دەوکردنەوە ژنێکیانی لەگەڵ خۆی برد بۆ سەفەر ماوەی هەردوو سەری ڕێگەکەو، ماوەی مانەوە بۆ جێبەجی کردنی کارو فرمانی سەفەرەکە لە شارو شوێنەکان، ئەو ماوەیانە کە گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی قەزاناکاتەوە بۆ ژنەکانی تری، مەگەر ئەوماوەیە کە گەیشتۆتە جێگەی مەبەستو پتر لە ماوەی ڕێبواران تیادا ماوەتەوە، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} عائیشەی برد بۆ سەفەرێ کە گەڕایەوە قەزای ماوەی سەفەرەکەی نەکردەوە بۆ ژنەکانی تری، لەبەر ئەوەیش کە ڕێبوار لە سەفەردا ئەرکی زۆر دەکێشێ، دەی

ئەگەر ئەو ماوەیە بۆ ژنەکانی تری بگێڕێتەوەو هەقیان بۆ بکاتەوە ئەوە لەدوو سەرەوە ژنە نیشتەجێکان قازانج دەکەن.

**مەرجی نەگێڕانەوە:**

**بزانن کە ماوەی سەفەر بەچەن مەرجێ قەزاناکرێتەوە:**

**یەکەم:** ئەوەیە مێرد دەوبکا لە نێوانیاندا، دەنا ئەگەر دەوی نەکرد دەبێ ئەو ماوەیە قەزا بکاتەوە بۆ ژنە لە ماڵ جێماوەکانی.

**دووەم:** ئەوەیە نیازی گواستنەوەی ئێجگاریی نەبێ لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، چونکە ئەگەر بە یەکجاری بڕوا بۆ جێگایەك نادروستە هەندێ لە ژنەکانی لەگەڵ خۆی بباو هەندێکیان بەجێ بهێڵێ، ئەگەر وا بکا دەبێ هەقی ئەوە بۆ ژنە جێماوەکان بکاتەوە.

**سێیەم:** نابێ لە سەفەرەکەدا نیازی نیشتەجێیی بهێنێ.

**ژنی تازە:**

کاتێ پیاوێ ژنێکی نوێی هێنا نۆرەکاریی لەوەپێشی نێوان ژنە کۆنەکانی دەپچڕێنێو بەپێی ئەم فەرموودەیە رەفتار دەکا کە ئەبو قیلابە لە ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ئەنەس {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن حەوت شەو لەلای ژنە تازەکەی بێ، ئینجا بەسەرە وەك یەك شەویان بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ سێ شەو لەلای ژنە تازەکەی بێ، ئینجا بە نۆرە وەك یەك شەویان بۆ دابنێ. ئەبو قیلابە فەرمووی:

ئەگەر بمەوێ لە باتی ئەوەی بڵێم: ئەنەس فەرمووی: سوننەت وایە.. تاد، دەڵێم: ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر کچی هێنا بەسەر.. تاد (شەیخان) واتە: ئەگەر کچێکی تازەی هێنا مافی هەیە حەوت شەو لای بمێنێتەوە، وە ئەگەر بێوەژنێکی هێنا مافی ئەوی هەیە سێ شەو لەلای بمێنێتەوە مەبەست لەم چەن شەو مانەوەیە لای ژنی تازە بۆ ئەوەیە کە هەر دوو هاوسەر شەرمیان لە یەکتر بشکێ، پێویستە ئەم حەوت شەوو سێ شەوە بەسەریەکەوە بن‌و پچڕ پچڕ نەبن، چونکە ئەگەر شەوەکان پچڕ پچڕ بن سەرمیان لە یەکتر ناشکێ. سوننەتەکە بیوەژن خاتر خۆ بکا لە بەینی سێ شەودا بەبێ قەزاکردنەوە یا حەوت شەو لەگەڵ قەزاکردنەوەدا بۆ ژنەکانی تری، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کاتێ ئوممو سەلەمەی گواستەوە لە نێوانی ئەم دوو ژمارەیەدا خاتر خۆی کرد. بەڵام ئەگەر پیاوەکە لە خۆیەوە، نەك لەسەر خواستی ژنە تازەکەی حەوت شەو لەلای بێوەژن مایەوە، ئەوە هەر چوار شەوە زیادەکە قەزادەکاتەوە بۆ ژنەکانی تری.

## ٢٧٢) ژنی لە مێرد یاخی: ناشزە = نافەرمان:

نافەرمانی ژن ئەوەیە لە فەرمانی مێرد دەرچێ، جا خواه بە گوتار لە فەرمانی دەربچێ، یا بە کردار، هی گوتار وەك ئەوە ژنەکە لەوەپێش زمانی شیرین بووە لەگەڵ مێردەکەی، بەڵام ئێستا کە گۆڕاوەو وانەماوە، هی کرداریش وەك ئەوە لە وەوپێش رووی خۆش بووەو ئێستا مۆن‌و نامۆبووە، یا وەك ئەوە مێردەکەی داوای سەرجێیی لێبکاو، ئەو مل نەدات، جا هەر کاتێ شتێ وا رووی دا مێرد بە قسەی باش

ئامۆژگاری ژن دەکا، فەرمانی پیٚ دەکا بە لە خودا ترسان، وە هەڕەشەی سەرەنجامی خراپی ئەو کارەی لیٚ دەکا، بەپێی ئەم ئایەتە: {وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ – سورة النساء – ٣٤/٤} واتە: ئەو ژنانەی کە مەترسی ئەوەیان لیٚ دەکەن کە بێگوێیی‌و نافەرمانیتان بکەن بە شێوەیەکی دانایانە ئامۆژگارییان بکەن). لەم قۆناغەدا نابیٚ جێی لیٚ جیا بکاتەوە، یا لێی بدا، چونکە هەڵ دەگریٚ کە بە ئامۆژگاری لە هەڵەی خۆی پەشیمان ببێتەوەو عوزر خوایی بکاو داوای لێبوردن‌و چاو پۆشی بکا، بەڵام ئەگەر بە ئامۆژگاری چاری نەکرا، وەکارەکە سەری دەکێشا بۆ کێشەو بەرەو سەراسیٚ ئەوە ئەوسا جێی لیٚ جیا دەکاتەوە بەڵام قسەی لیٚ دانابڕیٚ، هەتا ئەگەر قسەی لیٚ دابڕیٚ نابیٚ لەسیٚ رۆژ پتر قسەی لیٚ دابڕیٚ، لەم بارەیەوە خۆشەویست {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: نادروستە بۆ موسوڵمان لە سیٚ رۆژ پتر قسە لە برای ئایینی خۆی دابڕیٚ. بەڵیٚ ئەگەر قسە لیٚ دابڕاو پیاوێکی بە درەفتاربوو (وەك ئەوە بەدکاربوو، یا بیدعەتکاربوو، یا شتێکی لەم بابەتە بوو) ئەوە دروستە لە سیٚ رۆژ پتر قسەی لیٚ دابڕیٚ، هەروا ئەگەر قسە لیٚ دابڕینەکە خێری شەرعیی قسە دابڕ، یا قسە لیٚ دابڕاوی تیادا بیٚ، چونکە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} زیاتر لە سیٚ رۆژ دەنگی لە کەعبی کوڕی مالیك‌و دوو هاوڕێکەی دابڕی، وە فەرمایشتی کرد بە هاوڕێیانی خۆی کە قسەیان لەگەڵ نەکەن‌و دەنگیان لیٚ دابڕن.

بەڵام ئەگەر نا فەرمانی چەند جار دووبارە بۆوە، وەژنەکە لە کەلی شەیتان نەهاتە خواریٚ ئەوە بۆی هەیە کە دەنگی لیٚ دابڕیٚ، هەروا بۆی هەیە کە لێی بدا، بەبیٚ راجیایی زانایان لەم بارەیەوە، بەس

ئەوەندە هەیە ئەم جۆرە لێدانە مەبەست لێی تەمێکردنو ئامۆژگارییە، مەبەست کوتەککاریو ئێش پێگەیاندنی زۆر نیە، نابێ لێدانێکی خوێناوی بێ، یا زیان بەخش بێ، نابێ لە روخساری بدا، بەڵکوو بە ئاسپایی بۆ تەمێو تەسکین لە جێگەیەکی بێ مەترسی دەداو بەس. ئەوەندە هەیە زمان درێژیی دانانرێ بەنا فەرمانی، وەك زۆر لە ژنان لە رووی نازەوە شەرمیان لە مێردیان شکاوەو لە رووی مێردیاندا دەمەدەمێ دەکەنو دەچنەوە بە گژدەمیاندا، بەڵام بەم دەم درێژیو دەمەوەرییە ژن گوناە باردەبێ، وە شایستەی ئەوە دەبێ کە بەپێی حاڵ تەمبێ بکرێ چونکە شتی وا ئازاری دڵی مێرد دەدا.

## ٢٧٣) باسی خولع، واتە: ژن داماڵین:

**خولع واتە:** دارنین یا داماڵین، یا لەبەر داکەندن، دەگوترێ: (خلع الثیاب). واتە: جلەکەی لەبەر خۆی داکەند) لە شەرعی شەریفیشدا برێتییە لە جیابوونەوەی ژن لە مێرد بەرابەر بە وەجەلێکی مەبەست کە بگەڕێتەوە بۆ مێردەکە. بە یەککگرتنی دەنگی زانایانی شەرع ژن خولعکردن دروستە، گەرچی خولع لە خۆیدا ناباشە، باسی ژن خولع کردن لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی نازداردا هاتووە، یەزدانی پاك لە بابەت ژن خولعکردنەوە دەفەرموێ: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ - سورة البقرة - ٢/٢٢٩} واتە: ئەوە لە بارودۆخێکی وادا لە پێشەوە باسکرا، ژنو مێرد گوناهیان ناگا، لەسەر ئەوە کە ژنەکە لە تۆڵەی بەرەڵاکردنیدا برێ ماڵ بدا بە مێردەکەی.

ئیبنو عەبباسیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ژنەکەی ثابیتی کوڕی قەیس هاتە لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! گلەییم لە ڕەوشتو بەدینیی ثابیت نیە، بەڵام دەترسم ئەگەر بە شێوەیەکی ڕەوا دەستم لە دەستی نەبێتەوە خۆم کافر بکەم. پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئەو باخەی کە لەباتی مارەیی دوایێتی پێت دەیدەیتەوە پێی؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی بە ثابیت: باخەکەی لێ وەربگرەو تاقەیەك تەڵاقی بدە (بوخاری).

ئەو ماڵەی کە ژنی لەسەر خولع دەکرێ دروستە یەکێ لەم شتانە بێ: ژن خولع بکرێ لەسەر مارییەکەی، لەسەر هەمووی، یا لەسەر هەندێکی، یا لەسەر هەرماڵێکی تر، ئیتر لە ئەندازەی مارەیی کەمتربێ یا پتربێ، جیاوازیش نیە لە نێوانی زاتو قەرزو قازانجدا. کۆگری ئەمەیش ئەوەیە: هەرچی دروست بێ ببێ بە مارەیی دروستیشە ببێ بە وەجەڵ لەکاتی ژن خولعکردندا، بەپێی تێکڕایی (عموم)ی فەرمایشتی یەزدانی پاك: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ} چونکە خولعیش وەك مارەبڕین گرێدانێکە لەسەر شەرمگا (فەرج)ی ئافرەت.

## مەرجەکانی وەجەڵی خولع:

مەرجی وەجەڵ ئەوەیە زانراوبێو ماڵ بێ، لەگەڵ مەرجەکانی تری وەجەڵدا، وەك توانای بە دەستەوە دانو موڵکی ساغی خاوەنەکەی بێو.. تاد، چونکە ژن خولعکردن ڕێدانی ئاڵشتی قازانج بە قازانجە، لەبەر ئەوە دەق لە فرۆشتنو مارەیی دەکا.

ئەمە مەرجی خولعی دامەزراوە، بەڵام لە خولعی دانەمەزراودا مەرج نیە تۆڵە (وەجەڵ – عوض)ەکە زانراوبێ، تەنانەت ئەگەر مێرد لەگەڵ ژنەکەیدا لە سەرشتی نەزانراویش خولع بکا، یا لەسەر مەرجێکی پووچەڵ خولعی لەگەڵ بکا، وەك ئەوە ژنەکە دووگیان بێ مێردەکەی لەسەر ئەوە خولعی لەگەڵدا بکا، هەتا عیددەی سکەکەی تەواو دەبێ لەو ماوەیەدا نەفەقەی نەکەوێ، یا وەك ئەوە لەسەر هەزار خولعی لەگەڵدا بکا بۆ ماوەیەکی نادیار، یا لەسەر وێنەی تری ئەم مەرجە پووچەڵانە، ئەمە لەم حاڵەتانەدا تەڵاقی ژنەکە دەکەوێو لە مێردەکەی بائین دەبێو ژنەکە لە باتی ئەو وەجەڵە پووچەڵە مانەندی مارەیی دەکەوێ.

### ئە نجامی خولع:

ئەنجامەکەی ئەوەیە ژنەکە دەبێ بە خاوەنی خۆیو لە ژنێتیی مێردەکەی رزگاری دەبێ، بەبێ رەزامەنی خۆی مێردەکەی ناتوانێ بیباتەوە ژێر رکیفی خۆیو سەر لە نوێ مارەی بکاتەوە لە خۆی، چونکە ژنەکە ئەو ماڵەی کە داویێتی بە مێردەکەی لە پێناوی رزگارکردنی خۆیدا داویێتی.

### بڕیارەکەی:

ژن خولعکردن لەکاتی بێنوێژییو لەکاتی پاکیدا دروستە، چونکە خودای گەورە بەرەهایی وموطلەقیو بەبێ بەندو مەرج دەفەرموێ: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ} لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەبێ بەندو مەرج رێگەی دا بە ثابیت

ژنەکەی خولع بکا، ئەوەبوو لە حاڵەکەی نەکۆڵییەوە، بێنوێژیش بۆ ئافرەت کارێکی ئاساییە، کارێ نیە کە بە دەگمەن رێ بکەوێ، هەتا بگوترێ: بۆیە پێغەمبەر لە کارەکەی نەکۆڵیوەتەوە. شافیعی (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: نەکۆڵینەوە لە مەسئەلەکانی بارودۆخ، کە چەند باری هەڵبگرێ، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو فەرمایشتە بۆ گشتییە. ئەوەتا لەم مەسەلەیەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە بارودۆخەکە نەکۆڵیوەتەوە، کە ئایا ئەو ژنە بێنوێژە یانا؟ بەلام ئەوەی کە ژن تەلاقدان لە بێنوێژیدا قەدەغەیە ئەوە نابێ بە بەهانەی ئەوە کە خولعکردنیش لە بێنوێژیدا قەدەغەیە، چونکە قەدەغەکردنی تەلاق لەم کاتەدا بۆ پاراستنی مافی ژنە، هەتا ماوەی عیددەکەی درێژە نەکێشێو بەهۆی ئەوەوە زیاندار نەبێ، بەلام ئەگەر ژن خۆی خولع سازبدا مەعنای وایە کە رازییە بە درێژە کێشان، لەگەڵ رەچاوکردنی ئەوەیش کە بەخشینی ماڵ لە لایەنی ژنەکەوە ئەوە دەگەیەنێ کە ژنەکە زۆر تامەزرۆی رزگاربوونە لە ریکێفی مێردەکەی، لەبەر ئەوە بەهەر بەهایەك بووە قوتاربوون مسۆگەر بکا، گەرچی بەدرێژەوە بوونی عیددەکەیشی بووە.

## ژنی خولع لەگەڵ دا کراو تەلاق نالکێ پێیەوە:

تەلاق نالکێ بە ژنێکەوە خولعی لەگەڵ دا کرابێ، چونکە بەهۆی خولعەکەوە لە ژنی کابرا دەردەچێو لێی جیا دەبێتەوە دەبێ بە بائین، دەی ژنی بائین بە بێگانە دادەنرێ لەبەر ئەوە تەلاقی پێوە نالکێ، ژنی خولع لەگەڵ کراو ئەگەر بائینە نیە بۆچی لەپاش خولع تەماشاکردنی نادروستەو نادروستیشە کە مێردەکەی دوو بەدوو لەگەڵی کۆببێتەوە.

## ٢٧٤) باسی ژن تەڵاقدان:

وشەی (طەلاق) لە زمانی عەرەبەکاندا واتە: کردنەوەی کۆتو پێوەند، عەرەب دەڵێ: (ناقة طالق) واتە: ئەو حوشترە مێیە بەرەڵایە، پێوەند نەکراوە، لە هەرلا ئارەزوو بکا بۆ خۆی دەلەوەڕێ، وشەی (تەڵاق) لە شەرعی پیرۆزدا: ناوە بۆ کردنەوەی پابەندی نیکاحو ژنو مێردی.

وشەی (طەلاق) لە سەردەمی نەزانی پێش ئیسلامیشدا هەرباو بووە، شەریعەتی ئیسلامیش پەسەندی کردووەو هێشتوویەتەوە، تەڵاق ڕەوایەو دروستە بەپێی دەقی قورئانو دەقی سوننەتو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلام. قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ - سورة الطلاق - ١/٦٥} واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! کاتێ ژن تەلاق دەدەن، لە عیددەیاندا تەڵاقیان بدەن. پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: دزێوترین حەڵاڵ لە لای خودای گەورە ژن تەڵاق دانە (ئەبو داوودو حاکم بە ڕشتەیەکی ساخ گێڕاویانەتەوە). (ڕشتەی ساخ واتە: سند صحيح - وەرگێڕ).

### بڕیاری تەڵاق:

تەڵاق لە شەرعا دروستە، بەڵام ناباشە، مەگەر لە حاڵی ناچاریدا، ئەوە قەیدی نیە، خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر ژنێ بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکا بۆنی بەهەشت ناکا. (ئەم فەرموودەیە لە ئەوبانەوە ئەم زاتانە

گێڕاویانەتەوە: ئەحمەدو ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو تیرمیذی، تیرمیذی بە جوانی داناوە). (فەرموودەی جوان: حدیث حسن – وەرگێڕ).

## بنیات ( ڕەکن )ەکانی تەلاق:

بنیاتەکانی تەلاق یەکێکیان گفت (لەفظ)ە، بەبێ گفتو قسەیێ تەلاق بە نیازی رووتی ناو دڵ دانامەزرێ، یەکێ تریان ئەوەیە کە لەکاتی تەلاقدانەکەدا خۆی گوێی لە قسەی خۆی بێ، بەڵام ئەگەر لە ژێر لێوەوە بەبێ دەنگ زمانی بە تەلاق بزواند ئەوە دوو فەرمایشت هەیە، لەسەر فەرمایشتێ تەلاقەکە دەکەوێ، چونکە شتی وا لە نووسین کە نیازی لەگەڵدا بێ بەهێزترە، دەی بەنووسینێ کە نیازی لەگەڵ دابێ تەلاق دەکەوێ، کەواتە لەم حاڵەیشدا دەکەوێ. لەسەر فەرمایشتێ تر بەمە تەلاقی ناکەوێ، چونکە ئەوە گفتو قسەنیە.

ئیمامی نەوەوی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: فەرموودەی دیاریتر فەرمایشتی دووەمە، چونکە شتی وا لە ریزی نیازی رووتی ناو دڵدایەو بەس، بنیاتێکی تریان ئەوەیە کە تەلاق بە گوتەیەکی رۆشنی بێ پێچو پەنا بێ، یا بە گوتەیەکی بە پێچو پەنابێ، کە ناسراوە بە کینایە، گوتەی رۆشن (لەفزی صەریح) ئەوەیە بۆ کەوتنی تەلاق پێویستی بەنیاز نیە، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو گوتەیە بۆ ئەو مەبەستە دانراوە کە تەلاقدانە، لەبەر ئەوە واتایەکی تر هەڵناگرێ، بەڵام گوتەی نارۆشن، کە کینایەی پێ دەگوترێ، بۆ کەوتنی تەلاق پێویستی بە نیازی ناودڵ هەیە، چونکە لە زاتی خۆیدا بۆ مەبەستی تەلاقدان دانەنراوە، لەبەر ئەوە هەڵ دەگرێ کە مەبەست لێی تەلاق نەبێ، بەڵکوو شتێ تر بێ.

گوتەی ڕۆشن سێ وشەی بۆ دانراوە، لە عەرەبیدا ئەمانەن: تەڵاق، واتە: بەرەڵابوون، فیراق، واتە، لەیەك جیابوونەوە، سەراح، واتە: دەسبەرداربوون، یا بەرەڵابوون، بەڵگەی ئەوەی کە تەڵاق گوتەی ڕۆشنە دەقی قورئانە، کە لە چەند ئایەتێکا دووبارە بۆتەوە، وە بەم واتا ناودارە ناسراوە، کە بریتییە لە کردنەوەی گرێی ژنو مێردیو حەڵاڵو هاوسەری، بەم واتایە لە سەردەمی نەزانیو لە سەردەمی ئیسلامدا چەسپاوە، وە کەس لەمەدا ڕەخنەی نیە. خودای گەورە دەفەرموێ: (الطلاق مرتان) وە هەروەها دەفەرموێ: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ - سورة البقرة - ٢٢٨/٢} وە دەفەرموێ: {وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ - سورة البقرة - ٢٢٥/٢} . بەڵگەی ئەوەیش کە (فیراق)و (سەراح)یش گوتەی ڕۆشنن (واتە: لەفظی صەریحن لە تەڵاقدا) ئەوەیە: کە ئەم دوو گۆتەیەیش لە زاراوی شەریعەتدا بەم واتایە هاتوون، لە چەند جێگەیەکیش لە قورئاندا بە واتای تەڵاق هاتوون، وەك ئەم ئایەتە: {وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا - سورة الأحزاب - ٤٩/٣٣} وەك ئەم ئایەتەی تریش: {فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ - سورة الأحزاب - ٢٨/٣٣} وەك ئەم ئایەتەی تریش: {أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ - سورة الطلاق - ١٣٠/٤}.

جارێ پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کرا: تەڵاقی سێیەم کامەیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوەکە دەفەرموێ: (أو تسريح باحسان) (دارە قوطنی گێڕاویەتەوە، ئیبنو قەتتان بە

فەرموودەیەکی ساخی داناوە) ئەوەتا لەم حەدیثەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وشەی (ترح)ی بە مەعنا (طلاق) لێك داوەتەوە.

**بزانن:**

کە وشەی (طلاق)و ئەو وشانەی کە لە (طلاق) دروست بوون لە ریزو حوکمی وشەی (طلاق)دان، لە بارەی ئەوەوە کە ئەمانیش گوتەی رۆشن‌و گفتی بێ پێچ‌و پەنان. جا ئەگەر مێرد گوتی: تۆ تەڵاق دراوی، یان گوتی: تۆ تەڵاق کەوتووی، یا گوتی: ئەی تەڵاق دراو! یا گوتی: ئەی تەڵاقکەوتوو! تەڵاقی دەکەوێ، با نیازی تەڵاقیشی نەبێ. هەروەها ئەگەر مێرد بە ژنی خۆی گوت: (أنت مفارقة: تۆ جیابووەوەی) یا گوتی: (فارقتك: من لەتۆ جیابوومەوە) یا گوتی: (أنت مسرحة: تۆ بەرەڵای) یا گوتی: (سرحتك: من تۆم بەرەڵاکرد) بەم وشانەیش بە عەرەبی یەکانیان بەبێ نیازیش تەڵاقی دەکەوێ (عەللامە عەبدولکەریم المدرس – خودا پایەدارتری بفەرموێ‌و (رەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ: تەرجەمەی کوردی (فراق) و (سراح) بە صەریح دانانرێن، چونکە وەك تەرجەمەی تەڵاق مەشهوورو بڵاونین – وەرگێڕ) بەڵام ئەگەر گوتی: أنت طالق من وثاق: تۆ لە پەت بەربووی: تۆ لە کۆت‌و زنجیر بەربووی) یا گوتی: - سرحتك الى بغداد: ئەوا تۆم بەرەڵاکرد کە بچیت بۆ بەغدا) یا گوتی: (فارقتك في المنزل: ئەوا لە جێگەدا لێت جیابوومەوە) لەم کاتانەدا تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئەم رستانە لەسەر ئەم شێوەیە دانانرێن بەبێ پێچ (صەریح) بەڵام دادەنرێن بە کینایە، لەگەڵ نیازدا ئەوسا تەڵاقیان پێ دەکەوێ.

هەرکاتێ جگە لەو سێ وشە صەریحە وشەیەکی تر بۆ مەعنای تەڵاق مەشهوور بوو، وەك ئەوە باوە لەناو خەڵکا دەڵێن: (انت علیَّ حرام: تۆ لەمن حەرامی) رافیعی دەفەرموێ: شتی وا دەلکێ بە بەشی وشەی صەریحەوە، بەبی نیازیش تەڵاقی پێ دەکەوێ، چونکە بەهۆی بەکار هێنانەوە بووە بە باوو تێگەیشتنی پی دەگرێ. بەڵام موتەوەللی دەفەرموێ: رای شەنگین ئەوەیە: کە ئەم جۆرە گوتەیە لە بەشی صەریح نیە، چونکە صەریح ئەوەیە کە لە قورئان وەرگیرابێ، یا کەوتبێتە سەر زاری هەڵگرانی شەریعەت، دەی ئەم جۆرە رستیە وانین، نە لە قورئانا شتی وا هەیە، نە لەناو زانایانی شەریعەتدا شتی وا بیسراوە. نەوەویش دەفەرموێ: هەرە سەنگین ئەو رایەیە کە ئەم جۆرە رستە تازانە کە بوون بە باو کینایەن، تەڵاقیان پێ ناکەوێ، مەگەر لەگەڵ نیازدا، ئیتر مەشهوور بوونو نا مەشهور بوونیان هیچ لە مەبەست ناگۆڕێ!.

## کینایە: بە پێچ و پەنا: گوتەی ناڕۆشن:

کینایەی تەڵاق ئەوەیە کە بە رواڵەت (واتە: بە ظاهیر) واتای تەڵاق، یا واتای شتێ تر هەڵبگرێ، بە یەکگرتنی رای زاناکان لەگەڵ هەبوونی نیازی تەڵاقدا، تەڵاقی پێ دەکەوێ. دەگێڕنەوە کە پیاوێ بە ژنەکەی خۆی دەڵێ: (حبلك علی غاربك: جڵەوت بە دەستی خۆتە) عومەریش (رەزای خوای لێبێ) بەو پیاوە دەفەرموێ: سوێندت دەدەم بە خودای ئەم رستەیە مەبەستت چی بوو لە گوتنی ئەم رستەیە؟ ئایا مەبەستت پێی تەڵاق بوو یا مەبەستت شتێ تربوو؟ پیاوەکەیش گوتی:

ئا، مەبەستت پێی تەڵاق بوو. عومەریش فەرمووی: کەواتە مەبەستتت چی بووبێ پێی ئەو مەبەستە دێتەجێ!.

عائیشە {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: کاتێ بینتول جەونیان بە بووکی گواستەوە بۆ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} وە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چوو بەلایەوە، بینتول جەون گوتی: (اعوذ بالله منك: پەنا دەگرم بە خودا لە تۆ) پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} پێی دەفەرموێ: بەراستی پەنات بردە بەر خودایەکی گەورە، بچۆرەوە بۆ سەر کەسوکارت. (بوخاری گێڕاویەتەوە)[*]. دەی ئەم فەرموودەیەی بوخاری بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم گوتەیە گوتەی بە پێچو پەنایە ئەگەر نیازی پێی تەڵاق نەبێ تەڵاقی پێ ناکەوێ، چونکە کەعبی کوڕی مالیك لە پێش گیرابوونی تەوبەکەیدا، کاتێ حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} هەواڵی بۆی نارد کە لە ژنەکەی کەنار بگرێ، هەمان وشەی بەکارهێناو بە ژنەکەی گوت: (إلحقی بأهلك: بچۆرەوە بۆ لای کەسوکارت) بەڵام لەبەر ئەوەی کە کەعب مەبەستی لەم قسەیە تەڵاق نەبوو، کاتێ تەوبەکەی گیراکرا، پێغەمبەری {دروودی خوای لەسەربێ} لەیەکی جیانەکردنەوە. هەروا دەڵێین: بۆیەیش دەڵێین: گوتەی بە پێچو پەنا پێویستی بە نیازو نیەتە، چونکە لە ئەثەرەکەدا سوێندانی تەڵاقدەرەکە لە لایەنی عومەرەوە، ئەگەر وانەبێ، مەعنای نابێ.

---

[*] بۆ گەیشتنی تەواو، لە داستانی گواستنەوەی بینتولجەون بۆ پێغەمبەر {سەلام علیه سەسنە} بڕوانە بەرگی پێنجەم لە موختەصەری صەحیحی بوخاری – بە کوردی – لاپەڕە/ ٥٩ هەتا ٦١ = فەرموودەی ژمارە/ ١٧٨٨.

– وەرگێڕ –
٢٠٠٦/٨/٢٣

**(گفتەکانی بە پێچو پەنا: الفاظ الكناية):**

گفتـەکانی بـە پـێچو پـەنا گـەلێ زۆرن، ئـەم چـەن قلـەیان بـاس دەکەین: وەکوو، وشەی (خلية)ی عەرەبی، یا (برية) یا (بتـة) یـا (بتلة) یـا (بـائن) یـا وشـەی (أنـت حـرة) یـا (اعتـدی) یـا (اسـتبرئی رحمـك) یـا (الحقـی بأهلـك) یـا (أخرجـی) یـا (اذهبـی) یـا (سـافری) یـا (تقنعـی) یـا (تستری) یا (بینی) یا (ابعدی) یاخود وێنەی ئەم وشانە، هەرکاتێ مێـرد لەگەڵ ژنی خۆیدا یەکێ لەم وشانە بەمەبەستی تەڵاقدانی بـەکار بهێنـێ تەڵاقی دەکەوێ، بـەڵام بـەکار هێنانیـان بـەبێ نیـازی تـەڵاق، تـەڵاقی پـێ ناکەوێ.

ئەمـەیش بـەریز تەرجەمـەو وەرگـەڕاوی ئـەم وشـانەیە: ‎٠‎أنـت خلیە: تۆ بەتاڵی، واتە: بێمێردی). (أنت بريـة: تـۆفرت بەسـەر مێـردەوە نیە). (أنت بتە: تۆ جیاوەبووی) واتە: پەیوەندی نێوانمان پـچڕاوە (أنـت بتلە: تۆ بیوەژن کەوتووی. یا بووی بـە بێـوەژن) (أنـت بـائن: تـۆ لـە مـن جیـاوە بوویتـەوە). (أنـت حـرة: تـۆ سـەر بەسـتیت) واتـە: لـەژێر رکێفـی مێرددا نەماوی (اعتدی: بکەوەرە عیددەی بێ مێردییەوە) واتە: چـونکە من تۆم تەڵاق داوە، ژنیش کـە تـەڵاق درا دەکەوێتـە عیـددەوە. (اسـتبرئی رحمـك: منداڵدانت پاك بکـەرەوە لـە ئـاوی مێردەکـەت). (الحقـی بأهلـك: بـڕۆرەوە بـۆ مـاڵی باوانـت) واتـە: چـونکە مـن تـەڵاقم داوی. هـەروا ئـەم وشانەی تـریش: (اخرجـی: لـەم ماڵـە دەرچۆ). (اذهبـی: بـڕۆ). (سـافری: بڕۆ بۆ سەفەر. (تقنعی: پەچەبگرەوە). (تستری: خۆت داپۆشە). (بینـی: جیاوەبە) (ابعدی: دوورەوەکەوە).

هەروا ئەم رستانەی تریش: (حەقم نیە بە سەرتەوە) یا حەقت نیە بەسەرمەوە) یا (ونبە لەبەر چاوم) یا (من کەڵکی تۆم پێوە نیە) یا تۆبە کەڵکی من نایەیت) یا (مەسرەفت لەسەر من نیە) یا (هاوڕێتیی تۆ بۆ من حەرامە) یا (تۆ بۆ هاوسەری من دەست نادەی) یا (بڕۆ بەرەڵڵابە) (تکایە تەماشای بەرگی سێیەمی شەریعەتی ئیسلام لاپەڕە (٣٣٤) بکە. هەروا بە سەرنجەوە تەماشای پەراوێزی لاپەڕە (١٥٣) لە بەرگی سێیەمی تاج الاصول بە کوردی بکە). **لە راستیدا جیهان گۆڕاوە، کەسانێ لە ناوماندا پەیدابوون، لە کوردستاندا بوون بە بلوێرو بڵندگۆی کفری جیهانی، بەناو رۆشنبیرن، وەکی تر کرێ گرتەی سەلیبییەت و سەهیوونییەتن، رادیۆو تەلەفیزیۆن و گۆڤار رۆژنامەیان بۆ ئامادەکراوە، کاری سەرەکی یان جنێودانە بە ئیسلام و موسوڵمانان، بە ناوی ئازادی و مافی کرێکارو مافی ئافرەتەوە دەسدرێژی لە هەموو مافێکی مرۆڤی ئابروو مەند دەکەن، بە ئاشکرا جنێو بە خوا، گاڵتە بە قورئان، هێرش لەسەر ئیسلام، جنێو بە مەلاو مزگەوت و شێخ و مشایەخ دەدەن، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەم لایەنە ئیلحادییانە لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکاندا زۆر بەینیان خۆشە، سوێند بە سەری یەکتری دەخۆن! بگرە گەلێ جار هاوپەیمانن!! خودایە! فریای گەلی کورد کەوە، لەم پاشا گەردانی و بەرەڵڵاییە رزگاری بکە (بڕوانە: بەرگی پێنجەمی تەجریدی بوخاری بە کوردی لاپەڕە/ ٣٦٢ هەتا ٣٦٦ - ژمارە/ ٢١٠٣ و راڤەکەی).**

جا لەبەر ئەوە پێویستە ژن مارەبڕینو ژن تەڵاق دان بە باشی رێك بخریۆ یاسایەکی رێكو پێکی بەپێی دەقەکانی قورئانو سوننەت بۆ دابمەزرێ – وەرگێڕ.

## ٢٧٥) تەڵاقی بیدعیو تەڵاقی سوننی:

لە کۆنو نوێدا زاناکان ئەم دوو زاراوە بۆ تەڵاق بەکار دەهێنن: تەڵاقی سوننیو تەڵاقی بیدعی، تەڵاقی سوننی واتە: تەڵاقی دروست، تەڵاقی بیدعی واتە: تەڵاقی نادروست، مەبەست لە نا دروست ئەوەیە کە تەڵاقدان لەوکاتەدا حەرامەو ناڕەوایە، دەنا تەڵاقەکە دادەمەزرێو دەکەوێ.

لە زاراوی شەرعدا تەڵاقی سوننی ئەوەیە: مێرد ژنی بە دەسگیراوی خۆی لە پاکیدا تەڵاق بدا، بە مەرجێ ژنەکە دووگیان نەبێ، یا منداڵ (صغیرە) نەبێ، یا بێنوێژیی نائومێد (ئایسە) نەبێ.

تەڵاقی بیدعیش ئەوەیە: کە مێرد ژنی بە دەسگیراوی خۆی لە یەکێ لەم کاتانەدا تەڵاق بدا: لەکاتی بێنوێژیدا، یا لە زەیستانیدا، یا لە پاکییەکدا کە چووبێتە لای لەو پاکییەدا، بەڵام هێشتا دەرنەکەوتبێ کەسکی هەیە یانا. تەڵاق جۆرێکی تریشی هەیە کە ئەوەیە: نەسوونی بێو نە بیدعی بێ، وەك تەڵاقی مارەبڕاوی بەدەست نەگیراوو تەڵاقی ژنی سکپڕو لە ژنی بێنوێژیی نائومێدو ژنی منداڵی رەسیدە نەبوو. ئەم جۆرانەی تەڵاق لەم حەدیثە وەرگیراوە: ئیبنو عومەر {رەزای خوا لە خۆی و بابی} دەفەرموێ: بەسەرینیی حەزرەت خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} ژنێکم بێنوێژ

بوو تەڵاقم دا، عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} بۆ ئەمە لە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەپرسێ، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: پێی بڵێ با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی، ئەوجا لەلای خۆی بیهێڵێتەوە هەتا لە بێنوێژی پاك دەبێتەوەو جارێکی تر دەکەوێتەوە بێنوێژیو دیسان پاك دەبێتەوە ئیتر لەوە دوا ئەگەر ئارەزوو دەکا رای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزووش دەکا بەرلەوەی کە بچێتەلای تەڵاقی بدات، ئەمە ئەو عیددەیەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا فەرمانی کردووە کە ژنی تیادا تەڵاق بدرێ، کە دەفەرموێ: (فطلقوهن لعدتهن). (شەیخان گێڕاویانەتەوە) لەسەر ئەم تەفسیرە ئەم لامی حەرفی جەڕە کەوا لەم ئایەتەدا بە واتا (فی)یە، شتی وایش لە عەرەبیدا نموونەی زۆرە، وەك {وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ – سورة الأنبياء – ٤٧/٢١} هەندێ دەفەرموون: لامی لعدتهن بۆ تەوقیتە، ئەوکاتە تەفسیرەکەی ئاوایە: لەوکاتەدا کە لە دوایەوە یەکسەر ژن دەکەوێتە عیددەوە. ئەم فەرموودەیە رای ئەوان پووچ دەکاتەوە کە دەڵێن: تەڵاقی بیدعی ناکەوێ. چونکە ئەگەر وابووایە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بە عومەری نەدەفەرموو: بەعەبدوڵلای کوڕت بڵێ: با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی. چونکە واتای ئەم فەرمایشتە وایە کە تەڵاقە بیدعی یەکەی ئیبنو عومەر کەوتووەو ژنەکەی لەژێر نیکاحی ئەودا نەماوە هەتا نەیگێڕێتەوە ژێر رکیفی خۆی نابێتەوە بە ژنی.

تەڵاقی بیدعیش کە ئەوەیە: لە بێنوێژیدا بە ئارەزوو تەڵاقی بدا عیددەی ژنەکەیش بە (اقراء) بێ، واتە: بە بێنوێژیو پاکی بێ، بەو

مەرجە ژنەكە خۆی قوبووڵی خولعی نەكرد بێ لە پیاوەكە، یا ئەوەیە: لە پاكیدا تەڵاقی بدا، بەو مەرجە كە لەو پاكییەدا چووبێتە لای، یا لە حەیزی پاش ئەو پاكییەدا چووبێتە لای، وەژنەكەیش لە سكوزا نەكەوتبێ‌و سكیشی دەرنەكەوتبێ. پەندو حیكمەتی ئەمەیش ئەوەیە: كە تەڵاق لە بێنوێژیدا دەبێ بەهۆی درێژبوونەوەی عیددەی ژنەكە، چونكە ماوەی ئەو بێنوێژییە بەعیددە دانانرێ، دەی شتی وایش زیاندانە لە ژن بە ناهەق، تەڵاقی كاتی پاكیش كە لەو پاكییەدا چووبێتە لای بۆیە دادەنرێ بە بیدعی چونكە هەڵ دەگرێ كە ببێ بەمایەی پەشیمانی، لەپاش دەركەوتنی سك، چونكە هەبوونی مناڵ لە نێوانی ژن‌و مێردا زۆربەی كات رێ لە تەلاق دەگرێ.

## ٢٧٦) ژمارەی تەڵاقی پیاوی ئازادو پیاوی بەندە (كۆیلە):

پیاوی ئازاد لەسەر ژنی خۆی، ژنەكەی ئازاد بێ، یان كەنیزەك بێ، خاوەنی سێ تەڵاقە. بەپێی ئەم فەرموودەیەی كە ئیمامی ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەیگێڕێتەوە: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) عەرزی كرد: قوربان! من گوێم لە قورئانە كە فەرمایشتی خودایە دەفەرموێ: {الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ - سورة البقرة - ٢/٢٢٩} واتە: ژن تەڵاق دان دوو جارە. دەی كەوایە تەڵاقی سێیەم كامەیە؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ) (تەڵاقی سێیەم ئەوەیە كە لەدوا ئەمەوە دەفەرموێ: {امساك بمعروف او تسريح باحسان} (ئیبنو قطان: بە فەرمودەیەكی ساخی داناوەو كردووشیەتی بە بەڵگەی ئەم باسە،

عائیشەو ئیبنو عەبباسیش {رەزای خوایان لێبێ} بە هەمان مەعنا تەفسیری ئەم ئایەتە دەکەن، کەواتە ئایەتەکە بە تەواوی ئەمە واتاکەیەتی): (الطلاق مرتان فامساك بمعروف أو تسرح باحسان: ژن تەڵاق دان دووجارە، ئیتر لەپاش ئەو دوو جارە مێرد دەبێ یا بەجوانی ئەو ژنە رابگرێ، یا ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەڵاقی دایەوە ئیتر فڕی بەسەریەوە نامێنێو مافی ئەوەی نامێنێ کە لە ماوەی عیددەدا بیهێنێتەوە). بۆ ژێر رکیفی ژنێتیی خۆی هەندێ زانا دەفەرموون: تەڵاقی سێیەم ئەوەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە، کە دەفەرموێ: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ - سورة البقرة - ٢/٢٣٠} واتە: ئەگەر لەپاش ئەو دوو تەڵاقەی کە لە ئایەتی (الطلاق مرتان)دا باس کرا، مێردەکە بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەڵاق دا، خوا بە خۆڕایی بێ یا لەسەر ماڵ بێ، ئەوە ئیتر ئەو ژنە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ ئەو پیاوە هەتا شوو دەکا بە مێردێکی ترو لەویش تەڵاقی دەکەوێ).

پیاوی بەندەیش خاوەنی دوو تەڵاقە. بەپێی فەرمایشتەکەی {درودی خوای لەسەربێ} بەندەی زەڕخریدە دوو تەڵاقی هەیە. ئیمامی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەگێڕێتەوە: کۆیلەیەکی کاغەز پێدراو، کە هی ئوممو سەلەمە بوو، ژنێکی ئازادی هەبوو، دوو جار تەڵاقیدابوو، ویستی بیگێڕێتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی، بۆ ئەمە لە عوسمانی پرسی، زەیدی کوڕی ثابیتیش لەوێ بوو بە جووت بە توورەیی پێیان فەرموو: ئەو ژنە لە تۆ حەرام بووە، لەمەدا جیاوازی لە نێوانی کۆیلەی کوڕی کۆیلەو کۆیلەی باوك ئازادو کۆیلەی پاشەمەرگە (واتە: مودەببەر)و کۆیلەی کاغەز پێدراوو کۆیلەی بەش بەش (واتە: موبعەض)دا نیە.

هەرکاتێکیش مێرد (ئازاد بێ یا کۆیلە) ژمارەی تەڵاقی خۆی تەواوکرد، ئیتر ئەو ژنەی لێ حەرام دەبێو هەتا مێردێکی تر نەکا حەڵاڵ نابێتەوە بۆی، بە مەرجی ئەوەیش مێردی تازە بە دەستی بگرێو لێی جیا بێتەوەو عیددەی بەسەر بچێ، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ}.

## ٢٧٧) باسی چەرتکردن (استثناء) لە تەڵاقا:

چەرتکردن ئەوەیە بڕیارێ بۆ کۆمەڵێ بدەی بەڵام هەندێ لە گرتنەوەی ئەو بڕیارە دەربکەی. چەرتکردن یا جیاکردنەوە لە شەرعا دروستەو یاسایەکی ناسراوە، لە دەقی ئایەتی قورئانو فەرموودەدا هەیە. چەرتکردن دوو جۆرە.

**یەکەمیان**: ژمارە هەڵ دەگرێ وەکوو ئەوە مێرد بڵێ: سێ بەسێ تەڵاقت بکەوێ، یەك تەڵاق یا دوو تەڵاق نەبێ، دووەمیان ئەوەیە کە ئەصڵی تەڵاقەکە ببەستێ بە حەزو مەیلی خوداوە، یا بە حەزو ئارەزووی کەسێکەوە.

**لە جۆری یەکەما ئەمانە مەرجن:**

**یەکەم**: لکابێ بەرستەکەوە لەکاتی قسەکردنەکەدا بە جۆرێ کە لە عورفدا بە یەك قسە بژمێرێن.

**دووەم**: ئەوەیە چەرتکردن هەموو چەرتلێکراوەکە نەگرێتەوە، واتە: ئەوەندەی ژمارەی ئەو نەبێ، کەواتە ئەگەر گوتی: سێ تەلاقت کەوتبێ سێ تەلاق نەبێ، ئەوە سوودی نیەو هەر سێ تەلاقەکەی دەکەوێ.

**سێهەم**: ئەوەیە: کابرا نیازی ئەو لێ چەرتکردنەی ببێ، بۆ نموونە لە پێش تەواوکردنی رستەی تەلاقەکەدا ئەو نیازەی هەبێ، یا لە سەرەتاشیەوە نەیبووبێ. وەك ئەوە بە ژنەکەی خۆی بڵێ: سێ بەسێ تەلاقت کەوتبێ، یەك تەلاق یا دوو تەلاق نەبێ، وە بە پەیوەستی رستەکە بڵێ، نیازی لە گەلابێ، ئەوە ژمارە چەرتکراوەکە ناکەوێ.

بەستنی تەلاق بە حەزی خواوە، وەك ئەوە بڵێ: تەلاقت کەوتبێ ئەگەر خوا حەزکا.. ئەوە تەماشادەکەین: ئەگەر رستەی خوا حەزکا) بەبێ مەبەست هات بەسەر زماندی دا، وەك باوە قسەکەر لەم کاتانەدا بەبێ نیاز، ئەم رستەیە دێ بە دەمیدا، یا مەبەستی پیرۆزیو پیتو فەڕ وەرگرتن بوو لە یادو ذیکری خوای گەورە، یا مەبەستی لە گوتنی ئەم رستەیە ئەوە بوو کە لە حەقیقەتدا هەموو کارێ بە خواستی خوا خۆیەتی، یا بەهیچ جۆرێ مەبەستی ئەوە نەبوو کە کەوتنی تەلاقەکە ببەستێ بەمەیلو خواستی راستەقینەی خوداوە، ئەوە لەم کاتانەدا گوتنی وشەی (ان شاء الله: ئەگەر خوا خواستی لەسەربێ) کاریگەری نیەو بێ سوودەو تەلاقەکە دەکەوێ. بەلام ئەگەر مەبەستی لە گوتنی ئەوەبوو کە کەوتنی تەلاقەکە ببەستێ بە خواستی راستەقینەی خواوە، ئەوە تەلاقی ناکەوێ، چونکە بوونو نەبوونی مەیلو خواستو حەزی

خودا لای ئێمه دیار نیه، وه مادام (معلق علیه) نەزانراوبێ (معلق) نایەتەجێ. بۆیه دەڵێین: بنەڕەت (ئەسڵە) مانەوەی ژن‌و مێردییه، هەروا ئەگەر تەڵاق ببەستێ بە خواستی زەیدەوە، وه پێش ئەوەی بوون‌و نەبوونی خواستی زەید بزانێ، زەید بمرێ، ئەو تەڵاقە ناکەوێ، چونکه تەڵاقەکه بەستراوە بە بوون یا بە نەبوونی خواستی زەیدەوە ئەوەیش نەزانراوە لە حەدیثدا هەیە دەفەرموێ: هەر کەسێ کەسێ لە کۆیلەیی ئازاد بکا، یا ژن تەڵاق بدا، وه هەندێکی لێ چەرت بکا، چەرتکردنەکەی دادەمەزرێ.

لەکاتی لێ جیاکردنەوەو لێ چەرتکرندا جیاوازی نیه لە نێوانی ئەم جۆرە گوتنانەدا، وەك ئەوە بڵێ: (أنت لق ان شاء لله: تەڵاقت کەوتبێ ئەگەر خوا حەزکا) یا (ان شاء الله فأنت طالق: ئەگەر خوا حەزکا تەڵاقت کەوتبێ) یا (متی شاء الله: هەرکاتێ خوا مەیل بکا) یا (اذا شاء الله: کاتێ خوا خواستی لەسەربێ).

## ٢٧٨) باسی تەعلیقی تەڵاق:

تەعلیق برێتییه لە بەستنی واتای رستەیەك بەواتای رستەیەکی ترەوە بە جۆرێ کە هەتا (معلق علیه) نەیەتەجێ (معلق) نەیەتەجێ. کەواتە تەعلیق واتە: پێوە هەڵ سپاردن، یا پێوە بەستن، یا بەستنەوە بەشتێکەوە. لەپاش ئەمە بزانن: تەڵاق وەك بە تەنجیز دادەمەزرێ، بە تەعلیقیش دادەمەزرێ تەنجیز واتە: دەسبەجێ، یا جێبەجێ. بەڵگەی ئەمەیش ئەم فەرمایشتەیەتی {دروودی خوای لەسەربێ}: موسوڵمانان پابەندی

مەرجی ڕەوای خۆیانن! هەروا قیاسیش بەڵگەی دامەزراندنی تەعلیقی تەڵاقە، چونکە دەق هەیە لەسەر ئەوە کە ئازادکردنی کۆیلە ئەگەر ببەسترێ‌و تەعلیق بکرێ بە دوای مردنیشەوە دادەمەزرێ، دەی تەڵاق‌و بەندە ئازادکردن لە زۆر بڕیاردا لە یەکترەوە نزیکن. مەبەست لە بەستنەوەی تەڵاق بەشتێکەوە، ئەوەیە کە ژن گەلێ جار لە هەندێ مەبەستا لە دژی مێرد دەوەستێ، مێردەکە پێی ناخۆشە کە بە ئارەزووی خۆی ژنەکەی تەڵاق بدا، چونکە تەڵاق لە زاتی خۆیدا دزێوترین حەڵاڵە لەلای خودا، لەبەر ئەوە دەیەوێ کە ژنەکە خۆی بکا بە سەرپشك، لە نێوانی ئەوەدا کە یا واز لە بێ دڵی مێردەکەی بهێنێ، یا بێگوێیی‌و لاساری خۆی ببێ بەهۆی تەڵاق کەوتنی، جا لەم هەل‌و مەرجەدا تەڵاقەکەی دەبەستێ بە شتێکەوەو ژنەکەی تێ دەگەینێ کە خۆت سەرپشکیت لە تەڵاقدانی خۆت بەکردنی ئەوشتە یا بە نەکردنی.

دەی کاتێ ئەمەمان زانی بابزانین کە لەپاش تەعلیق پەشیمان بوونەوە مەحاڵە، وە هەرکاتێ تەعلیقی تەڵاق کرا بەشتێکەوە هەتا ئەوشتە نەیەتەجێ تەڵاقەکە ناکەوێ، خوای پەیدا بوونی ئەو شتە دیاری بێ، وەك: کاتێ خۆر هەڵهات تەڵاقت کەوتبێ. یاخود بوون‌و نەبوونی وەك یەك بێ، وەك: ئەگەر بچیتە ناو ئەو خانووەوە تەڵاقت کەوتبێ. ئەم قسەیەیش بەهەمان واتایە: (عليَّ الطلاق لا أفعل كذا أو أفعله: تەڵاقم بکەوێتە سەر ئەو کارە ناکەم) یا (تەڵاقم بکەوێتە سەر ئەو کارە دەکەم). جا هەر کاتێ مەرجەکە جێبەجێ بوو بە مەرجگیراوەکەیش دەێتەجێ، کە تەڵاقەکەیە، لەپێش ئەوەدا کە

مەرجەکە بێتەجێ چوونەلای ژنی تالووق کراو دروستە، چونکە هێشتا تەڵاقەکە نەکەوتووە.

ئەوەنده هەیە ئەگەر تالووقکەر گومانی بۆ پەیدا بوو کە مەرجەکە هاتۆتەدی یانا، یا شتەکە جێبەجێ بووە یانا، ئەوە تەڵاقەکە ناکەوێ، چونکە بنەڕەت (ئەصڵ) نەبوونی ئەوەیە.

## بفەرموون ئەمە چەند نموونەیەکە بۆ تەعلیقی تەڵاق هەتا بکرێن بەسەرمەشق بۆ ئەم بابەتە:

١) مێردێ بە ژنەکەی بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ ئەگەر ئارەزوودەکەی، لەم نموونەیەدا دەسبەجێیی لە کۆڕی گوفتوگۆکەدا پێویستە، لەبەر ئەوە مەرجە ژنەکە دەس بەجێ بڵێ: (ئارەزووم هەیە) دەنا ئەگەر درەنگ ئارەزووی دەربڕێو بەینی کەوت تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئەم جۆرە تالووق کردنە مەبەست لێی داوای بەیانی ئارەزووە لە ئێستادا کەواتە پێویستە وەڵامەکەی دەس بەجێبێ.

لەبەر ئەوە ئەم جۆرە پرسو وەڵامە وەك ئیجابو قوبوڵی عوقود مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، کەواتە دواخستن هەڵناگرێ!.

**یا دەڵێین:** چونکە ئەم جۆرە تالووق کردنە پێسپاردنە، واتە: تەڵاق دانە دەستی ژنە (تفوریض) کە برێتییە لە کردنی تەڵاق بە ماڵی ژن، دەی کەواتە مەرجە ژنەکە دەسبەجێ ئارەزووی خۆی دەربڕێ، هەر وەك مەرجەکە لە پێسپاردن (تعویض)ی تەڵاقا ژنەکە گورج خۆی تەڵاق بدا، دەنا تەڵاقی ناکەوێ! بەڵام ئەگەر پێی گوت: هەرکاتێ خۆت

ئارەزووت هەبوو تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە هەرکاتێ ژنەکە ئارەزوو بکا تەڵاقی دەکەوێ، با کوڕی کوفتو گۆکەیش بەجێ بهێڵێ، چونکە ئەم جۆرە تەعلیقە بەستنەوەیە بە شتێکی واوە دەسبەجێیی ناخوازێ وەك پێی بڵێ: لەهەر کاتێکا خۆت ئارەزوو دەکەی لە تەڵاق تەڵاقت کەوتبێ.

٢) مێردێ بە ژنەکەی بڵێ: ئەگەر بچیت بۆ ئەو ماڵە یا قسە لەگەڵ نەریمان بکەی تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە بە کردنی هەریەکێ لەم دووشتە تەڵاقی دەکەوێ. بەوە کە بچێتە ناو ماڵەکەوە یا قسە لەگەڵ نەریمان بکا، بەڵام بە کردنی هەرکام لەم دوو شتە لە پێشدا تەڵاقێکی دەکەوێ‌و سوێنەکەی تەواو دەبێ‌و بایەخی نامێنێ، بۆیە ئەگەر لەوەدوا دو هەمیشیان بکا بەوە تەڵاقی تری ناکەوێ. وەلێ ئەگەر بڵێ: ئەگەر بچێت بۆ ئەو ماڵەو قسە لەگەڵ نەریمان بکەی تەڵاقت کەوتبێ، ئەوە گەرەکە هەر دووشتەکە بکا ئەوسا تەڵاقی دەکەوێ. چونکە واوی عەطف لەم جۆرە جێگەیەدا بۆ کۆکردنەوەی مەعطووف‌و عەلەیەو مەعطووفە لەیەك بڕیاردا.

٣) پێی بڵێ: ئەگەر ئەو مشتە مێوژە بخۆی تەڵاقت کەوتبێ ژنەکەیش مێوژەکە بخوات یەك دەنکی نەبێ، تەڵاقی ناکەوێ، چونکە تەڵاق پێوە بەسراوەکە نەهاتۆتەدی، کە بریتییە لە خواردنی گشت مێوژەکە. بەم پێودانەرەفتار لەگەڵ هاو وێنەکانی ئەم نموونەیە دەکرێ، وەك ئەوە بڵێ: ئەگەر ئەم هەنارە بخۆی.. ژنەکەیش هەنارەکە بخوا یەك دەنکی نەبێ تەڵاقەکە ناکەوێ.

٤) ئەگەر بەردێ کەوتە ماڵەکەوەو مێرد گوتی بە ژنەکەی: ئەگەر پێم نەڵێی کێ ئەم بەردەی تێگرت تەڵاقت کەوتبێ. ژنەکەیش گوتی: دروستکراوێکی خوا تێیگرت، تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر ژنەکە گوتی: مرۆڤێ فڕەیداوە تەڵاقی دەکەوێ، چونکە هەڵ دەگرێ با هەڵی دابێ! یا مەیموونێ، یا شتێ وا، لەم بارەدا هۆی سوێند کەوتنەکە هەیە، ئەوەی کە ناهێڵێ تەڵاقەکە بکەوێ گومانی تیا پەیدا بووە، چونکە وەك گوتمان هەڵ دەگرێ فڕێدەر مرۆڤ بێ یا هەوابێ، بنەڕەتیش نەبوونی نەهێڵە (نەهێڵ واتە: مانیع – وەرگێڕ).

٥) پێی گوت: (ئەگەر فیسار ببینی تەڵاقت کەوتبێ) بە زیندوویی یا بە مردوویی یا بە خەوتوویی چاوی پێی بکەوێ تەڵاقی دەکەوێ، بۆ ئەمەیش ئەوەندە بەسە کە چاوی بە هەندێ لە لەشی بکەوێ.

٦) پێی بڵێ: (ئەگەر شتێ لەمن بدزی تەڵاقت کەوتبێ) ئەگەر کیسەیەکی بداتێ، هەنێ شتی لێ دەربێنێو ببیا بۆ خۆی تەڵاقی ناکەوێ، چونکە ئەوە گزییە نەك دزی. لە قیلیێکا دەفەرموێ: ئەگەر تەڵاقخۆرەکە نەخوێندەواربێ تەڵاقەکە دەکەوێ، چونکە نەخوێندەوار جیاوازی ناکا لە نێوانی گزیو دزیدا!.

٧) پێی بڵێ: (ئەگەر قسەت لەگەڵ بکەم تەڵاقت کەرتبێ) لە پاشا هەمان قسە دووبارە بکاتەوە، یا پێی بڵێ: ئەوە باش بزانە، لەم دوو شێوەیەدا تەڵاقی دەکەوێ، چونکە لە هەردوو شێوەکەدا (معلق علیە) هاتۆتەجێو قسەی لەگەڵدا کردووە. ئەگەر پێی بڵێ: ئەگەر من لەپێشدا

قسەم لەگەڵ کردی، یا سڵاوم لێ کردی تەڵاقت کەوتبێ، وە ژنەکە لە پێشدا قسەی لەگەڵ ئەو کرد، یا سڵاوی لێکرد تەڵاقی ناکەوێ، سوێندەکەیش بە قسەکردنی ژنەکە لە پێشدا یا بە سڵاوکردنی دەکرێتەوەو بایەخی نامێنێ.

٨) پیاوێ بە پیاوێ بڵێ: ئەگەر قاوەڵتی لەلای من نەکەی تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ. لەوەدوا هەرکاتێ قاوەڵتی لە لابکا تەڵاقی ناکەوێ، سوێندەکەیش بەوەندە دەکرێتەوەو کاریگەری نامێنێ. بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوەبوو کە نانی ئەو نیوەڕۆیەی لەگەڵ بخوات وە نەیخوارد تەڵاقی دەکەوێ.

٩) بە ژنەکەی بڵێ: ئەگەر ئەم مریشکانە نەفرۆشی تەڵاقت کەوتبێ. مریشکێکیان مرد تەڵاقی دەکەوێ، چونکە تازە ناتوانێ هەموو مریشکەکان بفرۆشێ، بەڵام ئەگەر مریشکێکیان سەر ببڕێو سەر براوەکە لەگەڵ زیندووەکانا بفرۆشێ تەڵاقی ناکەوێ.

١٠) پێی بڵێ: (ئەگەر سبەینێ بە رۆژوو نەبی تەڵاقت بکەوێ) وارێکەوت بۆ سبەینێ کەوتە بێنوێژییەوە راجیایی هەیە لە کەوتنی ئەم تەڵاقەدا، هەندێ دەڵێن: دەکەوێ، هەندێ دەڵێن وەك تەڵاقی زۆر لێکراووایە ناکەوێ.

١١) پێی بڵێ: (ئەگەر تووڕەم کردی تەڵاقت کەوتبێ) جا لە کوڕەکەی بدا تەڵاقی دەکەوێ، باڵێدانەکەیش بۆ تەمێکردن بێ، چونکە لێدانەکە سەردەکێشێ بۆ تووڕەبوونی ژنەکە.

١٢) پێی بڵێ: (ئەگەر ڕۆژێ لە ماڵی منا برسیت بوو تەڵاقت کەوتبێ) بە بەرسێتیی کاتی بە ڕۆژووبوون تەڵاقی ناکەوێ.

١٣) ئەگەر پێی بڵێ: (ئەگەر تۆ لە مانگ جوانتر نەبی) یا ڕووت لە مانگ جوانتر نەبێ تەڵاقت کەوتبێ) بەوە تەڵاقی ناکەوێ، بەپێی ئەم ئایەتە: {لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ– سورة التين –/٤)} بەپێی ئەم ئایەتە مرۆڤ لە جوانترین شێوەدا دروستکراوە.

١٤) ئەگەر پێی بڵێ: (ئەگەر کەوتیتە بینوێژی خۆتو هەوێکەت تەڵاقتان کەوتبێ) ژنەکەیش بە درۆ بڵێ: بێنوێژم، تەڵاقی خۆی دەکەوێ بەڵام تەڵاقی هەوێکەی ناکەوێ، لەسەر فەرمایشتی دروست، چونکە گومان لێکراوە.

## ٢٧٩) تەڵاقدان لە پێش مارەکردندا:

مەرجی کەوتنی تەڵاق ئەوەیە تەڵاقدەر مێردی حازری تەڵاقدراوبێ، کەواتە تەڵاقی کەسێ کە مێردی ژنێ نەبێ دانامەزرێ، ئیتر تەڵاقدانەکە بەتەنجیزبێ وەك ئەوە پیاوێ بە ژنێکی بیانی بڵێ: (تەڵاقت کەوتبێ) یا بەشێوەی تەعلیق بێ وەك ئەوە بە ژنێکی بیانی بڵێ: هەرکاتێ من تۆم مارەکرد تەڵاقت کەوتبێ. بەڵگەی ئەمەیش ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ): (تەڵاقی کەسێ دەکەوێ کە خاوەنی ژنەکە بێ). (چەند کەسێ گێڕاویانەتەوە) حاکم دەفەرموێ: ڕشتەکەی ساخە، تیرمیذیش دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانەو

جوانترین فەرموودەیشە کە بەم بوونەیەوە گێڕراوەتەوە، لە ئیمامی بوخاریشم پرسی: کە دروستترین شت سەبارەت بە تەڵاقدانی پێش مارەکردن چییە! فەرمووی: ئەو فەرموودەیەیە کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرییەوە دەیگێڕێتەوە. واتە: ئەم فەرموودەیەی کە ئێستا رابورد کە دەفەرموێ: تەڵاقی کەسێ دەکەوێ کە لەکاتی تەڵاقداندا ژنە تەڵاق دراوە کە لەژێر رکیفی ئەودا بێ.

## ۲۸۰) ئەم چوار کەسە تەڵاقیان ناکەوێ:

تەڵاقی منداڵو شێتو خەوتوو وە زۆرلێکراو ناکەوێ، ئەمەیش بەپێی ئەم فەرموودانە:

١) ئەم سێ کەسە قەڵەمی تەکلیفیان لەسەر نیە: خەوتوو هەتا خەبەری دەبێتەوە، منداڵ هەتا رەسیدە دەبێ، شێت هەتا هۆشیار دەبێتەوە. (ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی دەفەرموێ: جوانە).

٢) حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەژن تەڵاقدان بە زۆر سەر دەگرێو نە بەندە ئازادکردن. (ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو حاکم گێڕاویانەتەوە، حاکم دەفەرموێ: بەپێی مەرجی ئیمامی موسلیمە).

٣) دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەم سێ شتە حسێب ناکرێن لەسەر گەلی ئیسلام: کاری هەڵە، لەبیرچوون، هەرچیش بە زۆر پێیان بکرێ. (ئیبنو ماجە گێڕاویەتەوە، ئیبنو حیببانو حاکم بە

فەرموودەیـەکی سـاخ – حەدیـسێکی صـەحیح – یـان دانـاوە، حـاکم دەفەرموێ: بەپێی مەرجی هەردوو پیرە).

**بزانن:**

کە مەرجی زۆر لێکردن ئەوەیە کە زۆرکەر توانای ئـەوەی هـەبێ کە هەڕەشەکەی خۆی بێنێتەدی. تواناکەیشی بە یەکێ لەم شێوانەیە: یـا دەسـەڵاتدارە بـەپێی شـەرع، وەك کەسـێ تـەڵاق بخـوات قـەرزی فیـسار نادەمەوە، فەرمانداری شەرع بە زۆر قەرزەکەی پێ بداتـەوە، یا تـەڵاقی خوارد کە دەبێ ژنەکەی نوێژ ی نیوەڕۆ بکا، بەڵام ژنەکـەی لـە سـەرەتای نیـوەڕۆوە کەوتـە بێنوێژییـەوە، لـەم دوو بـارەدا تـەڵاقی ناکـەوێ. یـاخود بـەهۆی زۆری زۆردارەوە توانـای هـەبێ، یـاخود زۆرکـەر بـەهۆی شـاڵاوی خۆیەوە بتوانێ زۆرەکەی جێبەجێ بکا. مەرجی زۆرلێکـراو ئەوەیـە: بـێ دەستەڵاتو ناتەوانابێ، نەتوانێ رابکا، یا بەرگری لە خـۆی بکـا، یـاخودی رزگار بکا، یا هانا بـۆ کەسێکی تـر بـەرێ کـە پـەنای بـدا، لـە هەمانکاتـدا بـاوەڕی وابـێ ئەگـەر تـەڵاقی ژنەکـەی نەدازۆردارەکـە هەڕەشـەکەی جێبەجێ دەکاو ئـەو ئیشەی بەسـەرا دێنـێ، وە دەبـێ زۆرلێکـراو بـەهیچ جـۆر ئـارەزووی لـە تەڵاقـدانی ژنەکـەی نـەبێو هـیچ بەڵگەیـەك نـەبێ لەسـەر شـتی وا، ئەگـەر نیشانەی شـتی وا هـەبوو کـە کـابرای تەڵاقـدەر خۆشی شتێکی بە دەست بووەو بۆرە ئارەزوویـەکی بـووە، وەك ئـەوە کـە زۆری لێ بکەن بەسێ تەڵاقە تەڵاقی بدا کەچی ئەو بەیەك تەڵاق تەڵاقی بدا، یا زۆری لێ بکەن بەگفت (لەفـظ)ی بـێ پـێچ (صـەریح) تـەڵاقی بـدا ئەو بە مەعنا (واتە: بەکینایـە) تـەڵاقی بـدا، ئـەوە لـەم کاتانـەدا تـەڵاقی

دەکەوێ. ئەگەر دزوجەردە گرتیانو گوتیان: بەرت نادەین هەتا تەڵاقمان بۆ دەخۆی کە باسی ئەم کەینو بەینە ناکەی، ئەویش تەڵاقی خوارد، ئەگەر خەبەریان لێ بداو باسەکە ئاشکرا بکا تەڵاقی ناکەوێ، چونکە بە زۆری ئەوان تەڵاقی خواردووە.

**زۆر لێکردن:**

**بەم شتانە دێتەدی:** بە هەڕەشەی کوشتن، بە هەڕەشەی ئەندام بڕین، بە لێدانی زۆر، بە حەپسکردنی زۆر، بە بردنی ماڵ، بە لەناوبردنی، وەك لە پێشەوە باسکرا خەوتوو تەڵاقی ناکەوێ، هەروا کەسێ بوورابێتەوەو لەسەر هۆشی خۆی چووبێ، هەروا کەسێ لە بیری نەمابێ، جا ئەگەر کەسێ یەکێ لە دوو ژنەکانی خۆی تەڵاقدا، دوایی لە بیری نەما کە کامیانی تەڵاقداوە، ئەوە دروست نیە کە لەگەڵ کەسیان رابوێرێ هەتا بیری دەکەوێتەوە، جا ئەگەر ژنێکیان گوتی: من تەڵاقدراوەکەم، وە پیاوەکەیش گوتی: لە بیرم نەماوە، یا گوتی: نازانم، ئەوە داوا لە پیاوەکە دەکرێ کە سوێند بخوا لەسەر ئەوە کە لە بیری نەماوە، یا لەسەر ئەوە کە نازانێ ئەوە یا ئەو نیە، ئەگەر سوێندی نەخوارد، سوێند دەدرێ بە ژنەکە، ئەگەر ژنەکە سوێندی خوارد، حوکم بە سوێندی ژنەکە دەکرێو تەڵاقەکە دەکەوێ. ئەگەر بەناو نەبراوی تەڵاقیدا، وەك ئەوە مێرد بە چەن ژنێکی خۆی بڵێ: تەڵاقی یەکێیان کەوتبێ، وە لە دڵەوە مەبەستی یەکێکیان نەبێ بە تایبەتی، ئەوە تەڵاقی یەکێکی ناو نەبراویان دەکەوێ، لەوە دوا مێرد بە ئارەزووی خۆی ناوەکەی دیاری دەکا.

**بزانن:**

که سەرخۆش تەلاقی دەکەوێ، بە مەرجێ کە خۆی دەستی لەسەر خۆشییەکەیدا هەبووبێ، چونکە سەرخۆش بەر پرسیارە لە کردارو گوفتاری خۆی، هەروا کەسێکیش دەرمانێ بخوا یا بخواتەوە سەرخۆشی بکا، یا بێهۆشی بکا تەلاقی دەکەوێ، بەمەرجێ کاری بە بەکارهێنانی ئەو دەرمانە نەبووبێ، چونکە ئەم دوو کەسە دەستیان هەیە لەم ناهەقییەدا کە لە خۆیانی دەکەن. گوتراویشە: تەلاقی ناکەوێ، گوایە ئەمیش وەك شێت وایە، چونکە هەردوکیان بێ هۆشن، مەرجی بەر پرسیاریش (تەکلیف) هۆشی ساخە کەلەم دووکاتەدا هەبوونی نیە.

## ٢٨١) تەڵاق دوو جۆری هەیە: رجعیو بائن:

**یەکەم:** تەلاقی رجعی – وشەی رجعی لە (رەجعەت)ی عەرەبی وەرگیراوە، کە بە مەعنا گێڕانەوەی شتە بۆ سەر حاڵی پێشووی خۆی. لە شەرعدا برێتییە لە هێنانەوەی ژنی تەلاق دراو بۆ ژێر رشتەی ژنو مێردی بەبێ گرێدانی تازە، لە پاش تەلاقدانی غەیرە بائین لە ماوەی عیددەدا. سەر بەلگەکەی نامەی خوداو رێگەی رەهبەرو یەکگرتنی نەتەوەی ئیسلامە.

خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ – سورة الطلاق – ١/٦٥} هەروا مێردەکانیان لەو ماوەی عیدەیەدا مافی تەواویان هەیە بۆ هێنانەوەی ئەو ژنە تەلاقدراوانە بۆ ژێر رکیفی خۆیان).

خۆشەویستیش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەی عومەر بە کوڕەکەت بڵێ: کە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر رکێفی ژنو مێردیی خۆی. ئیمامی عومەریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} حەفصەی تەڵاقدا لەپاشا گێڕایەوە بۆلای خۆی. (ئەبو داوودو نەسائیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە. حاکم دەفەرموێ: فەرموودەیەکی دروستە، بەپێی مەرجی هەردوو پیرە).

دەی هەر کاتێ مێردی ئازاد یەك جار، یا دوو جار، ژنی خۆی تەڵاقدا، یاخود بەندە: یەك جار ژنی خۆی تەڵاقدا، ئەم تەڵاقدانەیشیان لەپاش بەدەست گرتن بوو، وە لەسەر وەجەڵیش نەبوو، واتە: بە خۆڕایی بوو، بە خولع نەبوو، ئەوە مێردە تەڵاقدەرەکە بۆی هەیە کە ژنەکەی بگێڕێتەوە ژێر رکیفی خۆی، بەڵام بەمەرجێ ئەو گێڕانەوەیە لە پێش بەسەر چوونی عیددەی ژنەکەدا بێ. بۆ دامەزراندنی گێڕانەوەیش لەسەر فەرمایشتی دروست، شایەت گرتن مەرج نیە، بەڵام بەبێ گومان کە سوننەتە، هەر چەند شافیعی رای وایە: کە ئەوە پێویستە، چونکە رووکاری ئەم ئایەتە نیشانەی ئەوەیە کە شایەت گرتن بەم بۆنەیەوە پێویست بێ: {وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ - سورة الطلاق - ٢/٦٥} لەبەر ئەوەیش کە گێڕانەوەیش وەك مارەکردن وایە، دەی مارەکردن خودا فەرمانی کردووە بەشایەتگرتن بۆی، بزانن کەمێرد بۆی هەیە ژنی تەڵاقدراوی خۆی بەتەڵاقی رجعی، بهێنێتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی بەبێ فەرمانو رەزا بوونی ژنەکە، بەڵام بەمەرجێ لەماوەی عیددەدابێ.

## ٢٨٢) دارێژگەی ژن گێڕانەوە (صیغة الرجعة):

دارێژگەی ژنگێڕانەوە، بێ پێچ و بەپێچی هەیە بێ پێچ وەك ئەوە پێی بڵێ: (ئەوا تۆم هێنایەوە ژێر ركێفی خۆم) یا (ئەوا تۆم هێشتەوە لەلای خۆم) یا (ئەوا تۆم بردەوە بۆ لای خۆم) یا (ئەوا ژنەكەم گێڕایەوە بۆ ژێر نیكاحی خۆم) یا (وا ژنەكەمم بردەوە بۆ لای خۆم) لەو شوێنانەدا كە پێوست بە گوتنی وشەی (بۆ لای خۆم) بێ، دەبێ ئەم وشەیەی بۆ زیاد بكا. دارێژگەی بە پێچیش وەك ئەوە پێی بڵێ: _دووبارە تۆم كردەوە بە حەڵاڵی خۆم) یا (حەڵاڵم كردیتەوە لە خۆم) یا ( وا مارەم كردیتەوە لە خۆم).

گێڕانەوەی ژن بۆ ژێر ركێفی مێرد بە چوونەلایش دادەمەزرێ، هەروا بە ماچ و دەستبارزیش ئەگەر بە ئارەزووەوە بێ، بە مەرجێ مەبەستی لەوە گێڕانەوە بێ.

### بۆ دامەزراندی گێڕانەوە ئەم چەند كارە مەرجن:

**یەكەم**: دەبێ عیددەی ژنەكە تەواو نەبووبێ، چونكە ئەگەر عیددەكەی بە سەرچوو گێڕانەوەیش لە دەست دەچێ، چونكە لە دوا عیددە یەكسەر جیابوونەوە (واتە: بەینوونە) روودەدا.

**دووەم**: دەبێ ژنەكە دەست بدا بۆ ئەوە كە حەڵاڵ بێتەوە بۆ مێردەكەی، گریمان ژنەكە یا پیاوەكە لە ئایین هەڵگەڕانەوە، گێڕانەوە لەكاتی وادا دانامەزرێ، بزانن كە ژنی رجعی تەڵاقی تری پێوە دەلكێ لە ماوەی عیددەیدا، هەروا خولع و ئیلاوظیهاری لەگەڵ دەكرێ.

**ژنی رجعی چەند تەڵاقی دەمێنێ:**

ئەگەر مێرد مارە بڕینی کۆنە ژنی خۆی تازەکردەوە، لە پێش ئەوەدا کە شوو بکاتەوە بە مێردێکی تر، یا لەپاش ئەوە، وە لەپێش ئەوەدا کە مێردی دووەم بە دەستی بگرێ، یا لەپاش بەدەست گرتن، لە گشت ئەم شێوانەدا ژنەکە دەبێتەوە بە ژنی مێردی پێشووی، وە چەند تەڵاقی لە شووی یەکەمی بە مێردی یەکەمی مابوو ئێستا خاوەنی ئەوەندە تەڵاقەو بەس، چونکە شووکردنی دووەم ژمارەی تەڵاقە کەوتووەکانی بۆ زیندووناکاتەوە، بەپێی ئەم داستانە: دەگێڕنەوە: لە عومەر پرسیارکرا: ئەگەر کەسێ دوو جار ژنێ تەڵاق بدا، ژنەکە عیددەی بەسەر بچێو شوو بکا بە مێردێکی تر، وە لەوێش جیا ببێتەوە، ئەوجا مێردی یەکەمی مارەی بکاتەوە، ئەم ژنە لەکاتی وادا چەند تەڵاقی ماوە؟ عومەر فەرمووی: چەند تەڵاقی مابوو لە شووی یەکەمی ئێستایش هەر ئەوەندەی ماوە!

ئەم رایە دەگێڕنەوە لە عەلیو زەیدو موعازو عەبدووڵڵای کوڕی عومەرەوە، عوبەیدەی سەلمانیو سەعیدی کوڕی موسەییەبو حەسەنی بەصریش {رەزای خوای لێبێ} هەمان رایان هەیە.

## ٢٨٣) تەڵاقی بائن:

تەڵاقی بائن دوو بەشە: بەینوونەی صوغراو بەینوونەی کوبرا. بە کوردی واتە: جیابوونەوەی تەواوو جیابوونەوەی ناتەواو، یاخود جیابوونەوەی راستەقینەو بۆرە جیابوونەوە، یا جیابوونەوەی بچووکو جیابوونەوەی گەورە.

ژنی بائن بە جیابوونەوەی نا تەواو ئەو ژنەیە کە لەپێش بە دەست گرتندا تەڵاق درابێ، یا لەپاش بەدەست گرتن خولعی لەگەڵ کرابێ. مەرجەکە تەڵاقی سێ بە سێ لەلایەن مێردی ئازادەوە نەدرابێ، یا دوو تەڵاق نەدرابێ لە لایەن مێردی کۆیلەوە، چونکە یەك دەنگیو یەك گرتن هەیە لەسەر ئەوە. ژنی جیاوەبوو بە بۆرە جیابوونەوەیە حوکمەکەی ئەمەیە: بەهۆی مارەبڕینی تازەوە لەسەر مارەیی تازە، بەفەرمانو رەزابوونی ژنەکە خۆی یا هەقدارەکەی دیسان دەبێتەوە بە ژنی مێردەکەی.

ژنی بائن بە جیابوونەوەی تەواو ئەو ژنەیە کە لەلایەن مێردی ئازادەوە سێ تەڵاقە درابێ، یا لە لایەنی مێردی کۆیلەوە دوو تەڵاق درابێ، خوای ئەو تەڵاقدانە لە پێش بەدەست گرتندا بێ، یا لە پاشی بێ، وە خوای ئەو تەڵاقدانە لەیەك مارەبڕیندا بێ، یا لە پتردا، وە خوای ئەو تەڵاق دانە بەیەك جار ئەنجام درابێ، یا بە چەند جارێ. بڕیاری ئەم ژنە جیاوە بووە ئەمەیە: حەڵاڵ نابێتەوە بۆ مێردەکەی هەتا لە دوا تەواو بوونی عیددەکەی شوونەکا بە مێردێکی تر، وە مێردەکەی دووەمی بە شەرمگای (بەفەرج) بچێتەلایو بە دەستی بگرێو دوایی بە ئارەزووی خۆی تەڵاقی بداو کە عیددەکەی تەواو بوو ئەوسا بە رەزای خۆی شووبکاتەوە بە مێردی یەکەمی. چونکە زاتی پاك دەفەرموێ: (الطلاق مرتان) هەتا دەگاتە {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ} مەبەست لە (نکاح) لەم ئایەتەدا بە دەست گرتنو چوونەلایە، بەپێی ئەم فەرموودەیەی حەزرەتی عائیشە دەگێڕێتەوە: ژنەکەی زفاعەی قورەظی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا! ریفاعە بە ئێجگاری تەڵاقی داوم‌و لە پاش ئەو شووم کردووە، بە ئەورڕەحمانی کوڕی زەبیری قورەزی بەڵام چووکی ئەورەحمان وەك پەتك وایەو دروستبوونی پێ ناکرێ. عەبدوڕەحمانیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم ژنە درۆدەکا، بەڵام ئەمەبیانووە دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای مێردە پێشووەکەی ئەگینا من وەك چۆن کەوڵ خۆشە دەکرێ ئاوا دەی هەژێنم. جا پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} زەردەخەنەیێ گرتی‌و فەرمووی: ئایا دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ریفاعەی مێردی پێشووت؟ شتی وا نابێ هەتا تۆو عەبدوڕەحمان خۆشی جووتبوون لە یەکتری دەچێژن‌و وەك ژن‌و مێرد لەگەڵ یەك دروست دەبن. وەکی تریش ئەگەر ئێمە چوونە لا، لە شووکردنی دووەمدا کە بە مەرجی رەوای خۆی دەبێ بەهۆی حەڵاڵ بوونەوەی ژنەکە بۆ مێردی یەکەمی، ئەگەر ئێمە ئەم چوونەلایە بە مەرج نەگرین مەعنای وایە مەبەست لە ژن هێنان‌و شووکردنی حەڵاڵبوونە بۆ یەکتری‌و بەس، وە مەبەس لە ززەت لەیەك وەرگرتن نیە، ئەمە لە کاتێکا کە شتەکە بە پێچەوانەوەیە چونکە مەبەست لە ژن هێنان رابواردنە نەك حەڵاڵ بوونی رووت.

### ئەگەر مێردێ:

بە ژنی بەدەست گیراوی خۆی گوت: تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، سێ جار ئەوە ورد دەبینەوە: ئەگەر لە نێوانی ئەم سێ جارەدا ئێستێکی وای کرد کە زیاتر بوو لە ئێستی پشووی هەناسەدان ئەوە: هەرسێ تەڵاقەی دەکەوێ، با مەبەستی دووپات

کردنـەوەیش بـێ، چـونکە دووپـات کردنـەوە پێـچەوانەی رووکـاری ئـەم رستانەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر خـۆی گـوتی: مەبەسـتم لـە جـاری دووەمو سێیەم دووپات کردنەوە بوو، ئەوە هەواڵەی ئایینی خۆی دەکرێ واتە: لە بەینی خـۆیو خوایا تـەڵاقی ناکـەوێ ئەگـەر راسـت بکا (تکایـە تەماشـای مـوغنی موحتـاج (ب/٣ ل/٢٩٦ – ٣١٢) بفـەرموو: بـۆ راسـت کردنەوەی ئەم شوێنەیە – وەرگێڕ).

بەڵام ئەگەر نێستی نەکردو مەبەستی دووپـات کردنـەوەبوو ئـەو قسەیەی لێ وەردەگیرێ، لەبەر ئەوە یـەك تـەڵاقی دەکـەوێ، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـتی تێهەڵچوونەوە (استئناف) بـوو ئـەوە سـێ تەڵاقـەی دەکـەوێ، هـەروەها ئەگـەر بـەرەهایی بیانڵێ، لەسـەر فەرمایـشتی رۆشـنتر، بـەپێی رووکاری قسەکە، چونکە هـەر رسـتەیێ لـەم سـێ رسـتەیە سـەر بـەخۆبن لەم شوێنەدا، ئەو ئەگەرە بەهێزترە هەتا ئەگەری دووپات کردنەوە.

## ٢٨٤) سێ تەڵاقە بەیەك گفت (لەفظ):

ئەگەر کەسێ بە ژنەکەی خۆی بڵێ: سێ بەسێ تـەڵاقت کـەوتبێ، هەرسێ تەڵاقەی دەکەوێ، ئەگەر گوتی: تـەڵاقت کـەوتبێ، وە نیـازی دوو تـەڵاق یـا سـێ تـەڵاق بـوو بەقـەد ژمـارەی نیازەکـەی دەکـەوێ، بـەپێی فەرموودەکەی روکانە، کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سـوێندی داو پێـی فەرموو: مەبەستت لە ئێجگاری چی بوو؟ ئەویش دەڵێ: مەبەسـتم یـەك تـەڵاق بـوو، فـەرمووی: بڵـێ بـەخودا، گـوتم بـە خـودا. فـەرمووی: دەمەبەستت چی بووبی هەر ئەوە حەلە.

دەی ئەگەر سێ تەڵاقە بە یەکجار بەیەك تەڵاق دابنرێ ئیتر سوودی ئەم سوێندانە چییە؟! ئەمەیش کە سێ تەڵاقە بەیەك گفت سێ تەڵاقی پێ دەکەوێ ڕێبازی جەماوەری زناکانە لە چینی شوێنکەو تەوان‌و زۆرینەی چینی هاوڕێ یانی پێغەمبەرو پێشەواکانی هەر چوار مەزهەبەکە. بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەمەیە:

**یەکەم**: ئایەتی: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ} وە ئایەتی {وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ} وە ئایەتی: {لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء}. ئەوەتا ئەم ئایەتانە بە مەرجیان نەگرتووە کە پیاو دەبێ بەیەکجار یا بەدوو جار یا بەسێ جار ژنی خۆی تەڵاق بدا، هەروەها ظاهیرو رووکاری ئەم ئایەتەیش: (الطلاق مرتان) بەڵگەی ئەوەیە کە دروستە پیاو ژنی خۆی بەجارێ یا بەدوو جار یا بەسێ جار تەڵاق بدا، وە ژمارەی هەموو تەڵاقەکان لەیەك جاردا کۆبکاتەوە، یا دابەشیان بکا بەسەر چەند جارێکاو بەینیان بخات، هەروەك نیشانەی ئەوەیشە کە تەڵاق لەم حاڵانەدا لە هەموویانا دەکەوێ.

**دووەم**: ئەم قسەیەی ئیبنو عومەرە، کە لە چیرۆکی تەڵاقدانی ژنەکەیدا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا! پێم بفەرموو ئەگەر سێ تەڵاقەی بدەم ئایا دروستە بۆم کە بیگێڕمەوە بۆلای خۆم؟ فەرمووی: نەء.. لە حاڵی وادا فری تۆی بەسەرەوە نامینێ، وەشتی وایش گوناهە.

**سێیەم**: عوبادەی کوڕی صامیت فەرمووی: باپیرەم ژنێکی هەزار بە هەزار تەڵاقدا، جا من چووم بۆ خزمەت حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} ئەمەم بۆ باسکرد، پێغەمبەری {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرمووم: ئەی عوبادە؟ باپیرەت! تەقوای خودای بەجێ نەهێناوە لەم کارەیدا، چونکە ئەو بەس سێ تەڵاقی هەیە، نۆ سەدو نەوەدو حەوتەکەی تری دەسدرێژیو تاوانە لە ئەستۆیدا (عەبدورەزاق لە - مصنف ـی خۆیدا گێڕاویەتەوە) لە گێڕانەوەیەکدا: باپیرەت بەپێی ئایەتی {وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا} رەفتاری نەکردووە هەتا خودا لەم مەسەلەیەدا دەروویەکی بۆ بڕەخسێنێ، فڕی بەسەر ژنەکەیەوە نەماوە هەرسێ تەڵاقی کەوتووە، بەڵام لەسەر ئەو شێوەیەکە پەسەندە لە شەریعەتی خوادا تەڵاقی نەخواردووە، ئەو نۆ سەدو نەوەدو حەوتەی تر تاوانە لە ئەستۆیدا.

**چوارەم**: شافیعی لە (الام)دا دەفەرموێ: نادروست نیە بۆ مێرد کە دوو تەڵاقەی ژنی خۆی بدا یا سێ تەڵاقەی بدا، چونکە خوا ژن تەڵاقدانی بە رەوا داناوە، شتێکیش کە ئەو رەوای بکا لە کەسی خۆی قەدەغە نابێ، وە دەفەرموێ: عوومیمیری عەجلانی لە خزمەت پێغەمبەردا ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەڵاقدا، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئەوەی پێ نەفەرموو بوو، وە لەپێش ئەوەیشدا کە هەواڵی پێ بدا کە هەر بە شەرەنەفرین (لعان)ەکە تەڵاقەکەی دەکەوێ. دەی ئەگەر ئەوە قەدەغە بوایە، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چۆن لێی بێدەنگ دەبوو، دیارە کە نەهی لێ دەکردو ئەویش‌و خەڵکەکەی کە لە خزمەتیدا بوون ئاگاداری دەکردنەوە لەوە. فاطیمەی کچی قەیسیش دەڵێ: کە مێردەکەی

به ئێجگاری (واته: سێ بەسێ) تەلاقی داوە، دەی نەمان بیستووە کە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} نەیی لێکرد بێ لەوە، روکانیش ژنەکەی خۆی به ئێجگاری (ئەلبەتتە) تەلاقدا، لەبەر ئەوەی ئەم وشەیە هەڵ دەگرێ دەبەست لێی یەك تەلاق بێ یا سێ تەلاق بێ پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} لێی پرسی مەبەستت چیبوو، وە لەسەر ئەوە کە نیازی چیبووە لەو وشەیە سوێندی داوە، وە نەگەیوەتەوە بە ئێمە کە پێغەمبەر {درووده خوای لەسەربێ} رێگەی ئەوەی نەدابێ کە کەس بە ئێجگاری (واتە: بەسێ تەلاق) ژنی خۆی تەلاق نەدا، عەبدورەحمانی کوڕی عەوفیش بە یەکجار لەیەك کۆڕدا بەیەك گفت ژنەکەی خۆی تەلاقداوە (فەرمایشتەکەی شافیعی) {رەزای خوای لەوەی لێبێ} هاتە کۆتایی.

شتێ هەیە لە دیندا پێی دەگوترێ (إقامة الحجة) بەپێی بۆچوونی بەندە ئەم بارودۆخەی ئێستامان - إقامة الحجة ـی دین و دنیایە. بەلام سیاسەتمەدارە مەستەکانی کورد وا بوغرا بوون، مەگەر لە رەوێکی نوێدا رووی رەشیان بە باشی بۆ میللەت دەربکەوێ جاوا لەم گۆشەیەوە ئەمە دەنووسم. ئەوەی کە لێرەدا نووسیومە لە چاپی یەکەما کرتاوەو نە نووسراوە.

## ٢٨٥) رای جەماوەری شەرعزانەکان:

**بزانن:**

کە جەماوەری شەعزانەکان رایان وایە کە سێ تەلاق بە یەکجار لەیەك گوتەدا کۆ دەکرێتەوە، وەك ئەوە مێرد بە ژنی خۆی بڵێ: (هەرسێ تەلاقت کەوتبێ) بەلگەیشیان ئەم چەند شتەیە:

١) بەیهەقی لە سونەنیداو تەبەرانیو کەسانی تریش دەگێڕنەوە: ئیبراهیمی کوڕی عەبدول ئەعلا لە سوودەیدی کوڕی غەفلەوە دەفەرموێ: (عائیشەی کچی فەضل ژنی حەسەنی کوڕی عەلی بوو، کە ئیمامی عەلی شەهیدبوو، حەسەن لە شوێنی باوکی بوو بە جێنشین. جا بەم بۆنەیەوە عائیشە پیرۆزبایی پایەی تازەی لە حەسەن کرد. حەسەن پێی فەرموو: کەی کاتی پیرۆزباییە ئەوە شادەکامیو پێخۆشبوون بە بۆنەی کوشتنی باوکمەوە کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، دەردەبڕیێ؟! کەواتە هەرسێ تەڵاقت کەوتبێ، وە هەزار دیناری بە موتعە پێدا.. لەپاشا حەسەن فەرمووی: لەبەر ئەوە نەبێ کە لە باپیرەمم بیستووە، یا فەرمووی: لە باوکم بیستووە کە باپیرەم حەزرەتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: (**اذا طلق الرجل امراته ثلاثا عند الاقراء او طلقها ثلاثا مبهمة لم تحل له حتى تنكح زوجا غيره لراجعتها**). رشتەکەی دروستە.

٢) ئیمامی عومەریش {رەزای خوای لێبێ} نامەی نووسی بۆ ئەبو مووسای ئەشعەری {رەزای خوای لێبێ} کە هەر کەسێ بە ژنی خۆی بڵێ: سێ تەڵاقت کەوتبێ، ئەوەوە هەرسێ تەڵاقی دەکەوێ (ئەبو نەعیم).

٣) لە صەحیحی بوخاریدا دەفەرموێ: عوومیمیری عەجلانی شەڕەنەفرینی لەگەڵ ژنەکەی کرد، لە کۆڕەکەدا کە شەڕەنەفرینەکە تەواوبوو، عوومیمیر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر رایبگرمەوە لەلای خۆم دیارە کە بوختیانم پیاکردووە، ئیتر لە دوا شەڕەنەفرینەکە، بەر لەوە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی بڵێو

فەرمانی پێبکا ئەو لە خۆیەوە ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەڵاقدا.. پێغەمبەر {درودی خوای گەورەی لەسەربێ} لەسەر ئەوە رەخنەی لێ نەگرت. دەی ئەمە بەلگەی ئەوەیە کە سێ تەڵاقە بەسەر یەکەوە، بەیەك لەفظ دەکەوێ. ئیبنو حەزم دەفەرموێ: ئەگەر سێ تەڵاق بەسەر یەکەوە نەکەوتایە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لێی بێ دەنگ نەدەبوو، وە رەخنەی لە عوومیر دەگرت، بوخاریش {رەزای خوای لێبێ} هەروا لەم مەسەلەیە حالی بووە، بۆیە ئەم فەرموودەیەی لە صەحیحەکەیدا گێڕاوەتەوە لە (باسی کەسانێ کە سێ تەڵاقە بەسەریەکەوە رەوا دەبینن).

٤) ئیبنو هەممامیش لە (فەتحولقەدیر)دا دەفەرموێ: ژمارەی شەرعزانە گەورەکان کە پایەی موجتەهیدو کۆششکاریان هەبووە، لە هاوڕێیانی پێغەمبەر {درودی خودا لە خۆی و رەزای خودا لە هاوڕێیانی} ناگاتە زیاتر لە بیست کەس، وەك هەر چوار یاری پێغەمبەرو هەر چوار عەبدوڵلاکەو زەیدی کوڕی سابیتو موعازی کوڕی جەبەلو ئەنەسو ئەبو هورەیرە {رەزای خوایان لێبێ} وە چەند کەسێکی تری کەم، ئیتر ئەوانی تریان لەکاتی پێویستا پرسو رایان بە مانە دەکردو داوای فەتوایان لێ دەکردن، دەی ئێمە رای زوربەی ئەم زاتانەمان راگوێزکردووە کە بە فەرمایشتی رۆشنی بێ پێچو پەنا بریاری ئەوەیان داوە: کەسێ تەڵاقە بەسەریەکەوە بە یەکجار دەکەوێ، وە کەسیش لاری لەم بریارەی ئەوان نەبووە، کە واتە وەك خوای گەورە دەفەرموێ: {فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ - سورة یونس - ١٠/٣١} واتە: دیارە کە رێگەی حەق

یەکەو روونو ئاشکرایە هەرچی ئەوڕێیە نەگریَ سەر لێشێواوو گومڕایە).

جا لەسەر ئەم بناغەیەیە کە ئێمە دەڵێین: ئەگەر هاتوو فەرمانڕەوایێ فەرمان بکا بەوە کە (سێ تەڵاقەکە بەیەك جار لە دەم دەربچێ دادەنریَ بە یەك تەڵاق) ئەگەر دەسەڵاتداریَ بڕیاری وا بدا ئێمە جێبەجێی ناکەین، چونکە شتی وا قەبووڵی اجتهاد ناکا، بەڵکوو کاری وا دووبەرەکی نانەوەیە، پێی ناگوترێ راجیایی زانایانی شەرع! کە دادەنریَ بە مایەی رەحمەتو هۆی ئاسانکاری.

گێڕانەوەیەکیش لە ئەنەسەوە هەبە کە ئەنەس دەفەرمویَ: ئەم جۆرە تەڵاقە دادەنریَ بەسێ تەڵاق، طەحاویو کەسانی تریش رشتەی ئەم گێڕانەوەیان روونکردۆتەوە. فەرمایشتی ئیبنو هەممام تەواو.

رووکاربین (ئەهلی ظاهیر)ەکانیش لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا دەڵێن: تەڵاقی سێ بەسێ تەڵاقدەر بە یەکجار بە دەمیابێ دادەنریَ بەیەك تەڵاق، گفت (لەفظ) رۆڵ نابینێ لە دابەشکردنی جارەکانی تەڵاقدا، بەڵگەشیان رووکاری ئەم ئایەتەیە: (الطلاق مرتان) هەتا (حتى تنكح زوجا غيره) ئەم فەرموودەیەی بوخاریو موسلیمیش دەکەن بە بەڵگەیەکی تر: ئیبنو عەبباس {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرمویَ: جاران بە سەرینیی پێغەمبەر خۆیو لە سەردەمی جێنشینیی ئەبو بەرکردا تەڵاقی سێ تەڵاقە یەك تەڵاق بوو، تا دووساڵیش لەسەردەمی جێنشینیی عومەر رۆیشت ئەم حاڵە هەروا مابوو، لەپاشا عومەری کوڕی خەططاب فەرمووی: ئەم خەڵکە لە پێشدا لەم کارەدا بە شێنەیی

بوونو پشوودرێژ بوون، بەڵام ئێستا سەریان تێکردووە، زۆر لێی بە پەلەن، کەوابوو با حوکم بکەین بە کەوتنی سێ تەڵاقە، جا لەپاش راوێژکردن لەگەڵ پارانیدا بۆ ئەم مەسەلەیە حوکمی کرد بە کەوتنی تەڵاق سێ بەسێ). هەروا ئەم فەرموودەیەیش دەکەن بە بەڵگە: ئیبنو ئیسحاق لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: روکانە لەیەك کۆڕی دانیشتن دا، ژنەکەی خۆی سێ تەڵاقە دەدا، لە پاشا زۆر پەشیمان دەبێتەوەو بۆ ژنەکەی پەرۆش دەبێ، جا پێغەمبەر لێی دەپرسێ: (چۆنت تەڵاق داوە؟) دەفەرموێ: بەیەك جار لەیەك کۆڕی دانیشتندا، سێ بەسێ تەڵاقم داوە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەمە بەیەك تەڵاق دادەنرێ. جا ئەگەر ئارەزوو دەکەی ژنەکەت بهێنەرەوە.

لایەنگیرانی جەماوەری زانایان رەددی ئەمانە بەم شێوەیە دەدەنەوە: لە زمانا گوتنی سێ، سێ شتی پێ ئیسپات دەبێ: شت بەخشو پێلێنەرو تەڵاقدەرو بەندە ئازادکەر وەك یەك بە ئارەزووی خۆیان چەندە ئارەزوو بکەن ژمارە لەسەر خۆیان دەچەسپێنن، وە لە سەریان دەبێ بەماڵ، شت بەخش بەیەك گفت دەڵێ: ئەوا ئەو سێ شتەیەم بەخشی بەتۆ، دیارە کە بەخشینەکە لەهەر سێ شتەکەدا دادەمەزرێ، هەروا فرۆشیارو پێلێنەرو ئازادکەریش کە دەڵێن: ئەو سێ شتە، یا ئەو چوراشتە، یا ئەو پێنج شتەم فرۆشت بە تۆ، یا ئازادم کرد، یا شتێکی ئاوا دەڵێن، ئیتر ئەو ژمارەیان لەسەر دەبێ بەماڵ، وە پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکا، هەروا ئەم شیعرەیش دەکەن بە بەڵگە، شاعیرێ لەگەڵ دوو هاورێی خۆیدا شەرە شیعر دەکا، بۆ سەروای بیتی ئێی

عەرەبی دادەمێنیَ، لەبەر ئەوە ئاوا ژنەکەی خۆی تەلاق دەداو دەڵێ: ( وأم عمر طالق ثلاثا..) هەروا شاعیرێکی تری عەرەب دەڵێ:

**وأنت طلاق والطلاق عزيمة ثلاث ومن يخرق أعق وأظلم**

**واتـە :**

**وا تۆم تەلاقدا، سێ بەسێی تەواو زوڵمم لەخۆم کرد، بووم بە گێلە پیاو**

سەرەڕای ئەمانەیش سێ تەلاقە بە یەکجارو بە یەك گفتو لەیەك کۆڕدا کارێکی ناسراو بووە لەناو هاورێیانی پێغەمبەرو چینی دووەمی موسوڵمانانو لەناو شەرعزانەکانو لەناو گەلی عەرەبدا، وەك لە پێشەوە درێژەی هەندێ لەمانە رابورد، ئەوەتا لە هاورێیان عومەرو ئەبو مووسا ئاگایان لە تەلاقی سێ بەسێ هەیە، ئیبراهیمی نەخەعیش کە لە تابیعینە ئاگای لە سێ تەلاقە هەیەو حوکمی پێ دەکا، شەعبی لەبارەی زانایی نەخەعییەوە دەفەرموێ: لە سەردەمی ئیبراهیمدا کەس لەو زاناتر نەبوو.

**کەواتە داوای ئەوانە کە دەڵێن:** ژمارە لە ئینشادا بێ بایەخە، ئەم داوایە بێ بەڵگەیە، نە لە نامەی خودادا، نە لەرێگەی رەهبەردا، نە لەیەکگرتندا، نە لەقیاسدا، نە لە زماندا بەڵگەی نیە، دەی ئەمە نیشانەی ئەوەیە وەك ئیبنوتین دەفەرموێ: کۆکردنەوەی سێ تەلاقە لەیەك جاردا جێگەی یەك رایی هەموو ئەو زانایانەیە کە بایەخ بە فەرمایشتیان دەکرێ.

لە وەڵامی حەدیسەکەی ئیبنو عەبباسیشدا کەوا لە صەحیحەیندا دەڵێین: لە فەقیٚو شاگردەکانی ئیبنو عەبباس بەس طاووس ئەم حەدیثەی لێوە گێڕاوەتەوە، بەڵام زوربەی فەقیٚ ناودارەکانی بە پێچەوانەوە ئەوە لە ئیبنو عەبباس دەگێڕنەوە کە دەفەرمویٚ: (کۆکردنەوەی سیٚ تەڵاقە لەیەك گفتا دروستە، وە ئیبنو عەبباس خۆی کاری بەوە کردووە) هەندیٚ لەم قوتابیانەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عەطاو عومەری کوڕی دینارو کۆمەڵیٚ ترە، ئەمانە هەموو دەڵێن: سیٚ تەڵاقە پێکەوە کۆدەکرێتەوە، فەرموودەکەی ئیبنو ئیسحاقیش وەهەمەو هەڵەبوونە، چونکە کەسانی باوەڕ پێکراوی تەواو لەسەر ئەم شێوەیە دەیگێڕنەوە: روکانەی کوڕی عەبدویەزید {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەمم بە ئێجگاری تەڵاق داوە. فەرمووی: مەبەستت لە ئێجگاری (ئەلبەتتەتە) چی بوو! گوتم مەبەستم یەك تەڵاق بوو. فەرمووی: بڵیٚ بەخودا، گوتم: بەخودا. فەرمووی: دەی مەبەستت چی بوبیٚ هەر ئەوە حەلە، ئەوەتا لەم گێڕانەوەدا دەفەرمویٚ: روکانە ژنەکەی بە ئێجگاری تەڵاقداوە، نافەرمویٚ: ژنەکەی سیٚ بەسیٚ تەڵاقدا، ئەم دوو قسەیەیش جیاوازییان زۆر زۆرە، چونکە ئەم گێڕانەوەی دووەمە نابیٚ بە بەڵگە لەسەر بۆچوونی رووکاربینەکان!.

# ٢٨٦) حوکمی ئیلا (سوێندکاری)و ژن لەخۆ حەرامکردن:

ئیلاء لەزماندا واتە سوێند خواردن، لە شەرعی شەریفدا برێتییە لە سوێند خواردنی مێردێکی وا کە دروست بێ ژن تەڵاق بدا وە لەسەر ئەوە سوێند بخوا کە هەرگیز نەچێتە لای ژنەکەی، یا زیاتر لە چوار مانگ نەچێتە لای. لە سەردەمی نەزانیدا (واتە: لە جاهیلییەتدا) ئیلا دادەنرا بە تەڵاق، بەڵام یاسادانەری ئیسلام کە خودای گەورەیە بڕیارەکەی گۆڕی. سەربەڵگەی سوێند کاری ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: {لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة البقرة - ٢/٢٢٦} واتە: ئەوانەی کە سوێند دەخۆن کە لەگەڵ ژنەکانیاندا دروست نەبن، هەقیان هەیە هەتا چوارمانگ چاوەڕوانی بکەن جا ئەگەر پیاوە سوێند خۆرەکان گەڕانەوە بۆ سەر یاسای ژنو مێردیو لەو ماوەیەدا چوونە لای ژنەکانیان ئەوە خودای گەورە لێخۆشبوو و میهرەبانە، وە ئەگەر تەڵاقیاندا ئەوا خودا هەموو شتێ دەبیستێو ئاگای لە خشەی مارو مێرووە.

ئیلا (یا سوێنکاری) کاتێ دادەمەزرێ کە مێرد سوێند بە زاتی خودا، یا بەنیشانەیێ لە نیشانەکانی خودا بخوات. ئیمامی شافیعی (رەزای خوای لێبێ) لە فەرمایشتی نوێیدا بڕیاری وایە: کە مەرج نیە ئەم سوێندە هەر بەزاتی خوداو بە سیفەتەکانی بێ، بەڵکوو بە سوێندی تریش دادەمەزرێ، چونکە ئەیاتەکە بە رەهایی باسی ئەم سوێند خواردنە دەکا. کەواتە ئەگەر بڵێ: ئەگەر هاتە لات نەزربێ لە سەرم رۆژێ بە

رۆژووبم، یا نوێژێ بکەم، یا حەجی ماڵی خوا بکەم، یا بەندەیەك ئازادبکەم، یا شتی ئاوا بڵێ، ئەوە ئەم جۆرە نەزرانەیش دادەنرێ بە ئیلاو سوێندکاری.

## بڕیاری سوێندکاری:

هەر کاتێ سوێندکاری بەپێی مەرجەکانی خۆی دامەزرا ئەوە لە سەرەتایەوە چوار مانگ مۆڵەت بۆ سوێندخۆر (ولی) دادەنرێ بەپێی رووکاری ئایەتەکە، لەبەر ئەوەیش کە ئەم ماوەیە کە شەرع دایناوە بەپێی سروشتی پیاوو ژنە، کە پتر لەو ماوەیە ناتوانن صەبر لەسەر یەکتری بگرن، جا لەپاش ماوەی چوار مانگەکە ژنەکەی دەتوانێ شکاتی لێ بکا، بە مەرجێ مێردەکەی نادیار نەبێو لەسەفەر نەبێو لەماڵ بێ. جا ئەگەر ژنەکە داوای سەرجێیی لێ کرد، وە نەهێڵێ نەبوو لە چوونەلا، وە پیاوەکە چووە لای ئەوە مافی ژنەکەی بەجێ هێناوە، لای کەمی دروستبوونیش ئەوەیە کە گۆمکەی سەری چووك ون ببێ لەناو شەرمی ژندا، بۆ ئەمە جیاوازی نیە لە نێوانی بێوەژنو کچدا، بەڵام بۆ کچ مەرجەکە لێی ببێ بە زاواو رووسووری بپژێنێو کچێتی نەمێنێ، چونکە زوربەی کات (التقاء الختانین)بەوە دێتەجێ لە کچدا.

وەکی تریش ئەگەر سوێندەکەی بە خوداو بە یەکێ لە نیشانەکانی بوو ئەوە دەبێ کەفارەتی سوێندیش بدا، جا ئەگەر لەپاش داخوازیی ژنەکە، مێرد ژنەکەی ئاشت نەکردەوە، ئەوە داوای تەلاقدانی لێ دەکرێ، بەپێی ئەم گێڕانەوەیە: سەهلی کوڕی صاڵح لە باوکیەوە دەفەرموێ: (لە دوازدەکەسم پرسی لە هاوڕێیانی پێغەمبەر {دروودی خوای

لەسەربە} پیاوێ ئیلا لەگەل ژنی خۆی بکا بڕیارەکەی چییە؟) هەموویان فەرموویان: (هەتا چوار مانگ هیچی لەسەر نیە، لەپاش چوار مانگ قازی فەرمانی پێ دەدا یا بە یاسای ئاسایی ژنەکەی ئاشت بکاتەوەو بچێتە لای، یا تەلاقی بدا، ئەگەر قوبوولّی یەکێ لەمانەی کرد ئەوە باشە، دەنا قازی بەحەپس‌و شتی وا زۆری بۆ دێنێ کە تەلاقی بدا، یا ژنەکەی ئاشت بکاتەوە. ئەگەر هەر نەیکرد ئەوسا قازی لەسەر داواکردنی ژنەکە یەك تەلاقی رجعی ژنەکە دەدا.

## ٢٨٧) باسی ظیهار:

(ظیهار) لە زماندا لە (ظهر) دروست بووە، کە جێگەی سواربوونە، چونکە ژن سوارگا (مەرکووب)ی مێردە، هەندێ دەڵێن: بەواتا بەرزەوەبوونە، وەك لەم ئایەتەدا (ظەهر) بەواتا (علو)ە، کە بەواتا بەرزەوەبوونە، خوا دەفەرموێ: {فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ – سورة الكهف – ٩٧/١٨} جا ئەمە وەك ئەوە وایە کە ظیهارکەر بەژنی خۆی بڵێ: چی سواری تۆبم‌و چی سواری دایکم بم.

لە سەردەمی نەزانیدا ظیهارکردن بە تەلاق دادەنرا بەلاّم شەرعی پیرۆز بڕیارەکەی گۆڕی‌و کردی بە مایەی حەرام بوونی ژن‌و کەفارەتی لەسەر پێویست کردووە، ظیهارکردن لە شەرعدا بریتییە لەوە کە مێرد ژنی خۆی بچوێنێ بە ژنێکی خۆیی (محرم)ی خۆی لە حەرامیدا. سەر بەڵگە لەم بارەیەوە، بەر لەوەی ببێ بە یەك دەنگی‌و بە یەکگرتن، ئەم ئایەتەیە: {وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ

لِمَا قَالُوا} تا كۆتايی ئايەت. ظيهار حەرامە بە يەككگرتن، بەپێی ئەم ئايەتە: {وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا}.

**شێوەی ظيهار:**

ئەوەيە كە مێرد بە ژنی خۆی بڵێ: (تۆ بۆ من وەك پشتی دايكم وای) ئەم شتانەيش دەق وەك پشت وان: سكو شەرمو سێنگو دەستو قاچو موو و لەشو زات، چونكە شوبهاندنە بە ئەندامێكی ژنی خۆييەوە، كەواتە لە پشت دەچێ، ئەم جۆرە گوتنانەی تريش بە هەمان واتان: تۆ لەگەڵ مندا، يا لەلای من، يا لەكن من، يا لە ئاستی من، وەك پشتی دايكم وای، يا تۆ وەك پشتی دايكم وای وشەی (بۆ من) نەڵێ، بەڵام ئەگەر گوتی: (تۆ بۆ من وەك دايكم وای) يا (وێنەی دايكم وای) ئەوە ئەگەر مەبەستی ظيهاربێ ئەوە ظيهارە، دەنا ئەگەر مەبەستی لە قەدرو رێزدا بێ ئەوە ظيهار نيە. ئەگەر بە رەهاييش گوتی بەپێی بنەڕەت دانانرێ بە ڤيهار، جونكە بنەڕەت نەبوونە. بەڵام ئەگەر چواندی بە ژنێكی خۆيی بنەچەوە، وەك كچو خوشكو پوورو كچی براو، كچی خوشك، ئەوە راجيايی وا تيادا، بەپێی مەزهەب مەزهەب دادەنرێ بە ظيهار بەڵام ڤيلێ دەفەرموێ: ئەگەر نيازی ظيهاربێ ظيهارە، وە ئەگەر نيازی تەڵاق بێ تەڵاقە، چونكە ئەم قسەيە هەردوولا هەڵ دەگرێ، وەك ظيهار لێچوونی تيادايە، وەك تەڵاقيش حەرام بوونی تيادايە.

**ئه نجامی ظیهار:**

**یەکەم:** حەرامە چوونەلا هەتا کەفارەت دەدا.

**دووەم:** کەفارەت پێویست دەبێ بە پەشیمان بوونەوە، کە پێشی دەگوترێ: عەود، واتە: گەڕانەوە. ظیهارکەر ئەگەر دەسبەجێ ژنەکەی تەڵاقدا یا بەهەر شێوەیێ دەستی لە دەستی بۆوە ئەوە دانانرێ بە گەڕاوە (عائد)و کەفارەتی ناکەوێتە سەر، دەنا کەفارەتی دەکەوێتە سەر، چونکە لێچوواندنی ژن بە دایکەوە ئەوە دەخوازێ کە جارێکی تر بە چاوی ژنێتی تەماشای نەکا، دەی هەرکاتێ وەك ژن رایگرتەوە واتای وایە کە لە قسەی خۆی پەشیمان بۆتەوە.

**کەفارەتی ظیهار:**

کەفارەتی ظیهار بەریز بە یەکێ لەم سێ شتە جێبەجێ دەبێ، بەم رەنگە ئەگەر یەکەمیان دەسگیر نەبوو بچێتە سەر دووهەمیان‌و ئەگەر دووهەمیشیان دەسگیر نەبوو ئەوجا بچێتە سەر سێیەمیان،

**یەکەم:** ئازادکردنی بەندەیەکی موسوڵمانی وا کە نەنگی وای پێوە نەبێ کە زیان بەکارو کاسپیی بگەیەنێ، وەکوو کوێری‌و گۆدی‌و گۆجی. جا ئەگەر ئەوەی دەسگیر نەبوو ئەوە پێویستە دوو مانگ لەسەر یەك بە رۆژووبێ، جا ئەگەر ئەم دووهەمەیشی دەسگیر نەبوو ئەوە دەچێتە سەر سێیەم کە برێتییە لەوە: خۆراك بدا بە شەست کەسی نەدارا، وە هەریەکی (مودد)ێك دانەوێڵەیان بداتێ کە بۆ سەرفترە بشێ، ئەمەیش دەقی قورئانە، خوای گەورە دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ

مِـن نِّـسَائِهِمْ ثُـمَّ يَعُـودُونَ لِمَـا قَـالُوا فَتَحْرِيـرُ رَقَبَـةٍ مِّـن قَبْـلِ أَن يَتَمَاسَّـا} هـﻪتا {فَإِطْعَـامُ سِـتِّينَ مِـسْكِينًا – سـورة المجادلـة – ٥٨/٣-٤}. سـﻪلەمەی کوڕی صـﻪخر {ڕەزای خوای لێبێ} فـﻪرمووی: پیـاوێ بووم زۆرم حـﻪز لـﻪ ژن بـوو، جا کـﻪ ڕەمـﻪزان هـات نـﻪبادا لـﻪ ڕەمـﻪزانا بـچمە لای ژنەکـﻪم، هـاتم ظیهـارم لەگـﻪڵ دەکـرد، هـﻪتا ڕەمـﻪزان دەڕوا شەوێ ژنەکەم خەریك بوو خزمەتی دەکردم لەو کاتەدا لە پڕ چاوم بـﻪ شـوێنێکی کـﻪوتو ئـیتر خـۆم بـۆ ڕانـﻪگیراو هـﻪڵ پەڕیمـﻪ سـﻪر کۆڵیو چـوومە لای، جـا بـۆ سـبەینێ قـسەم بـۆ خزمـﻪکانم کـردو گـوتم: وەرن لەگـﻪڵما دەچـین بـۆ خزمـﻪتی پێغەمبـﻪر {درودی خوای لەسەربێ} گـوتیـان: نـﻪ بەخودا نایەین، جا خۆم چووم بـۆ خزمـﻪتیو عـﻪرزیم کـرد، فـﻪرمووی: ئەمەیـشت کـرد ئـﻪی سـﻪلەمە! گـوتم: ئـﻪی پێغەمبـﻪری خـودا! بـﻪڵێ ئەمەیـشم کـرد، ئەمەیـشمکرد، بـﻪڵام ئەمـﻪتام ڕاوەسـتاوم لەبـﻪر بـاری خودای گەورەو شکۆمەندا، خودای گەورە فەرمانی بەچییە بەوە حوکمم بـدە، مـن ملـم کەچـە بـۆ ئـﻪوە، فـﻪرمووی: بەنـدەیێ ئـازاد بکـﻪ، منـیش دەستم مالی بەلاملماو گوتم: بەو کەسە کە تۆی کـردووە بـﻪ پێغەمبـﻪری ڕاسـتو دروسـت جگـﻪ لـﻪ خـۆم کـﻪ بەنـدەی خـودام بەنـدەی تـر گومـان نابەم. فەرمووی: دە دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژووبە. گوتم: ئـاخر مـن بەهۆی ڕۆژووەوە تووشی ئەم کێشەو بەرەیە بووم! فەرمووی: دە شەسـت مەن خورما دەرخواردی شەست هـﻪژار بـدە. گـوتم: بـﻪو کەسـﻪ کـﻪ تـۆی کـردووە بـﻪ پێغەمبـﻪری ڕاسـتو دروسـت خـۆمو ژنەکـﻪم بـﻪبێ شـێو سەرمان ناوەتەوە، وە ئەوەی پێی بگوترێ خۆراك نەمان بوو. فـﻪرمووی: دەبـڕۆ بـۆ لای سـﻪرکاری سـﻪر زەکـاتی بـﻪنی زورەیـق، زەکاتەکـﻪی لێ

وەربگـرە، شەسـت مـەن خورمـای لێ بـدە بـە شەسـت هـەژارو بـاقی مەندەکەیشی بۆ خۆتو خێزانت بیخۆن بۆ خۆتان. جا منیش گەڕامـەوە بۆ لای خزمانم پێم گوتن: ئێوە سەری دنیاتـان لـە مـن هێنایـەوە یـەكو راتـان خـراپ بـوو، بـەلاّم پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} دلّ فـراوانو بـە حەوسەڵەیەو رای فرەخاسە، وە فەرمووشی کە زەکاتەکەتان بـۆ مـن بـێ. (ئەحمـەدو ئـەبو داوودو تیرمیـذیو حـاکمو ئیبنـو خوزەیمـە گێڕاویانەتەوە. حاکم بە ساخی داناوە، تیرمیذی بە جوانی داناوە).

## ٢٨٨) شەڕەنەفرین (لیعان):

لیعـان لـە زمانـا لـە (لـەعن) دروسـت بـووە، کـە بـەواتا دوورخستنەوەیە، بۆیـە وانـاونراوە چونکە شـەڕەنەفرین کـەرەکان دوو کەسـن، مـسۆگەر یـەکێکیان درۆ دەکـەن، درۆزنـیش مەلعوونـە، واتـە نـەفرین لێکـراوە، لەبـەر ئـەوەیش چـونکە هـەردوو نەفرینکـەر هـەتا هەتایە لە یەك حەرام دەبن، لەبەر ئەوە لە یەکتریش دوور دەکەونەوە.

شـەڕەنەفرین لە شـەرعدا برێتییـە لـە چـەند قسەیەکی دیاری، کراوە بە مەهانەی رەوا بـۆ پیـاوی ناچار کـە تۆمـەتی داوێنپیـسی بداتـە پاڵ ئەو کەسەی کە ئابرووی لەکەردار کردووە.

سـەر بەلگەکـەی ئـەم فەرمایـشتەی خـودای گەورەیـە: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ – سـورة النـور – ٦/٢٤} . هۆی هاتنی ئەم ئایەتە ئەم رووداوەیـە هیلالی کوڕی ئومەییـە

هاته خزمەتی حەزرەت {دروودی خودای گەورەی لەسەربێ} شەریکی کوڕی سەمحای نا بە قنگی ژنەکەی خۆیەوەو گوتی: بەسەر ژنەکەمەوە گرتوومە، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: شتی وا بە قسەی رووت، بەبێ بەڵگە سەر ناگرێ، یا بەڵگەو شایەت راست دەکەیتەوە یا داری حەددی بوختان لە پشتت دەدرێ! گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە چۆن حاڵێکە، کاتێ پیاوێ بەسەر پشتی ژنی خۆمانەوە بگرێن، بڕۆین بە شوێن بەڵگەو شایەتدا بگەڕێین! حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: هەر ئەوەیە یاخود بەڵگە پەیدا دەکەی یا خۆت ئامادەکە بۆ داری حەددی بوختان بۆ ژنی مەرد.

هیلالیش گوتی: بەو خودایە کە ئەم ئایینە راستو دروستەی بە تۆدا ناردووە بۆ ئێمە، قسەکەم راستە، کەوابوو لێم روونە کە خودا سرووش (وەحی) بۆ تۆ دەنێرێو پشتی من رزگار دەکا لە داری حەدد، چونکە خودا لەگەڵ هەقە. ئیتر حەزرەتی جوبرائیل ئەم ئایەتانەی بۆ حەزرەت هێنا.

## بڕیارەکانی شەڕەنەفرین:

هەرکاتێ مێرد بوختانی داوێن پیسی بداتە پاڵ ژنی خۆی شایانی داری حەدد دەبێ چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: یا بەڵگەو شایەت راست دەکەیتەوە یاداری حەددی بوختان لە پشتت دەدرێ. بەڵام بە یەکێ لەم دوو شتە لە داری حەدد رزاگاری دەبێ. یا بە بەڵگەو شایەت، یا بە شەڕەنەفرین، وەك لە دەقی فەرموودەکەدا رابوورد، جا هەر کاتێ مێرد سوور زانی کە ژنەکەی داوێن پیسە، یا

ژنەکە خۆی پێی لێنا، یا قاوبلاو بۆوە کە کابرایەك دەستی لەگەڵ ژنەکەیدا تێکەڵ کردووە، یا لەکاتی گومان لێکراودا پیاوێ هاموشۆی دەکا، یا پیاوێکی لەسەر شێوەیەکی ناشایستە لە ژێر پێخەفی ژنەکەیدا بینی، ئەوە لەم شێوانەدا مێرد بۆی هەیە کە تۆمەتی داوین پیسی لە ژنی خۆی بدا. ئەگەر منداڵیشیان هەبوو، مێردەکە سوور دەیزانی کە ئەو منداڵە لەونیە، ئەوە لە سەری پێویستە کە بەهۆی شەڕەنەفرینەکەوە حاشا لەو منداڵەیش بکا، هەتا لەهی ئەو دەرچێ و بەزۆڵ دەرچێ. کاتێ بۆی هەیە کە حاشا لەو منداڵە بکاو بڵێ: هەق دەزانم کە ئەم منداڵە لە من نیە: کە هەرگیز بە دەستی نەگرتبێ، یا بە دەستی گرتبێ بەڵام منداڵەکە بە کەمتر لەشەش مانگ لەدایك بووبێ، یا بە زیاتر لە چوار ساڵ لەدایك بووبێ!.

## شێوەی شەڕەنەفرین ئاوایە:

کاتێ کار گەیشت بە شەڕەنەفرین، ئەنجام دانەکەی ئاوایە: مێرد دەڵێ: شایەتی دەدەم بە خوداو خودا دەکەم بە شایەت کە لەم تۆمەتی داوێنپیسییەدا کە دەیدەم لە فیسارە کەسی ژنم، راست دەکەم و بوختانی بۆ ناکەم، وە ئەم منداڵە، یا ئەم کۆرپەلەی ناو سکی ئەم ژنە لە داوێنپیسییەو لە من نیە. دەبێ ئەم شەڕەنەفرینە بە فەرمانی فەرمانداری وڵات بێ، یا بە فەرمانی جێداری بێ، چونکە شەڕەنەفرین دادەنرێ بە سوێند، دەی گشت سوێندێ دەبێ بە فەرمانی قازی بێ کە جێداری فەرماندارە. وا باشە کە لەسەر مینبەریش بێ وە لەناو کۆمەڵێ موسوڵماندا بێ، چونکە ئەوە دەبێ بەهۆی گرنگی کارەکە، ئەوەیش

باشتر مەردوم چاوترسین دەکا. ئەگەر ژنەکەی لەوێ ئامادە نەبوو بەناوی خۆی ناوی دێنێ، لە هەمان کاتدا ناوی بنەچەیشی دێنێ هەتا لە کەسێکی تر جیا ببێتەوە، بەڵام ئەگەر ژنەکە لە کۆڕەکەدا ئامادە بوو ئەوەندە بەسە کە ئاماژەی بۆ بکا. جا مێرد چوار جار لەسەر یەك لەهەڵو مەرجێکی ئاوادا ئەم سوێندەی پێشەوە دەخواتو لەجاری پێنجەمدا دەڵێ:

شایەتی دەدەم بەخودا کە من راست دەڵێم لەوەدا کە دەیڵێم بە ژنەکەم، کە وەپاڵدانی حیزێتییە، لەعنەتو نەفرینی خودام لە سەربی ئەگەر درۆ بکەم لەم شایەتییەدا. چونکە دەقی قورئان لەسەر ئەم جاری پێنجەمە بەم شێوەیە هەیە. جا کاتێ مێرد گەیشتە سەر ئەم جاری پێنجەمە کە بۆ پیاو نەفرینو لەعنەتی وا تیادا، هەروا ژن کە گەیشتە سەر ئەم جارە کە بۆ ژن غەزەبی خودای تیادایە، سوننەتە بۆ قازی کەپێی بڵێ: ئەم جاری پینجەمە سزای هەردوو جیهان مسۆگەر دەکاو مایەی ریسوایی دینو دنیایە، لەبەر ئەوە لەخودا بترسەو ئەگەر دەزانی راست ناکەی وازبێنەو پێ لە راستی بنێ، چونکە بەراستی من مەترسی ئەوەم هەیە ئەگەر راست نەکەی لەعنەتو نەفرەتی خودا بۆ خۆت مسۆگەر بکەی. ئەم ئامۆژگارییە بۆ ئەوەیە کە پەشیمان ببنەوە، سوننەتە ئەم ئایەتەیان بۆ بخوێنێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – سورة آل عمران – ٧٧/٣} . هەروا گەرەکە کە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریشیان بەسەردا بخوێنێتەوە: هەر ژنێ بە درۆ منداڵێ بلکێنێ بە هۆزێکەوە، کە

لەوان نەبێ، ئەوە بەشی لەخودا بڕاوە، وە خودا نیباتە بەهەشت، وە هەر باوکێ حاشا لە منالی خۆی بکا، کە بە بەرچاویەوە بێو بچێ، ئەوە خودا لە رۆژی قیامەتدا خۆیی پێ پیشان نادا، وە لە بەرچاوی پێشینانو پاشینان تەریقی دەکاتەوە. لە گێڕانەوەیەکدا: لەبەر چاوی گشت دروستکراوانی خودا ریسوای دەکا. (ئەبو داوودو نەسائیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە. ئیبنو حیببان بە دروستی داناوە. دروست: ساخ: صەحیح).

## ئەنجامی ئەم شایەتییەی مێرد ئەم پێنج شتەیە:

**یەکەم**: حەددی بوختیانی لە کۆڵ دەکەوێ، بەپێی ئەم ئایەتە: (فشهادة أحدهم) واتە: حەددەکە لە کۆڵی دەکاتەوە. چونکە بەپێی رێزمانی عەرەبی وشەی (فشهادة) موبتەدایە، خەبەرەکەی مەحذووفە، تەقدیرەکەی ئاوایە: (فشهادة أحدهم.. تدرأ عنه الحد). بەلام وشەی (أربع شهادات) لە ئایەتەکەدا خەبەر نیە بۆ ئەم موبتەدایە، ئەو خەبەرە بۆ موبتەدایەکی تری مەحذووف، کە (هی)یە، تەقدیرەکەی ئاوایە: (هی أربع شهادات).

**دووەم**: حەددی داوێنپیسی لەسەر ژنەکە مسۆگەر دەبێ ئەگەر شەرەنەفرین نەکا، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: {وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ – سورة النور – ٢٤/٨}.

**سێیەم**: جوودابوونەوە لە نێوانیاندا مسۆگەر دەبێ. بەڵگەی ئەمەیش ئەوەیە: ژن‌و مێردێ لەسەردەمی حەزرەتدا شەڕەنەفرینیان کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەیەکی جیاکردنەوەو منالەکەی لکان بە دایکەکەوە! (بوخاری‌و موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویانەتەوە) (تەماشای تاجول ئوصولْ ب/ ٣ ل/ ١٦٩ بفەرموو – وەرگێڕ).

**چوارەم**: منداڵەکە دەبێ بەهی ژنەکەو لە منداڵی پیاوەکە دەردەچێ‌و بنەچەو نەسەب نامێنێ لە نێوانیاندا.

**پێنجەم**: بە ئێجگاری بۆ هەمیشە هەتا هەتایە ئەو ژن‌و مێردە لە یەکتری حەرام دەبن. بەپێی فەرموودەی خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) کە دەفەرموێ: هەر ژن‌و مێردێ شەڕەنەفرین ئەنجام بدەن ئیتر نابنەوە بە ژن‌و مێردی یەکتری! بەپێی ئەم فەرموودەیەی تریش، پیاوێکی عەجلانی شەڕەنەفرینی لەگەڵ ژنەکەی خۆی کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئیتر ئەم ژنە لەژنی تۆ دەرچوو، فرت پێوەی نەما. چونکە ئەگەر ئەم جیابوونەوەیە بە ئێجگاری نەبوایە پێغەمبەر ماوەکەی بەیان دەکرد، کە هەتاکەیە، هەر وەك لە ژنی سێ بەسێ تەڵاق دراودا ماوەکە بەیان کراوە بەم ئایەتە: (**حتى تنكح زوجا غيره**).

## شێوەی شەڕەنەفرینکردنی ژنەکە :

**ژنەکەیش دەڵێ :** شایەتی دەدەم بە خودا کە ئەم مێردەی منە درۆدەکاو من داوێنپاکم‌و بوختیانم بۆ دەکا. وە چوار جار ئەمە دووبارە دەکاتەوە، ئەو جا قازی ئامۆژگاری دەکا لەسەر شێوەی پێشەوە کە

باسکرا، ئەوجا لە جاری پێنجەمدا ژنەکە دەڵێ: خەشم‌و تووڕەیی‌و غەزەب‌و قاری خودا لەسەر من بێ ئەگەر ئەم مێردەی من راست بکا. ئەنجامی ئەمەیش ئەوەیە: حەددی داوێنپیسی لەکۆڵ ژنەکەیش دەکەوێ. بەپێی ئایەتی: {وَيدرا عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ} . ئەگەر مێردەکە لەوێ بوو ژنەکە ئاماژەی بۆ دەکا، ئەگەر لەوێ نەبوو بە جۆرێ ناوی دەهێنێ کە پێی بناسرێتەوە!.

## ٢٨٩) عیددە (العدة):

عیددە لە زماندا لە (عەدەد) وەرگیراوە، کە بە واتای ژمارەیە، چونکە زوربەی کات عیددە ژمارەی تیادایە. لە شەرعی شەریفدا برێتییە لە خۆراگرتنی ژن بەبێ مێرد لەبەر یەکێ لەم هۆیانە: هەتا بزانرێ کە منداڵدانی چۆڵەو خاڵییە لە منداڵ، یا لەبەر (تعبد)و خواپەرستی، یا لەبەر دەربڕینی تازێباری بەهۆی مردنی مێردەوە. بەوشەی (ژن) پیاو دەردەچێ، چونکە پیاو لە دوو حاڵەتدا نەبێ عیددەی لەسەر نیە:

**حاڵەتی یەکەم:** مێردێ ژنەکەی بە تەڵاقی رجعی تەڵاق بدا، وە بیەوێ ژنێکی خۆیی ئەو ژنە مارە بکا کە دروست نەبێ هەردوکیان بە یەکەوە ژنی بن، وەك خوشکی، یا پووری، ئەوە دەبێ ئەو مێردە چاوەڕوانی بکا هەتا عیددەی ژنەکەی تەواو دەبێ.

**دووەم:** مێردێ چوار ژنی هەبێ، یەکێکیان بە تەلاقی رجعی تەلاق بدا، ئەوەیش دروست نیە ژنێکی تر مارە بکا هەتا عیددەی ژنە تەلاقدراوە رجعییەکەی بەسەردەچێ. بە وشەی (هەتا بزانرێ کە منالدانی چۆڵە) ژنی مندالێ نا بالغ‌و نا ئومێدو ژنی بە دەست نەگیراوی مێرد مردوو و ژنی کوڕی مندڵو ژنی پیاوی چووك براو دەردەچێ، چونکە عیددەی ئەمانە بۆ پاکبوونەوەی منالدان نیە، بەڵکوو بۆ پەرستش‌و خواپەرستییە.

**عیددە چوار جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** بەرابوردنی سێ پاکیی وایە کە لە پێش‌و پاشیانەوە خوێنی بێنوێژی ببێ. ئەمەیش بۆ ژنێکە کە خاوەن بێنوێژیبێ‌و ئازادبێ، چونکە خوا دەفەرموێ: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ - سورة البقرة - ٢٢٨/٢} بەلام ئەگەر ژنەکە کە نیزەکی خاوەن بێنوێژیی بوو عیددەکەی دوو پاکییە، بەپێی فەرمایشتەکەی عومەر {رەزای خوای لێبێ} کە دەفەرموێ: عیددەی کەنیزەك دووپاکییە، لەبەر ئەوەیش کە کەنیزەك لە هەندێ شتدا نیوەی ژنی ئازادی بۆ هەیە، کە لێرەدا دەکاتە پاکی‌و نیوێ، بەلام نیو پاکییەکە دەکرێ بە یەك پاکی تەواو، چونکە پاکی زەحمەتە بەش بەش بکرێ، دەق وەك تەلاق، چونکە ژمارەی تەلاقی کەنیزەك نیوەی ژمارەی ژنی ئازادە، کە دەکاتە تەلاق‌و نیوێ، بەلام لەبەر ئەوەی کە تەلاق لەت لەت ناکرێ نیو تەلاقەکە دەکرێ بە تەلاقێکی تەواو. مەبەست لە پاکی

قورئه، كه وشه‌یه‌كی قورئانییه، كه برێتییه له پاكی یه‌ك له نێوانی دوو بێنوێژیدا.

جا ئه‌گه‌ر له‌كاتی پاكیدا ژنیٚ ته‌ڵاق درا، هه‌ر چه‌ند یه‌ك دقیقه له‌و پاكییه مابیٚ، عیدده‌كه‌ی ته‌واو ده‌بیٚ به ده‌ستكردن به بێنوێژی سێیه‌م، واته ماوه‌ی ئه‌و پاكییه داده‌نریٚ به پاكییه‌كی ته‌واو. به‌ڵام ئه‌گه‌ر له‌كاتی بێنوێژیدا ته‌ڵاق درا، عیدده‌كه‌ی ته‌واو ده‌بیٚ به ده‌ستكردنی به بێنوێژی چواره‌م. كه‌سیٚ پاكی ته‌واویان تیٚ ده‌كه‌ویٚ. ئه‌گه‌ر ژنه‌كه ده‌ستوورێكی رێكوپێكی بۆ بێنوێژیی نه‌بوو، وه گوتی عیدده‌م به سیٚ پاكی ته‌واو بووه، وه قسه‌كه‌ی رێی تیٚ ده‌چوو ئه‌وه باوه‌ڕی پیٚ ده‌كریٚ، خۆ ئه‌گه‌ر گومانی خراپی پیٚ برا گه‌ره‌كه كۆڵینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ بكریٚو سوێند بدریٚ ئه‌وسا باوه‌ڕی پیٚ ده‌كریٚ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ده‌ستوورێكی رێكوپێكی هه‌بوو به‌بیٚ سوێند به‌پێی ئاسایی باوه‌ڕی پیٚ ده‌كریٚ.

**جۆری دووه‌م:** ژنی منداڵو ژنی نائومێد (صه‌غیره‌و ئاییسه) ئه‌م جۆره ژنانه‌یش ئه‌گه‌ر ئازاد بوون عیدده‌كه‌یان سیٚ مانگی ته‌واوه، چونكه خوای گه‌وره ده‌فه‌رمویٚ: {وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ – سورة الطلاق – ٦٥/٤) واته: ئه‌و ژنانه‌تان كه‌بیٚ هیوا ده‌بن له حه‌یزو بێنوێژی له‌به‌ر پیری ئه‌گه‌ر نازانن عیدده‌یان چه‌نده‌ئه‌وه بزانن كه عیدده‌یان سیٚ مانگه، هه‌روه‌ها ئه‌و ژنانه‌یش كه له‌به‌ر منداڵی هێشتا نه‌كه‌وتوونه‌ته سه‌ر بێنوێژی.

ئەم جۆرە ژنانە ئەگەر ئازاد نەبوون عیددەیان مانگو نیوێکە. تەمەنی نائومێد بوون بۆ ژن لە بێنوێژیی، قیلێ دەفەرمویّ: پەنجا ساڵە، قیلیکیش دەفەرمویّ: شەست ساڵە، بەلام هەرە مەشهوور ئەوەیە کە شەستو دوو ساڵە.

وەکی تریش بۆ نائومێد بوونی ژن نائومێد بوونی ژنانی خەڵکی ولاتەکەی رەچاو دەکریّ، گوتیار (قیل)یّ دەڵیّ: نائومێد بوونی کەسوکاری دایكو باوکی رەچاو دەکریّ، ئەگەر ژنیّ خوێنی وشکی کردە خوای ئازادبی یا ئازاد نەبیّ، ئەوە دەبیّ خۆی بگریّ تا دەکەوێتەوە سەر بێنوێژی، ئەوکاتە بە چەند پاکییەك عیددەی تەواو دەبیّ، دەنا بە مانگ عیددە دەگریّ، نەفەقەی لەم ماوەدا بەردەوام دەبیّ، بە خۆراكو جلو بەرگیەوە هەتا دەکەوێتەوە بێنوێژی، یا دەگاتە تەمەنی نائومێدیو بیّ هیوایی لەسەر رای باوەڕپێکراو.

**جۆری سێیەم**: ژنی مێرد مردوو، ئەگەر ئازاد بیّ عیددەکەی چوار مانگو دەڕۆژە بە شەوەکانیەوە. چونکە یەزدانی پاك دەفەرمویّ: {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا – سورة البقرة – ٢/٢٣٤} واتە: ئەو پیاوە موسوڵمانانە کە دەمرنو ژنەکانیان لەپاش خۆیان بەجیّ دەهێڵن، دەبیّ ئەو ژنانە تا ماوەی چوار مانگو دەشەو چاوەڕوانی بکەنو لەو ماوەیەدا شوونەکەنەوە. بەلام ئەگەر ژنی مێرد مردوو کەینزەك بوو ئەوە عیددکەی نیوەی عەیددەی ژنی ئازادە، کە دەکاتە دوو مانگو پێنج رۆژ!.

**جۆری چوارەم:** ژنی دوو گیان (واتە: سکپڕ) خوای ئازاد بێ یا کەنیزەك بێ، عیددەکەی بە دانانی سکەکەیەتی، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ – سورة الطلاق – ٦٥/٤} واتە: وە ئەو ژنانەیش کەسکیان هەیە ئەوە ماوەی عیددەکەیان تا دانانی سکەکەیانە).

جا خوای سکەکە زیندووبێ یا مردووبێ، وە خوای پارچەیێ گۆشتی تەواوی ڕەسابێ، یا پارچەیێ گۆشتی ناتەواوی نارەسابێ، بەڵام نوطفەو عەلەقە دانانرێن بەسك نوطفە واتە: تنۆکە ئاوی باوك. عەلەقە: خوێنپارە. وە خوای مێرد مردووبێ یا مێرد زیندووبێ، چونکە ڕووکاری ئایەتەکە نیشانەی ئەوەیە، لەبەر ئەم فەرموودەیەی بوخاریش کە ئەمە پاڵفتەی واتاکەیەتی: هەندێ زانا دەیانفەرموو کە عیددەی ژنی مێرد مردوو بەدواهەمینی دوو عیددەکەیەتی.

**یەکەمیان:** بەپێی ئایەتەکەی بەقەرە چوار مانگو دە ڕۆژە.

**دووەمیان:** بەپێی ئایەتەکەی سوورەتی تەلاق ( کە گەلێ لەدوا بەقەرە هاتووە) بە دانانی سکەکەیەتی. جا کە ئەم قسەیە دەگاتەوە بە ئیبنو مەسعوود لەسەر ئەم شێوەیە ڕەخنەی لێ دەگرێ: چۆن وادەبێ؟ ئێوە ئەگەر سکەکەی باری گران بکاو عیددەکەی درێژ بکاتەوە بۆ زیاتر لە چوار مانگو دە ڕۆژ ئەوەی بۆ بڕیار دەدەن، کەچی ئەگەر سکەکەی بۆی ببێ بە بار سووکیو عیددەکەی لە چوار مانگو دە ڕۆژ کەمتر بکاتەوە، ئەوەی لێ قەبووڵ ناکەنو دەڵێن: دەبێ چوار مانگو دە ڕۆژ تەواو بکا؟! قسەی ڕاست ئەوەیە کە لە هەموو حاڵێکا عیددەی ژنی

سکپڕ، خوای مێرد مردوو بێ یانا، بە دانانی سکەکەیەتی، چونکە ئایەتەکەی سوورەتی تەڵاق لە دوا ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە هاتووە، واتە: مەبەستی ئیبنو مەسعوود ئەوەیە ئایەتی {الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ – ئايەتی – وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ} نەسخ دەکاتەوە. ئەمە پوچتەی مەبەست لەم فەرموودەیەیە، لە عەینیدا تەماشای سوورەتی بەقەرەو سوورەتی تەڵاق بکە (ج/١٨ ص ١٢٣ = ج ١٩ ص ٢٤٦). بەندە لێرەدا ئەم پرسیارە دەکەم: چۆن حەدیث ئاوا لە کتێبی شەرعدا نەقڵ دەکرێ: دانەر (رەحمەتی خوای لێبێ) لێرەدا ئاوا بەڵگە بەم فەرموودەیە دەهێنێتەوە: {ولما في البخاری عن ابن مسعود (رضی الله عنه) في المتوفي عنها زوجها وهی حامل قال: (اتجعلون عليها التغليظ ولا تجعلون لها الرخصة) فنزلت (وأولات الاحمال...)} !! ئەمە دەقی ئەم نوسخەیە کەوا لەبەر دەستی مندا (ج/٢ ص ١٨٩)، چونکە وشەی (فنزل) ئەوە دەگەیەنێ کە فاعیلی وشەی (قال)ە، پێغەمبەربێ، وە رستەکەی دواوەی قسەی حەزرەت بێ، بەڵام ئەمە وانیە، زەمیری (قال) دەگەڕێتەوە بۆ ئیبنو مەسعوود، وەك لە صەحیحی بوخاریدایە، دەی چۆن لە دوا وەفاتی پێغەمبەر ئەم رەخنەی ئیبنو مەسعوودە دەبێ بەهۆی هاتنی ئایەت؟. ئەمە دەقی ئەم حەدیثە دەسکاری کراوەیە: (عن محمد بن سيرين... فلقيت مالك بن عامر.. قلت كيف كان قول ابن مسعود في المتوفي عنها زوجها وهی حامل؟ فقال: قال ابن مسعود: اتجعلون عليها التغليظ ولا تجعلون لها الرخصة.. لنزلت سورة النساء القصرى – سورة

الطلاق — بعد الطولی — سورة البقرة). بڕوانە (عمدة القاری ج/١٨ ص ١٢٣) لە بەرگی نۆزدەی عومدەتولقاریشدا لە لاپەڕە (٢٤٦)دا ئاخری ئەم حەدیثە ئاوایە (علیها الرخصة لنزلت سورة النساء القصری — الطلاق — بعد الطولی واولات الاحمال اجلهن ان یضعن حملهن). خودا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدا لە هەڵەی گەورەو لە خۆلێبایی بوون — وەرگێڕ).

ئوبەیەی کوڕی کەعب (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بڕیاری ئەم ئایەتە {وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ} بۆ ژنێکە کە سێ جار تەڵاق درابێ، یا بۆ ژنێکە کە مێردەکەی مردبێ؟ فەرمووی: ئەم ئایەتە بۆ هەردوولایانە (ئەحمەد/ دارە قوطنی) زوبەیری کوڕی عەوام (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: ئوممو کولثوومی کچی عقبە ژنم بوو، دووگیان بو، پێو مانگی خۆی بوو، پێی گوتم: یەك تەڵاقم بدەو بیکە بەمایەی دڵخۆش بوونم، منیش یەك تەڵاقمداو ئەوجا چووم بۆ مزگەوت بۆ نوێژ، کە هاتمەوە ئوممو کولثووم سکەکەی دانابوو (واتە: بائین بوو بوو بە بەینوونەی صوغرا — وەرگێڕ) جا لە تاوانا گوتم: ئای ئەم ژنە چۆن خەڵەتانمیو دەستی بڕیم خوا تۆڵەی ئەم فێڵەی لێ بکاتەوە! لە پاشا چووم بۆ خزمەتی حەزرەتو باسەکەم عەرزی کرد، فەرمووی: تازە کار لەکار تەرازاوە، نامەی خوا حوکمی مەسەلەکەی بڕیوەتەوە، کە ئەوەیە عیددەی دووگیان بە دانانی سکەکەیەتی. کەواتە دووبارە خوازبینی بکەرەوە بۆ خۆت، ئەگەر رازی بوو لە خۆتی مارەبکەرەوە، دەنا تازە لە ژنی تۆ دەرچووە!.

ئوممو سەلەمە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: سوبەیعەی ئەسلەمییە، لەپاش مردنی مێردەکەی، بەچەند شەوێ منداڵی بوو، وە ئەمەی باس کرد بۆ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرمووی: دەتوانی شووبکەیتەوە. (بوخاری) لە گێڕانەوەیەکدا: لە دوا مردنی مێردەکەی بە نیومانگ منداڵی بوو.

عومەریش دەفەرموێ: ئەگەر تەرمی مێردەکەی لەسەر تاتەشۆربێ سکەکەی دابنێ، مارەی دێ لە مێردی نوێ! چونکە عیددەی تەواو بووە.

مەرجە کە سکەکە بەری چوونەلایەکی رەوابێ، یا هی چوونەلای شوبهەبێ. بەڵام منداڵی زۆرڵ بۆ عیددە رۆڵ نابینێ، چونکە ئاوی داوێنپیسی بێرێزە.

تەڵاقدراوی بەدەس نەگیراو، چ کچبێ چ بیوەژن، عیددەی نیە، بەپێی ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا - سورة الأحزاب - ٤٩/٣٣} واتە: ئەی کەسانێ کە خاوەن باوەڕو ئیمانن! کاتێ ژنانی موسوڵمانتان مارەکرد بۆ خۆتان، وە لەپێش ئەوەدا کە بچنە لایان تەڵاقتان دان، ئەوە هەقی عیددەتان بە سەریانەوە نیە تا حلێبی بکەن لە سەریان).

## ٢٩٠) منالّدان پاك كردنەوە (الاستبراء):

پاك سازی منالّدان بە عەرەبی پێی دەگوترێ: ئیستیبراء، ئیستیبرایش لە زمانی عەرەباندا واتە: داوای پاكیو پاكڕاگرتن، لە شەرعیشدا بریتییە لەوە كە كەنیزەك لەكاتی گۆڕینی خاوەنیدا ماوەیەكی دیاریكراو چاوەڕوانی بكاو ئاغای نوێی دروست نەبێ لەگەڵی هەتا منالّدانی پاك ببێتەوە لە ئاوی ئاغای كۆنی، بە نیازی خواپەرستی. سەر بەلّگەكەی ئەم فەرموودەیەی حەزرەتە {دروودی خوای لەسەربێ} كە لە بارەی ژنە تالانییەكانی هۆزی ئەوطاسەوەیە: كەنیزەكی سكپڕ نابێ خاوەنی بڕواتە لای، هەتا سكەكەی دادەنێ. كەنیزەكی قسریش هەتا یەك بێنوێژی تەواودەكا (ئەبو داوودو كەسانی تر گێڕاویانەتەوە).

### هۆی پاكسازی منالّدان (دووشتە):

**یەكێكیان**: پەیدابوونی خاوەنێتییە لە كەنیزەكدا، ئیتر چ بەهۆی كەلەپوور گرتنەوە ئاغاكەی بووبێ بە خاوەنی، وە چ بەهۆی كڕینو پێبەخشینو راسپیریو دیل كردنەوە بووبێ بە ئاغای، ئیتر خوای كەنیزەكەكە منداڵ بێ، یا گەورەبێ، قسربێ یا سكداربێ، كچ بێ یا بێوەژن بێ، وە خوای لەوەوپێش پاك سازی منالّدانی كردبێ یانا، وە خوای خاوەنی پێشووی پیاو بووبێ یا ژن بووبێ، زەلام بووبێ یا كوڕێكی منداڵ بووبێ چونكە فەرموودەكەی ژنە دیلەكانی غەزای هۆزی ئەوطاس گشتایەتی دەگەیەنێ. وەكی زانراویشە ئەو ژنانە ژنی هەمە جۆریان تیادا بووە، كچو ژنو بێوەژنو پیرەژنیان تیادا بووە.

جا سەرنج دەدەین: ئەگەر کەنیزەکەکە خاوەن بێنوێژی بوو منداڵدانی بە یەك بێنوێژی پاك سازی دەکا، گوتیارێکیش دەڵێ: بە یەك پاکی، چونکە عیددەی ژنی کەنیزەك بەیەك پاکییە، ئەمیش وەکوو ئەو، بەڵام ئەگەر خاوەن بێنیوێژی نەبوو، لەبەر منالی یا نائومێدی، دوو راهەیە، قیلێ دەڵێ: بەسێ مانگ خۆی پاك سازی دەکا، قیلێ تر دەڵێ: بەپێی فەرموودەکە بە یەك مانگ. ئەگەر دوو گیانیش بێ ئەوە خۆی پاك سازی دەکا بە دانانی سکەکەی، چونکە فەرموودەکە بەڵگەی گشتایەتییە لەم بارەیەوە.

**هۆی دووهەم:**

بۆ پێویستبوونی پاکسازیی منداڵدان نەمانی خاوەنێتییە لە کەنیزەکی بە دەستگیراودا، کە بەهۆی ملکایەتییەوە ئاغاکەی چووبێتە لای، خوای نەمانەکەی بەهۆی مردنی ئاغاکەیەوەبێ یا بەهۆی ئازاد بوونی خۆیەوە بێ، جا گەرەکە منداڵدانی پاکسازی بکا، چونکە خاوەنی نوێن نەماوە، ئەگەر کەنیزەکی خاوەن مانگ بێ پاکسازییەکەی بەیەك مانگە، بەیەك بێنوێژییە ئەگەر خاوەنی بێنوێژی بێ، بەهیچ جۆرێ دروست نیە بدرێ بە شوو لەپێش پاکسازی منداڵدانیدا، بەڵام لە پێش ئەوەدا فرۆشتنی دروستە.

## ٢٩١) مافی ژنی عیددەگر:

ژنی عیددە گر چەند جۆرە، یەکێکیان ژنی تەڵاقدراوی رجعییە، ئەم ژنە لە ماوەی عیددەکەیدا هەقی ژێوارو جێگای دانیشتنی هەیە بە یەکدەگری‌و، بەپێی ئەم فەرمایشتەی (درودی خوای لەسەربێ): هەر ژنێ لە عیددەی تەڵاقی رجعیدا بێ، مافی ژێوارو نیشتەمەنی هەیە. (دارە قوطنی‌و نەسائی).

**یەکێ تریان:** ژنی تەڵاقدراوی جیاوەبووە، خوای جیاوەبوون (بەینوون)ەکەی بە خولع، یا بەهۆی سێ تەڵاقەوەبێ، ئەم ژنە بەس مافی جێگای دانیشتنی هەیە، خوای سکپڕ یا قسربێ، بەپێی ئایەتی {أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ - سورة الطلاق - ٦/٦٥} واتە: ئەو ژنە تەڵاقدراوانە تا لە عیددەدان دایان بنێن لەو شوێنانەدا کە خۆتانی تیادا دادەنیشن، بەپێی دارایی‌و تەوانایی خۆتان) وە بەپێی ئەم ئایەتەی تریش {لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ - سورة الطلاق - ١/٦٥} واتە: ئەو ژنە تەڵاقدراوانە لە هۆدەو ماڵی شەرعی خۆیان دەرمەکەن، تا عیددەکەیان تەواو دەبێ، نابێ خۆشیان لە هۆدەو ماڵی خۆیان دەرچن، مەگەر کارێکی نابارى ناشیرینیان لێ دەربکەوێ. بەڵام هەندێ زانا دەفەرموون: ئەم جۆرە ژنەیش دیسان هەقی ژێوارو نشیمەنیان هەیە، چونکە زانراو لە رێبازی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەوەیە: لەهەر شوێنێ نشیمەن پێویست بێ ژێواریش پێویستە.

**ژنێکیش**: کە لە عیددەی مردنی مێرددابێ مافی نشیمەنی هەیە، چونکە کاتی مێردەکەی فورەیعەی کچی مالیك کوژرا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: لەماڵی خۆت بمێنەرەوە وەك خودا دەفەرموێ: {حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ – سورة البقرة – ٢٣٥/٢} واتە: هەتا ئەو ماوەی بۆ عیددە پێویستە دەگاتە کۆتایی. فورەیعە دەیگوت: ئیتر چوار مانگو دە رۆژ عیددەم گرت.

بەڵام ژنی تەلاقدراوی نافەرمان (ناشزە) نەهەقی نشیمەنو نە هەقی ژێواری هەیە، چونکە ژنی نافەرمان ئەگەر لە ژێر رکیفی ژنو مێردایەتیش دابێ ژێوارو نشیمەنی ناکەوێ، ئیتر چۆن بە تەلاقدراوی ژێوارو نشیمەنی بۆ هەیە. قازی حوسین وا دەفەرموێ {رەحمەتی خوای لێبێ}.

## ٢٩٢) پێویستبوونی تازێباریو رەشپۆشی بۆ ژنی مێرد مردوو لە ماوەی عیددەکەیدا:

(احداد) لە زماندا بەکار نەهێنانی تیغی تیژ بۆ لابردنی موو، لە شەرعا برێتییە لە نەکردنی ئەو شتانە کە دەبن بەهۆی خۆرازانەوەو خۆئارایشکردن، وەك پۆشینی جلو بەرگی جوانو لەبەرکردنی خشڵو بەکارهێنانی بۆنی خۆش!.

ئەم رەشپۆشییە پێویستە لەسەر ژنێ کە لە عیددەی مێرد مردندابێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر ژنێ باوەڕی بە خوداو بە رۆژی داوایی هەیە دروست نیە بۆی کە لەسێ رۆژ

زیاتر ماتەم بگری بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە دەبێ ئەو چوار مانگو دە شەو تازێباربێ. لەو ماوەیەدا نابێ جلو بەرگی رەنگین لەبەربکا، مەگەر بەرگێ کە لە پێشا رەنگ کرابێو لە پاشا چنرابێ، یا چاو برێژێ، یاخۆی بۆن خۆش بکا، ئەوەندە هەیە لەو ماوەیەدا کە لە بێنوێژی پاك دەبێتەوە کەویستی خۆی بشۆرێ رێگەی ئەوەی پێدەدرێ کە بەقەد پێویست عوودو گولاو نەختێ بۆ وانێك بەکار بێنێ (شەیخان).

هەموو جۆرێکی خشڵ، زێرِبێ یا شتی تربێ، پۆشینی دروست نیە، بۆنی خۆشیش نەبۆ جەستەو نەبۆ جل نابێ بەکار بهێنێ، هەروەها خەنەو شتی وایش نابێ بەکار بهێنێ، بەڵام نەخشاندنو رازانەوەی نوێنو پێخەف دروستە، هەروەها کەرەستەی ناو ماڵ، هەروا دروستە کە پاك خۆی بشۆرێ، سەرو لەشی بشۆرێ، سەری شانە بکا، نینۆکەکانی بکا، چڵكو پیسایی لە خۆیو لەجلو بەرگی دووربخاتەوە، چونکە ئەمانە دانانرێن بە ئارایشتو خۆ جوانکردن. بەپێی ئەم فەرموودەیە دروستە کەسێ رۆژ یا کەمتر تازێباری بگیرێ بۆ کەسانی تر جگە لە مێرد.

**بزانە:**

کە پێویستە لەسەر عیددەگر، کە لەماڵ دەرنەچێ وە دروست نیە بۆ کەسێ تریش کە بە زۆر لەماڵ دەرێ بکا، بەپێی ئایەتی: {لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ} مەگەر بۆ کاری پێویست، ئەوە

دروسته له ماڵ دەربچێ، وەك ئەوە ترسی له خۆی یا لەماڵی هەبێ، لەمەیشدا عیددەی مێرد مردن و عیددەی تەلاق وەك یەكە.

نادروسته بۆ مێرد كە لەگەڵ ژنی عیددەگردا دابنیشێ، مەگەر له عیددەی تەلاقی رجعیدابێ، چونكە ئەوە سەر دەكێشێ بۆ كۆبوونەوەی دوو بە دووی دوو كەسی نامەحرەم، شتی وایش قەدەغەیە، بەلاّم ژنی رجعی درسته لەگەڵیدا دابنیشێ.

## ٢٩٣) شیر خواردن (رضاع):

رەضاع له عەرەبیدا ناوە بۆ مژینی مەمك و خواردنەوەی شیرەكەی، له شەرعی شەریفدا ناوە بۆ دەرخواردانی شیری ژنێ بۆ منداڵێكی ساوا لە تەمەنێكی دیاریكراودا.

سەر بەڵگەی ئەم باسە نامەی خوداو رێگەی رەهبەرو یەككگرتنی نەتەوەیە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ - سورة النساء - ٢٣/٤}.

عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرچی بەهۆی خزمایەتی و زاوزێ حەرام ببێ بەهۆی مەمكخوادرنیشەوە حەرام دەبێ (شەیخان).

**هۆی حەرام بوون:**

بۆیەكا مەمكخوادن دەبێ بەهۆی حەرامبوون چونكە شیرەكە بەشێكە له لەشی شیردەرەكە، كە منداڵەكە دەیخوا دەبێ بە بەشێ لە

لەشی ئەویش جا دەق وەك تۆماوی ژنەكەی لێ دێ كە منداڵەكەی لێ دروست دەبێ! ئیتر ئەو هۆیە دروست دەبێ كە مایەی حەرام بوونە، كە برێتییە لە بە عزییەت، واتە: پارچەیێ لە دایەنەكە دەبێ بە پارچەیێ لە شیرە خۆرەكە، جا هەرچی بەهۆی هاوبنەچەییەوە پەیدا دەبێ بەهۆی مەمكخواردنیشەوە پەیدا دەبێ، وەك حەرامبوونی مارەكردن‌و شووپێكردن بە ئێجگاری، وەك دروست بوونی تەماشاكردن‌و دانیشتن پێكەوە دوو بە دوو، دەستنوێژ نەشكان لە یەكتری، بەلام لەبەر ئەوەی كە شیرخواردن بێ هێزترە لە پەیوەندی هاوبنەچەیی، هەموو بڕیارەكانی هاوبنەچەیی پێ ناچەسپێ، وەك كەلەپوور لە یەك گرتن‌و ژێوارو ئازادبوون بەهۆی ملكایەتییەوەو نەكوشتنەوەو قەبووڵ نەكردنی شایەتی!.

واتە: دایەن‌و منالی شیری كەلەپوور لە یەكتر ناگر، ئەگەر یەكێكیشیان بوو بەملكی ئەوی تریان ئازاد نابێ، بەلام دایك‌و باوك ئەگەر بوون بە ملكی منداڵی خۆیان ئازاد دەبن، ئەگەر دایەن‌و منداڵە شیرییەكەی یەكێكیان ئەوی تریانی كوشت دەكوژرێتەوە لە جیاتی، بەلام باوك‌و دایك لە تۆڵەی منداڵی خۆیاندا ناكوژرێنەوە، دایەن‌و منداڵی شیری شایەتییان بۆ یەكتر قەبووڵ دەكرێ، بەلام شایەتی منال بۆ باوك‌و دایك یا بە پێچەوانەوە رەد دەكرێتەوە.

## شیردانی حەرامكەر ئەم سێ بنیاتەی هەیە:

**بنیاتی یەكەم:** شیردەرە، كە پێشی دەگوترێ دایەن، مەرجەكەی ئەوەیە: ژن بێ‌و زیندووبێ‌و تەمەنی لە نۆ ساڵ كەمتر نەبێ، چونكە ژن

لەم تەمەنەوە دەگونجێ کە منداڵی ببێ، شیردانیش وەك بنەچەیی (نەسەب) وایە بەڕێتێچوون (احتمال) سەر دەگرێو ڕۆڵ دەبینێ.

**بنیاتی دووەم:** شیرە، مەرجی ئەمەیش ئەوەیە شیری ژنی زیندووبێ، وە منداڵەکە پێنج جار شیری ئەو ژنەی خواردبێو هەر پێنج جارەکە شیرەکە گەیشتبێتە ناو گەدەو بۆشایی لەشی، وە لە سەرەتای جاری پێنجەمی شیر خواردنەکەوە تەمەنی لە دوو ساڵ کەمتربێ! دەنا کاری گەرنابێ، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: شیر خواردن کاتێ مبێ بەهۆی حەرام بوون کە تەمەنی منداڵ لە دوو ساڵ کەمتربێ (بەیهەقی) لە گێڕانەوەیەکی تیرمیذیدا: شیر خواردن کاتێ دەبێ بەهۆی حەرام بوون کە لە مەمکەوە بڕواتە ناو ڕێخۆڵەوەو ریخۆڵەکان کش بێنێو گەشە بە لەش بدا. ئەمەیش کاتێ ڕوودەدا کە هێشتا منداڵ لە شیر نەبڕابێتەوە! تیرمیذی {ڕەحمەتی خوای لێبێ} دەفەرموێ: فەرموودەیەکی ساخی دروستە.

هەرکاتێ منداڵ گەیشتە تەمەنی دوو ساڵ، یا پتر شیر کاریگەری نامێنێو نابێ بەهۆی قەدەغەبوون، چونکە عائیشە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جارێ پیاوێ لەلام دانیشتبوو حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لەوکاتەدا تەشریفی هات بۆ لام، کە ئەمەی دی لەبەری گران بوو، تەماشای دەموچاویم کرد تووڕە بوو، جا عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برای شیریمە بێگانە نیە، پێت ناخۆش نەبێ. فەرمووی: باش سەرنج بدەن لە براو خوشکی شیریتان، چونکە مەمکخواردن کاتێ حەلە، کە لەکاتی ساواییدابێ، کە لەبەر برسێتیبێ. (شەیخان).

دەی ئەم فەرموودەیە ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە کە شیر کاتێ دەبێ بەهۆی حەرامبوون کە خۆراکی سەرەکی ساوابێ، دیارە کە گەورەکاری بەشیر خواردن لە مەمکی ژن نیە.

**بنیاتی سێیەم**: شیرە خۆرە، مەرجی ئەمیش ئەوەیە کە زیندووبێو شیرەکە لە ڕێگەی مژینەوە بە دەم، یا لە ڕێگەی دۆشینەوە کە بە مەمییە بیخوا، یا لە ڕێگەی تکاندنە ناو لووتیەوە بگاتە ناو بۆشایی گەدەی، بەڵام ئەگەر بەشاف منداڵەکە هەڵی بگرێ کاریگەر نییەو ڕۆڵ نابینێ.

**مەرجی شیر خوادرنی قەدەغەکەر:**

**ئەوەیە کە لە پێنج ژەم کەمتر نەبێ، بە پێی چەند بەڵگەیێ:**

**یەکەم**: عائیشە {ڕەزای خوای گەورەی لێبێ} دەفەرموێ: لە پێشدا ئەمە ئایەتی قورئان بوو: (**عشر رضعات معلومات يحرمن**) دە ژەم مەمکخواردنی دیاریکراو شیردەرو شیرەخۆرە لە یەکتر حەرام دەکەن) لە دواییدا ئەم دەژەمە هەڵوەشایەوەو بووبە (**خمس رضعات معلومات يحرمن**) پێنج ژەم مەمکخواردنی دیاریکراو شیردەرو شیرخۆر لە یەکتری قەدەغە دەکەن) لە دوادواییدا ئەمەیش لە تیلاوەتدا نەسخ بۆوە، بەڵام بڕیار (حوکم)ەکەی هەرماوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} گیانی پاکی سپارد هێشتا هەندێ کەس بەم نەسخ بوو نەوەیان نەزانیبوو، لەبەر ئەوە تا ماوەیەکیش ئەمەیان بە ئایەتی نەسخ نەکراوی قورئان دەزانیو، لەکاتی دەورکردنەوەی قورئاندا دەوریان دەکردەوە (موسلیمو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە).

**دووەم:** پشتگیری ئەم رایە دەکا هەندێ گێرانەوەی داستانەکەی سەهلە، کە عائیشە {رەزای خوای لێبێ} داستانەکە ئاوا دەگێڕێتەوە: سەهلەی کچی سوهەیل کە خێزانی حوذەیفە بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} عەرزی کرد: قوربان! سالم گەورە بووەو بووە بە پیاو، وەك پیاو لە هەموو ستێ حالّی دەبێ، بەهۆی پەیوەندی کۆمەلایەتی نێوانمانەوە هاموشۆی مالّمان دەکا، بەزەینم ئەبو حوذەیفەی مێردم ئەم هاموشۆیەی لەبەر گرانە.

پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: مەمکی پێ بدە دەبێ بە کوڕی شیریت‌و تۆی لێ حەرام دەبێ. (موسلیم) لە هەندێ گێڕانەوەدا: پێنج جار مەمك بدە بە سالم ئیتر تۆ دەبی بە دایکی شیری بۆی‌و لێی حەرام دەبی.

**سێیەم:** لە فەرموودەیەکی موسلیمدا دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: بە ژەمێ یا بە دوو ژەم شیر خواردن، یا فەرمووی: بە مژێ یا بە دوو مژ مەمکخواردن ژن‌و پیاو لەیەك حەرام نابن‌و قەدەغەبوونی شیریی دروست نابێ.

**چوارەم:** لەسەر ئەم بنیاتەو لەبەر هۆی زۆری تر ئەم پێشەوا گەورانە پێنج ژەم لە شیر خواردنی حەرامکەردا بە مەرج دەگرن: ئیبنو مەسعوودو عائیشەو عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو عەطاو طاووس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عوروەی کوڕی زوبەیرو لەیثی کوڕی سەعدو شافیعی‌و ئەحمەدو ئیسحاق‌و ئیبنو حەزم‌و کۆمەڵێ زانای گەورەی تر، وەك ئیمامی عەلی‌و ئەوەوی {رەزای خودا لە هەموویان بێ}.

بەڵام جاماوەری زاناکان رایان وایە: هەر ئەندازەیێ شیر با کەمیش بێ دەبێ بەهۆی قەدەغەکردن، بە مەرجێ بگاتە ناو بۆشایی. ئەبو حەنیفەو مالیك (رەزای خودای گەورە لە هەموویان بێ) لەسەر ئەم رایەن، بەڵگەیان ئەم ئایەتەیە: {وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ} تا کۆتایی. ئەمەیش ئەوە دەخوازێ کە ئەوەی پێی بگوترێ شیر پیدان کەمو زۆری چونیەکە.

## بزانن:

ئەگەر شیردەر گومانی هەبوو کە پێنج یا کەمتر شیری داوە بە منداڵەکە، یا ئایا شیرەکە گەیشتۆتە ناو گەدەی یانا؟ ئەوە نابێ بەهۆی حەرام بوون، ئەوەندە هەیە لەکاتی وادا وەرع زۆر سوننەتە، وەرع ئەوەیە: موسوڵمان هەتا بۆی بکرێ توخنی شتی گومان لێکراو نەکەوێ. هەروا ئەگەر هەق دەیزانی کە پێنج ژەم شیری پێداوە، بەڵام گومانی لەوەدابوو کە تەمەنی منداڵەکە لەو حەلەدا لە دوو ساڵ کەمتر یا زیاتر بووە ئەوەیش نابێ بەهۆی قەدەغەبوون، چونکە بنەڕەت نەبوونە، یا بڵێین: بنەما نەبوونە، ئەصلْ عەدەمە.

## کاتێ کە شیردان هاتەجێ:

منداڵەکە دەبێ بە منداڵی شیری ئەو ژنو پیاوە کە شیرەکەیانی خواردووەو ئەبن بە مەحرەمی یەکتری، ئەو حەرامییەی کە بەهۆی شیردانەوە پەیدا دەبێ، لەژنو پیاوەکەوە دەڕواو دەتەنێتەوە بۆ باوكو دایكو باپیرو نەنکیان ( کە بەمانە دەگوترێ: ئوصول، واتە: بنەچەو

رەسەن) هەروا دەتەنێتەوە بۆ منالّو منالّەزایشیان (کە بەمانە دەگوترێ وەچەو نەوە) هەروا دەتەنێتەوە بۆ براو خوشکیشان (کە بەمانە دەگوترێ دەوروپشت، واتە: حەواشی) وە لە شیرەخۆرەکەوە هەر دەڕوا بۆ لای منالّو منالّەزای، ناتەنێتەوە بۆ بنەچەیو وەچەی بنەچەیو دەوروپشتی).

**واتە**: شیر دەرەکە دەبێ بە دایکی منالّەکەو مێردەکەی دەبێ بە باوکی، بەپێی ئەم بەلگەیە: عائیشە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لەپاش هاتنی ئایەتی حیجاب، ئەفلەحی برای ئەبولقوعەیس داخوازی کرد کە بێ بۆ سەردانم، منیش گوتم: بەخودا ڕێگەی سەردانی پێنادەم هەتا لە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەپرسم، خۆ من شیری ئەم پیاوەم نەخواردووە، من شیری ژنەکەی ئەبولقوعەیسم خواردووە، جا کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هات بۆ لام گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ من شیری ئەم پیاوەم نەخواردووە، من شیری ژنەکەی ئەبولقوعەیسم خواردووە، ئیتر چۆن دایبنێم بە خۆیی؟ فەرمووی: کچێ! عەمرت نەمێنێ ڕێگەی پێ بدە کە بێ بۆ دێنیت، چونکە مامی شیریتە. لەوەدوا عائیشە دەیفەرموو: هەرچی بەهۆی بنەچەوە واتە: بەهۆی نەسەبەوە، حەرام ببێ بەهۆی شیر خواردنیشەوە حەرام دەبێ. ئەوەتا لەم فەرموودەیەدا ئەمەروون دەبێتەوە: ئەبولقوعەیس دەبێ بە باوکی شیری عائیشە، چونکە مێردی شیردەرەکەیەتی، ئەفلەحی برایشی دەبێ بە مامەی شیریی عائیشە، چونکە برای باوکی شیری عائیشەیە.

## ٢٩٤) ژێوارو پێویستکەری:

نەفەقە (کە بە کوردی پێی دەگوترێ: ژێوار) لە ئینفاق وەرگیراوە، کە برێتییە لە ئیخراج، واتە: دەرکردن، بەڵام دەرکردنی باش، وەك ئەوە دەگوترێ: زەکات دەردەکا، بەهۆی سێ شتەوە ژێوارو نەفەقە لەسەر مرۆڤ پێویست دەبێ: خزمایەتیو ملکایەتیو ژنێتێ.

**هۆی یەکەم**: کە خزمایەتییە ژێوار پێویست دەکا لەسەر خزم بۆ خزم، وەکوو یەك لە هەردوو سەرەوە بەپێی یاسای شەرع، چونکە کۆمەڵەی خزم لەناو خۆیاندا سەرو قنگی یەکترینو خوێنیان تێکەڵەو پارچەی یەکترینو دڵسۆزی یەکترین، ئەمە لە لایەك، دەقی ئایەتی قورئانیش لەسەر ئەمە هەیە کە دەفەرموێ: {وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ - سورة الأنفال - ٨/٧٥} واتە: ئەوانەی کە خزمو خۆێشی یەکترینو رشتەی خۆێشایەتی لە نێوانیاندا هەیە، ئەوانە لە پێشترن بۆ یەکتری بە پێی یاسای قورئان، هەتا کەسێکی تری بێگانە) (دانەر - رەحمەتی خودای لێبێ) لە پەراوێزدا ئاماژە بۆ ئایەتی شەشەم دەکا لە سوورەتی ئەحزاب، بەڵام ئەم ئایەتەی ئەحزاب (اخص)ترە لە ئایەتەکەی ئەنفال کە من ئاماژەم بۆی کرد، چونکە لە ئەحزابا (مفضل علیە) گوتراوەو دیاری کراوە، کە ئەمەیە: {مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ - سورة الأحزاب - ٣٣/٦} بەڵام لە ئەنفالدا موقەددەرە، کە ئەمەیە: (من الاجانب) کەواتە: بەلگە سازی بە ئایەتەکەی ئەنفال لەبار ترە، چونکە دانەر خۆشی ئاماژە بۆ گشتایەتی (مفضل) و (مفضل علە) لە مەسەلەکەدا دەکا. ئەم وردەکارییە بۆ کەسی خۆی زۆر بە سوودە - وەرگێڕ).

جا لەسەر ئەم بنیاتە ژێوار پێویستە لەسەر مرۆڤ بۆ خۆیو بۆ باوكو دایكو بۆ منداڵو منداڵەزاو بۆ كەسانی تریش وەك نەنكو باپیرەو بەرەو ژوورتریش، وەك منداڵی منداڵەزاو بەرەو خوارتریش، لەمەدا جیایی نیە لە نێوانی خزمی نێرینەو خزمی مێیینەدا، هەروا جیاوازی نیە لە نێوانی خزمی نزیكو دووردا، یا خزمی كەلەپوور گرو كەلەپوور نەگردا، هەروا فەرق ناكا دینیان یەك بێ یا دینیان جیا جیا بێ. ئەوەندە هەیە بۆجێبەجێكردنی ئەم بەرنامەیە یاسایەكی دامەزراو هەیە، لە كتێبە گەورەكانی شەریعەتدا بە درێژی باسكراوە.

## بەڵگەی پێویستبوونی ژێواری بنەچە لەسەر وەچە :

ئەم ئایەتو حەدیثانەیە: خوای گەورە دەفەرموێ: (**وصاحبهما في الدنیا معروفا – لوقمان**) واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان كردووە كە زۆر باشبێ لەگەڵ دایكو باوكو نەكو باپیریدا) وە هەروا دەفەرموێ:
{**وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا – سورة الأحقاف – ١٥/١**}.

پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: منداڵی پیاو بەشێكە لە كاسپیی ئەو، لە كاسپییە پاكەكەیشی، كەوابوو لەكاتی پێویستدا لە ماڵیان بخۆن (ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی) لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێ:پیاوێ هاتە لای خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا! من بەشی خۆم ماڵو منداڵم هەیە، وە باوكیشم پێویستی بە ماڵەكەم دەبێ؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: خۆشتو ماڵەكەشت ماڵی باوكتن! •ئەبو داوود بە رشتەیەكی جوان گێڕاویەتەوە)

لـه فەرمووده‌یـه‌کی تـردا حـه‌زره‌ت {دروودی خوای له‌سه‌ربێ} ده‌فـه‌رموێ: منـاڵ خه‌ڵاتی خودایه‌، مـاڵی منـاڵ ماڵی خۆتانـه لـه‌کاتی پێویـست دا. ئایـه‌تی: {مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ} به‌ڵگه‌یـه له‌سـه‌ر ئـه‌وه کـه منـداڵ به‌شێکه له کاسپیی باوکی[1]. بزانن باپیرو نه‌نك بڕیاری بـاوك‌و دایکیـان هه‌یه‌و له‌م بڕیاره‌دا ده‌بن به پاشکۆی ئه‌وان، ئه‌گه‌ر به‌ر عوموومی واتـای باوکایه‌تی‌و دایکایه‌تیش نه‌که‌ون، هه‌روه‌ك چۆن لـه‌م بابه‌تانـه‌ی تریـشدا ده‌بن به پاشکۆی ئه‌وان، واته: له بابه‌تی ئازاد بوون‌و تۆڵه‌ی کوشـتنه‌وه‌و شتی تری له‌م چه‌شنه‌، چونکه خوێن تێکه‌ڵن‌و دڵسۆزن بۆ یه‌کتری.

ژێواری باوك‌و دایك‌و بنه‌چه له‌سه‌ر منداڵ‌و وه‌چه‌ی خۆیـان بـه چه‌ند مه‌رجێ پێویست ده‌بێ:

**یه‌که‌م**: ئـه‌و که‌سـه‌ی کـه ژێواره‌که‌ی ده‌که‌وێتـه سـه‌ر زیـاد لـه ژێـواری خـۆی‌و خێزانـی شـتێکی ببـێ لـه رۆژی سـه‌رفی ژێواره‌که‌دا، جا ئه‌گـه‌ر هـیچ لـه مه‌سـره‌فی خـۆی‌و خێزانـی نه‌مایـه‌وه داده‌نـرێ بـه ده‌سته‌نگ له‌به‌ر ئه‌وه هیچی له‌سه‌ر نابێ. هه‌رشتێ بۆ دانه‌وه‌ی قه‌رز بـه زیاده دابنرێ‌و قـازی بیفرۆشـێ بـۆ ئـه‌و مه‌به‌سـته هـه‌مان شـت بـۆ دانـی ژێـواریش ده‌فرۆشـرێ، وه‌ك زه‌وی‌و زارو شـتی وا، چـونکه ژێـوار مـافێکی سامانییه‌، بێ وه‌جه‌ڵه‌و شـتی تـر برێتـی ناکـه‌وێ، که‌واتـه ده‌ق لـه قـه‌رز

---

[1] چونکه مه‌به‌ست ماڵه‌که‌ی‌و عوتبه‌ی کوڕیه‌تی، که له ڕێگه‌ی شام به به‌رچاوی کاروانییه‌که‌وه شێرخواردی.

- وه‌رگێڕ -

دەكا. لەسەر بڕیاری فەرموودەی دروست وەچەو نەوە ئەگەرماڵیان نەبوو بەڵام توانای كاسپییان هەبوو داوایان لێ دەكرێ كە كاسپی حەڵاڵ بەپێی تواناو شانی خۆیان بكەنو ژیوار بۆ كەسوكار بەدەس بهێنن. وە ئەمەرای جەماوەری زانایانی شەرعە.

**دووەم:** ئەو بنەچانە خۆیان ماڵیان نەبێ.

**سێیەم:** نەتوانن كاسپی شایانی شانی خۆیان بكەن چونكە كاسپیكردن سەرچاوەی سامانە. بەڵێ لەسەر فەرمایشتی فەرموودەی دروست بنەچەی لەش ساخ داوای لێ دەكرێ كە بۆ پێبژێوی‌و ژێواری خۆی‌و خێزانی كاسپی حەلاڵی شایانی شانی خۆی بكا، هەرچەند لەسەر فەرمایشتی دووهەم كە بەرابەری ئەم رایەیە، داوای ئەوەی لێناكرێ، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا} دەی كەسێ بە زۆری قازی كاسپی بە باوك‌و دایك‌و بنەچەی خۆی بكا، بۆ بەڕێوەچوونی ژیانیان، كەی ئەوە رەفتاری كردووە بەم ئایەتە پیرۆزە، كەی باشی‌و خۆش رەفتاری لەگەڵ باوك‌و دایكا ئاوا دەبێ؟

## بەڵگەی پێویستبوونی ژێواری وەچە لەسەر بنەچەی:

خوای نزیك بێ یا دوور، وە خوای نێرینە بێ یا مێیینە چەند شتێكە، وەك ئایەتی {وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ - سورة البقرة - ٢٣٣/٢} چونكە بەپێی ئەم ئایەتە ژنی تەڵاقدراوی پیاو ئەگەر مەمك بدا بە منداڵی خۆی‌و مێردە تەڵاقدەرەكەی پێویستە لەسەر باوكەكە، كە رۆژی‌و پۆشاك بۆ ئەو ژنە

دابین بکا، لەباتی کرێی مەمك پێدانەکە، کەواتە رۆژیو ژێواری خودی منداڵەکە خۆی دەبێ باشتر دابین بکا لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموێ: {فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ - سورة الطلاق - ٦/٦٥} واتە: ئەگەر ئەو ژنە تەڵاقدراوانەتان شیریان دەدا بە منداڵەکانتان کرێی تەواویان پێبدەن. دەی لەحاڵی وادا دەبێ پێویستیی ژیانی منداڵەکە باشتر دابین بکرێ. جارێکیش پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی: دینارێکم هەیە، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: سەرفی بکە بۆ ژیانی خۆت، پیاوەکە گوتی: دینارێکی تریشم هەیە، فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: سەرفی بکە بۆ خەرجی منداڵەکانت. لە وەلامی پرسیارێکی هیندی ژنی ئەبو سوفیاندا حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: لە ماڵی ئەبو سوفیان، با خۆشی نەزانێ، ئەوەندە ببە کە بەشی مەسرەفی خۆتو منداڵەکانت بکا بە شێوەیەکی پەسەند.

## مەرجی پێویستبوونی ژێواری منداڵ چەند شتێکە:

**یەکەم**: ئەو کەسەی ژێوارەکەی دەکەوێتە سەر دارابێ، واتە: زیاد لە مەسرەفی خۆیو خێزانی شتێکی تری هەبێ لە رۆژی سەرفی ژێوارەکەدا، بۆ ئەوەیش کە بنەچە دەبێ کاسپی بکەن بۆ پەیداکردنی ژێواری وەچەی خۆیان دوو فەرمایشت هەیە، فەرمایشتی دروست دەفەرموێ: بەڵێ بۆ ئەو مەبەستە کاسپی بکەن.

**دووەم**: ئەوەیە کە نابێ منداڵەکە یا وەچەکە خۆی ماڵی هەبێ، یا بتوانێ کاسپی بکا، ئەگەر ماڵ یا کاسپی هەبوو ژێواری لەسەر باوكو

دایكو بنەچەی نیە چونكە پێویستی بە ژێواری ئەوان نیە. بەڵێ ئەوەندە هەیە ئەگەر كوڕ ماڵێكی دووری هەبێ كە دەستی پێی نەگا، پێویستە لەسەر بنەچەی كە بەقەرز مەسرەفی بكا هەتا دەستی لە ماڵەكەی خۆی گیر دەبێ ئەوسا مەسرەفەكەی ئەمان دەگێڕێتەوە بۆیان.

## ژێوار بە پێی پێویستییە:

ژێواری خزم ئەندازەی بۆ دیاری نەكراوە، بەڵكوو بەپێی بەسبوون (كیفایەت)ە. كە بەپێی گەورەو بچووكو پێداویستی (الحاجە) ئەگۆڕێ، چونكە هەندێ شت بۆ گەورە پێویستە كەچی بۆ پچووك بەكار نایەت، هەروا بە پێچەوانەیشەوە، كەوابوو دەبێ ئەو ژێوارە ئەوەندەبێ كە گوزەرانی پێی بچێ بەڕێوە، نەك هەر ئەوەندەبێ بە كولەمەرگی پێی بژی. پێویستە پۆشاكو نیشتمەنی بۆ دابین بكا. گریمان ئەگەر ئاتاجی بەنۆكەر هەبوو دەبێ نۆكەری بۆ بگرێ. بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەم كارانە هاتنەجێ بەهۆی میوانداریيەوە، یا بەهۆی بەخشینو خەڵاتەوە لە كۆڵ ئەو كەسە دەكەون كە پێویستن لەسەری. ئەگەر مەسرەفەكەی تەسلیم بە خزمەكەی كرد، بەدەست ئەوەوە فەوتا، یا خزمەكەی خۆی فەوتاندی، پێویستە كە برێتیی بكاتەوە، بەڵام لەحاڵی فەوتانی دووەمدا كاتێ برێتیی دەكاتەوە كە هەیبێ!.

ئەگەر تاماوەیێ ژێواری خزمی نەدا، ژێواری ئەو ماوەیە نابێ بە قەرز بە سەریەوە، ئیتر خوای لەو نەدانەدا كەمتەرخەمی كردبێ یانا، چونكە هۆی ڕەوابوونی ئەم ژێوارە دڵدانەوەیە، بەڵام لە بارودۆخی كەمتەرخەمی كردندا نافەرمانی خودای گەورە دەكا. بە پێچەوانەی

ژێواری ژنـەوە، چونکە ژێـواری ژن بـۆ دڵدانـەوە نیـە، بـەڵکوو وەجـەڵی ئەوەیە کە ژنەکە خۆی دەدا بە دەستەوە، لەبەر ئـەوە لـەکاتی وادا دەبـێ بە قەرز بەسەریەوە.

## ٢٩٥) ژێواری کۆیلەو ئاژەڵ:

گوتمان هۆی سێیەم بو پێویستبوونی ژێوار مڵکایەتییە، جا هـەر کەسێ کۆیلەیەکی هەبێ یا کەنیزەکێ، دەبێ ژێواری بۆ دابـین بکـا، واتـە: پێبژێوی‌و پێخۆرو پۆشاک‌و خەرجی پێویستی تری بـۆ پەیـدا بکـا، ئـەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بەندەی زەڕخرپیدە هەقی خۆراک‌و پۆشاک‌و جل‌و بـەرگی هەیـە لەسـەر ئاغای، وەکارو فرمـانی گرانـی وای نـادرێ بـە سـەردا کـە لـە کێشیانەبێ. (موسـلیم) لـە گێڕانەوەیـەکدا: بەسـە بـۆ گوناهبـاری پیـاوێ کـە نـان‌و ئـاو بگرێتەوە لە ژێر دەستەی خۆی (موسلیم). لەبەر ئـەوەیش چونکە ئـەو بەنـدەو ژێـر دەسـتەیە هەرچـی پەیـدا بکـاو هـەر کاسپییەك بکـا بـۆ خاوەنەکەیـەتی، کەواتـە دەبـێ خاوەنەکـەی مەسـرەفی بکێـشێ. بـەهیچ جۆرێ نابێ ناهەقی لێ بکا، دەبێ کارێکی وای نەدا بەسەردا کـە لـە وزەی نەیـەت، ئەگـەر شـەوکار بـوو دەبـێ بـە ڕۆژ وچـانی بـدا هـەروا بـە پێچەوانەوە، لە هاوینا مۆڵەتی بدا، بە تایبـەتی لـەکاتی وچانی قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا. کورت‌و پوخت بەکوردی پـەتی: چـەندە بـاری سووك بکا خودا پێی خۆشەو لەسەر ئەوە پاداشتی باشی دەداتەوە. لە حـەدیثـی شەریفا دەفەرموێ: چەندە باری سەرشانی نۆکەری خۆت سووك بکـەی‌و

کاری بۆ ئاسان بکەی‌و ئیشی قورسی پێ نەکەی لە رۆژی قیامەتدا بۆت دەبێ بە پاداشتی باش لە تەرازووی خێرەکانتا. (ئیبنو حەببان لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە).

لەسەر بەندەو کەنیزەکیش پێویستە کە بەپێی توانا دریغی نەکەن لە بەرژەوەندی خاوەنەکانیان‌و لە کارو فرمان‌و ئەرکی سەرشانی خۆیانا خاوە خاوو سستە سست نەکەن!.

هەروەك چۆن ژێوارو مەسرەفی زەرخریدە پێویستە لەسەر خاوەنی ئاوایش مەسرەفی ئاژەڵ‌و وڵاخی خۆیی دەکەوێتە سەر، وەك لەوەڕان‌وئالیك‌و ئاودان، برێتی ئەوە دەکەوێ کە بەرەڵای بکا بۆ لەوەڕان‌و بۆ چوونە سەر ئاو، بە مەرجێ لەو جۆرە گیانلەبەرانەبێ کە بۆ خۆیان دەلەوەڕێن‌و زەویش بزوێن بێ‌و بەرهەڵستیش نەبێ. جا ئەگەر لەم لایەنەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵ نەسا قازی بە زۆر پێی دەکا، لە هەمان کاتدا تاوانباریش دەبێ. لە صەحیحەیندا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژنێ لەسەر پشیلەیێ سزادرا، پیشیلەکەی بەند کردبوو، هەتا لە برسانا مردبوو، لەو ماوەیەدا نە خۆی ئاوو نانی دابوو پێی، نە بەرەڵڵای کردبوو هەتا بۆخۆی لە جرو جانەوەری ناو زەوی بخوات لەسەر ئەوە خودا خستیە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

جارێکیش پێغەمبەری خوا تەشریفی بردە ناو باخە خورمایەکی پیاوێکی ئەنصاری، وشترێکی تیابوو، کە چاوی بە حەزرەت کەوت بەزەیی بە زەبوونی خۆیدا هاتەوەو فرمێسك بەهەر دوو چاوەکانیدا هۆن هۆن هاتە خوارەوەو سکاڵای لە دەستی خاوەنەکەی کرد

له خزمەت پێغەمبەردا {درودی خوای لەسەربێ} جا پێغەمبەر رۆیشت بۆ لای و دەستی هێنا بەسەر پشتیداو دڵنەوایی دایەوە، وشترەکەیش ژیر بۆوەو داسەکنا. ئەوجا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئەم وشترە نێرە هی کێیە؟ کێ خاوەنی ئەم وشترەیە؟ لاوێکی ئەنصاری هات گوتی: هی منە ئەی پێغەمبەری خودا! حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: ئەوە بۆ لە خوا ناترسی، لە بارەی ئەم ئاژەڵە بەسەزمانەوە کە خوا تۆی کردووە بە خاوەنی؟ ئەوەتا شکاتت لێ دەکا لەلای من، دەڵێ برسیم دەکا، وچانم نادات سەرو مرکارم پێ دەکا. (ئیمامی ئەحمەدو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، رشتەکەی لە موسلیمدا هەیە، حاکم دەفەرموێ: رشتەکەی دروستە). لەبەر ئەوەیش کە ئاژەڵو وڵاخیش خاوەن هەستو گیانن، لەو رووەوە لە کۆیلە دەگەن، کەواتە وەك زەرخریدە (مملوك) نابێ ناهەقییان لێ بکرێو زیاتر لە توانای خۆیان کاریان پێ بکرێ.

**بزانن:**

کە ئاژەڵی شیردار دروست نیە هەتا دواچۆری شیرەکەی بدۆشرێ، بەرادەیەکی وا زیان بە بەچکە شیرە خۆرەکەی بگەیەنێ، بەڵکوو دەبێ چی لە تێرە خۆری بەچکەکەی زیاد بێ ئەوە بدۆشرێو بەس، واباشە کە شیردۆشەکە نینۆکی بکا هەتا ئازاری گوانی نەدا، هەروەك پێویستە لەسەر خاوەن هەنگ بەشی هەنگەکە خۆی هەنگوین لە پوورەکەدا بهێڵێتەوە، بۆ خواردنی هەنگەکان لەکاتی بێ لەوەڕیدا.

## ٢٩٦) ژێواری ژن (نفقة الزجة):

گوتمان هۆی سێیەم بۆ پێویستبوونی ژێوار ژنێتییە. بەڵگەی روون و ئاشکرا، لە قورئان و رێگەی رەهبەرو یەکگرتنی نەتەوەدا لەسەر پێویستبوونی ژێواری ژن لەسەر مێردی هەیە.

زاتی مەزن دەفەرموێ: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ – سورة النساء – ٣٤/٤} پیاوان لە سایەی خوداوە سەرگەورەی ژنانن و خودا کردوونی بە گەورەو چاودێر بە سەریانەوە.

**یەکەم:** بەهۆی ئەوەوە کە بە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەی باش و لەشی تەواناو هۆشی بەهێزو ئایینی تەواوی پێیاوان داوە.

**دووەم:** بەهۆی ئەم بەهرە خواییەوە پیاوان رەنج دەدەن و ئارەق دەرێژن و بە ئارەقی ناوچەوان ماڵ پەیدا دەکەن و دەتوانن مەسرەفی ماڵ و مناڵ بکەن و خێزان بەخێو بکەن و دەبن بە بەرپرسیار لە ژێواری ماڵ و میوان و خێزان و خزم و کەسوکار) (قوام) لە ئایەتەکەدا بە واتا (قیم)ی عەرەبییە، بە کوردی واتە: کار بەدەست، یا سەرپەرشت، سەرپەرستیش کەسێکە کە ئاگاداری کەسێ یا شتێ بکاو مایەی ژیانی، یا گوزەرانی بۆ دابین بکا.

لە ئایەتێ تردا دەفەرموێ: {وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ – سورة البقرة – ٢٣٣/٢}.

ئەوە بوو وەك لە بەڵگەی پێویستبوونی ژێواردا رابوورد پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەهیندی ژنی ئەبو سوفیانی فەرموو: ئەوەندە ببە کە بەشی مەسرەفی خۆتو منداڵەکانت بکا بەپێی یاسای شەرع.

لە فەرموودەی حەجیماڵئاواییدا کە موسلیمو ئەبو داوود لە جابیرەوە گێڕاویانەتەوە، حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (.. وە دەربارەی ئافرەتانیش لە خودا بترسنو بێ دادیو ناهەقییان لێ مەکەنو رەفتارتان جوان بێ لەگەڵیاندا، چونکە ژنان ئەمانەتو سپاردەی خوای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، پیاو هەر خیانەت بکا، نابێ خیانەت لە ئامانەتی خودای خۆی بکا! ژنان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی فەرمایشتی شەریعەتی ئەو حەڵاڵ بوون بۆتانو دێنە باخەڵتانو دەچنە لایان. وە مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کە ئەو کەسە کە ئێوە حەزی لێ ناکەن نەیهێننە سەر بەرەتانو نەهێڵن بێنە ماڵتان، جا ئەگەر شتێ وایان کرد کە بەدڵی ئێوە نەبوو، ئەوا هەتا دەتوانن چاوپۆشییان لێ بکەنو بە نەرمونیانی لەگەڵیانا رەفتار بکەن، وە بەبێ هۆیەکی رەوا تەڵاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەیش چاریان نەکرا ئەوا شەریعەت رێگەتان دەدا کە بە ئاسپایی لێیان بدەن، وە مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بە باشیو بە پێی باوی باشی ناو وڵاتی خۆتان رۆژیو خۆراكو بەرگو پۆشاکیان پێ بدەن، وەکی هاوسەری هاوشانی خۆتان، تا هەست بە هاوسەرکەمی نەکەن!.

وه مـن یاسـایەکی وەهایـشم لـەپاش خـۆم بۆتـان بەجێهێـشتووه ئەگـەر بێتـو پـەیڕەوی بکـەن لـەناو خۆتانـا هـەتا هەتایـه جارێکی تـر سەرتان لێ ناشێوێ، ئەویش ئەم قورئانەیه که نامەی خودایه.

**یەکگرتن لەسەر ئەوە دامەزراوە کە ژیواری ژن لەسەر مێرد پێویستە.**

**جۆرەکانی ژێوار:**

**ژێواری ژن لەسەر مێرد جۆری زۆرە:-**

**یەکـەم:** خواردمەنییەکـه پێبـژێو (قـووت) بـێ، بـەپێی حـاڵی کـابرای مێردلـه دەوڵەمەنـدیو دەسـکورتیو مامناوەنـدێتی، ئـیتر پەیوەنـدی نیـه بـه بـەرزیو پەسـتیی ژنەکـەوە، لەبـەر ئـەوە ژنەکـه موسوڵمان بێ، یا پەیماندار بێ، یا ئازادبێ، یا کەنیزەك بێ جیاوازی نیە، چونکه وەجەڵه له بری خۆ به دەستەوەدانە. جا پێویستە لەسەر پیاوی دەوڵەمەنـد هـەموو رۆژێ دوو (مـد) وه لەسـەر گەدایـەك (مـد) وه لـسەر مامناوەندی (مد)و نیوێ لـه پێبـژێوی سـاخی زیـاتر بەکار هـاتووی ئـەو شوێنه که ژنەکەی تیا ئـەژی، بـدا بەدەسـتی ئـەو ژنـەوە. مەبەسـت لـەم مـوددە ئـەو موددەیـه کـه لـه سـەردەمی پێغەمبـەردا بـاوبووە، کـه بـه عیـارەی میـسری بـه پێوانـه دەکاتـه نیـو (قـەدەح) یا پارەی بـایی ئـەوە بداتێ (له شەریعەتی ئیسلامدا مامۆستا مەلا عەبدول کـەریم – خـودای گـەورە لێـی خـۆش بـێ) دەفـەرموێ: (مـودد) برێتییـه لـه وەزنـی سـەدو حـەفتاو یـەك درەمو سـێ حـەوت یەکـه درەمێـك... تـاد: واتـه: فەرمایشتەکەی مامۆستا تەواو بوو – وەرگێڕ).

بۆیە پێبژێو لە ژێواردا ڕەچاو دەکرێ چونکە خوای گەورە لەسەر شێوەیەکی پەسەند ژێواری پێویست کردووە، دەی شێوەی پەسەند ئەوەیە کە لە خۆراکی باوی ناو زوربەی خەڵکی ئەو شوێنەبێ، بە قیاس لەسەر خۆراکی کەفارەتیش، چونکە ئەویش پێویستە پێبژێوبێ. بەڵگەی ئەوەیش کە ژێوار بەپێی حاڵی مێردە ئەم ئایەتە: {لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ – سورة الطلاق – ٦٥/٧} واتە: ئەوی هەیەتیو دەوڵەمەندە بە بەپێی توانای خۆی، وەك هاوشانی خۆی، مسرەف بۆ ئەو ژنە بکا، ڕەزیلیو چوورووکی نەکا، ئەوەی نییەتیو دەست کورتە بەپێی توانای خۆی، لەوبەشو بارەیەی کە خودا پێی داوە، مەسرەفی بۆ بکا.

دووەم: پێخۆرە: کە دەبێ لەو جۆرەبێ کە زوربەی خەڵکی وڵاتی ژنەکە دەیکەن بە پێخۆر: وەك ڕۆن زەیتوونو ڕۆنو چەوری، ئەوەی لێرەدا ڕەچاو دەکرێ زوربەی پێخۆر بە گۆڕانی چوار وەرزە جۆرەکانی دەگۆڕێن، وەکوو شیرو ماستو دۆو پەنیرو بامیەو تەماتەو باینجانو کوولەکەو پەتاتەو گۆشتو شتی تریش، جا ئەگەر جۆرە میوەیێ لەکاتی خۆیدا بوو بە خواردنی زوربەی خەڵك ئەوە ئەو جۆرە پێویست دەبێ، پێویستە هەموو حەفتەیێ گۆشتی دەرخوارد بدا، نەدارا ڕەتڵێ، دارا دوو ڕەتڵ، مامناوەندی ڕەتڵو نیوێ، ئیمامی شافیعی (ڕەزای خوای لێبێ) وا بە پەسەند دەزانێ کە گۆشت بکەوێتە ڕۆژی هەینییەوە، چونکە وا باشە کە مرۆڤ لە ڕۆژی هەینیدا شادیو خۆشیو فەرەحی بخاتە ناو ماڵو منالی خۆیو خواردنی باشیان بۆ دروست بکا. ئەم ئەندازەیە بۆ

شوێنێکه کـه گۆشـت کـەم بـێ، بـەڵام ئەگـەر زۆر بـوو ئـەوا بـەپێی دەستووری ئەوشوێنه ئەندازەکەی پتر دەکا.

**سێیەم:** کارەکەر، یا ژنێ کە خزمەتی بکا، ئەگەر ژنەکە لـە ماڵی خۆیان کارەکەری بووبێ، دەنا دەبێ خۆی خزمەتی خۆی بکا.

**چـوارەم:** پۆشـاك‌و بەرگـە، بـەپێی بەسـبوون بـەرگ پێویـسته، ئەمیش بەپێی وڵات دەگۆڕێ، هەروا بەپێی سەرماو گەرما، هەروا بـەپێی گۆڕانی وەرزی هاوین‌و زستان، چونکه بـەرگی زستانه جیایـه لـه بـەرگی هاوینه، هەروا بەپێی دارایی‌و دەست کورتیی مێرد جل‌و بەرگ دەگۆڕێ، چونکه ژنـی دەوڵەمەنـد جۆرێ دەپۆشـێ کـه بـه ژنـی هـەژار ناپۆشـرێ هەروا..

دیـسان دەبـێ قـاپ‌و قاچـاخ‌و قـۆری‌و پیاڵـەو نـوێن‌و پێخـەف‌و پێداویستییەکانی تری گوزەرانی بۆ دابین بکا، وەك ئـاوو جێگـەو چـراو نەوت‌و پارەی ئاوو کارەبا بە گوێرەی حاڵی کابرای مێرد.

## ٢٩٧) ژێوار بەچی‌و کەی پێویست دەبێ؟

بەوه پێویست دەبێ کە ژن خۆی بـدا بـه دەسـتەوە، واتـه: ئەگـەر خاوەن فام بوو بڵێ: وا من ئامـادەم بـۆ ئـەوەی کـه مێردەکـەم پێتـه لام‌و دروست ببێ لەگەڵم، ئەگەر نەفام بوو هەقدارەکەی رێگەی ئەوە بـدا کـه مێردەکـەی بیگوێزێتـەوە. بـەم چـەند شـتەی دواوە خـۆ بەدەسـتەوەدان دەفەوتێ.

**یەکەم:** نەهێڵێ مێرد لەگەڵی دروست ببێ بەڵام ڕێگەی ڕابواردنی تری لێ نەگرێ وەك ماچو دەستبازیو شتی تری خۆشی نێوانی ژنو مێرد، یا هەر نەهێڵێ هیچ لەززەتێکی ڕەوای لێ وەربگرێ، بە مەرجێ ژنەکە مەهانەی ڕەوای نەبێ، یا نەهێڵێکی ڕەوا لە ئارادا نەبێ، دەنا مەهانەدارە، وەك ئەوە نەخۆش بێ، یا زامێ بە شوێنێکی وایەوەبێ کە جووتبوون خراپ بێ بۆی، لەم کاتەدا مافی ژێواری هەیە، بەمەرجێ مێردەکەی بەجێ نەهێڵێ.

**دووەم:** تۆرانو ماڵی مێرد بەجێ هێشتنو سەفەرکردن بەبێ ڕازی بوونی مێرد ژێوار دەفەوتێنێ.

**سێیەم:** ژنەکە بچووك بێو مێردەکەی گەورەبێ، یا بەپێچەوانەوە، لەم دوو حاڵەدا ژێواری ناکەوێ، چونکە خۆ بەدەستەوەدانی تەواو کەسەر دەکێشێ بۆ لەززەت وەرگرتنی تەواو لەم دوو کاتەدا لە ئارادا نییەو نەهاتۆتە جێ، کەواتە ژێوار پێویست نابێ بۆ ژن لەسەر مێرد.

**چوارەم:** بە هەندێ پەرستشو خودا پەرستیش خۆ بەدەستەوەدان دەفەوتێو ژێوار پێویست نابێ، وەك ئەوە ژنەکە بەبێ مێردەکەی بچێ بۆ حەج یا بۆ عەمرە، یا مێردەکەی ڕێگەیشی پێبدا، چونکە سەفەرەکەی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر مێردەکەی لەو سەفەردا لەگەڵیدا بوو ئەوە هەقی ژێواری هەیە، ئەگەر ژن بەبێ فەرمانی مێرد ڕۆژووی سوننەت بگرێ ژێواری ئەو ڕۆژەی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر مێردەکە ڕێگەی پێبدا ژێواری دەکەوێ!.

## ٢٩٨) کاتێ مێرد توانای ژێواری ژنی نەبوو:

کاتێ مێرد توانای دابینکردنی ژێواری ژنی خۆی نەبوو، وە کۆڵیدا لە مەسرەف بۆ کردنی، ئەوە ژنەکە خۆی سەرپشکە لە یەکێ لەمانە:

**یەکەم**: ئارام بگرێو لە ماڵی خۆی مەسرەف بکا بۆ خۆی، یا قەرز بکاو سەرفی بکا بۆ خۆی. ژێواری لەم دوو حاڵەدا دەبێ بەقەرز لەسەر مێردەکەی، کەی هەی بوو دەبێ بیداتەوە.

**دووەم**: دەتوانێ لەلای قازی داوای هەڵوەشانەوەی هاوسەرێتی (نیکاح) بکا.

لە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} پرسیار کرا: ئەگەر کەسێ لەبەر هەژاریو دەستکورتی نەتوانی ژێواری ژنەکەی دابین بکا چی لێ دەکرێ؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: لە یەك جیا دەکرێنەوە. (دارە قوطنی). لەبەر ئەوەیش کە چوك بڕاویو شلەپەتکەیی مافی هەڵوەشانەوەی هاوسەری دەچەسپێنن، دەی دەسەوسان بوون لە دابینکردنی ژێوار باشتر ئەو مافە دەچەسپێنێ! چونکە مرۆڤ دەتوانێ بەبێ رابواردن لەگەڵ حەلاڵو هاوسەردا بژیو گوزەران بکاو ئارام بگرێ بەلام لەسەر بێ نانیو بێ ئاویو بێ جێگەو رێگەیی ناتوانێ ئارام بگرێ، دیسان لەبەر ئەوەیش کە لە کاتی وادا دوور نیە ژنەکە بۆ دابینکردنی گوزەرانی تووشی داوێنپیسی ببێ!.

ئەوەندە هەیە ئەگەر مێرد لەكاتی وادا قەرزی لەسەر ژنەكەی هەبوو، وە ژنەكەی دەوڵەمەند بوو، وە مێردەكەی پێی گوت لەو قەرزەی من كە لەسەرتە ژێواری خۆت دابین بكە. ئەوە ژنەكە مافی سەرپشكی هەڵوەشانەوەی نامێنێ، بەڵام ئەگەر ژنەكەیش دەست كورت بوو ئەوە هەمان مافی دەمێنێ، چونكە لە هەموو بارو دۆخێكا قەرزاری نەدارا مافی مۆڵەتدانی هەیە. گریمان كەسێ بە پیاوەتی ویستی ژێوارەكە دابین بكا لە باتی مێردی نەدارا، ژنەكە دەتوانێ ئەوە قەبووڵ نەكا، چونكە منەتی بەلاش بۆ هەڵبگرێ، لەبەر ئەوە مافی هەڵوەشانەوەی هەی.

بزانە مێرد چ بە سامان چ بە كاسپی ژێوار دابین بكا چونیەكە، توانایی وەك بەهۆیماڵەوە دەبێ بەهۆی كاسپیشەوە دەبێ. جا ئەگەر هەموو رۆژێ بەقەد ژێواری ئەو رۆژە كاسپی دەكردو رۆژانە كرێكەی سەرو بەر دەری دەهێنا ئەوە ژن هەقی هەڵوەشانی نیە، هەتا ئەگەر بەهۆی نەخۆشییەوە یەك دوو رۆژێ نەیتوانی ئیش بكا مافی هەڵوەشانی نیە، بەڵام ئەگەر نەخۆشی درێژەی كێشاو لە سێ رۆژ هەڵی بوارد مافی هەڵوەشان هەیە! چونكە زیان لە ژن دەكەوێ. گریمان مێردی دارا ژێواری مێردی نەدارای دا بە ژنی خۆی مافی هەڵوەشان نامێنی، بەڵام باقی مەندەی ژێوارەكە دەبێ بە قەرز بەسەر مێردەكەوە.

مەرجی هەڵوەشان ئەوەیە: دەسكورتیی مێرد مسۆگەر بێ، جا بەهۆی پێلێنانی مێردەوە بێ، یا بەهۆی شایەتو بەڵگەی رەواوە بێ ئەم مەرجە دێتە جێ، ئیتر خوای مێرد لە رووبێ، یا نادریاربێ. توانانەبوونی مارەییش ئەگەر لە پێش بە دەست گرتندابێ دەبێ بە

هۆی مافی هەڵوەشان، ئەوەندە هەیە هەرکاتێ ژن هەندێ لە مارەیی وەرگرت ئیتر هەقی هەڵوەشان نامێنێ، چونکە بۆ مێردەکە بەهۆی دانەدەستی هەندێ لە مارییەکەوە، هەندێ لە لەزەتگا (بوضع)ی ژنەکە دەکەوێتە دەستی، بەڵام ئەگەر لە توانا نەبوونی مارەیی کەوتە دوای گواستنەوەو بە دەستگرتن ئەوە ڕێگەی هەڵوەشان نامێنێ، چونکە بە دەست گرتن وەجەڵەکەی (کە لە زەتگای ژنە) دەفەوتێو وەجەڵەکە دەبێ بە قەرز لە ئەستۆی مێرددا. لە هەمان کاتدا بە دەستەوەدانی ئەو وەجەڵە لە لایەنی ژنەکەوە نیشانەی ئەوەیە کە ژنەکە ڕازییە بەوە کە بەقەرز ئەو وەجەڵەی بداتێ، بە پێچەوانەی پێش چوونەلاوە.

گریمان پیاو نەی دەتوانی کە ژێوار بۆ ئەو کەنیزەکەی دابین بکا کە بووە بە دایکی منداڵی، کە لە عورفی شەرعی شەریفا ناودارە بە ئوموول وەلەد ئەوە زۆری لێ دەکرێ کە یان ئازادی بکا، یان بیدا بەشوو، ئەگەر داخوزیکەری هەبوو، دەنا دەبێ ڕێگەی بدا کە کاربکاو بە کاسپی خۆی بەخێو بکا.

## ۲۹۹) سیغەکردن (نكاح المتعة):

موتعە (یاسیغەکردن، یا مارە بڕینی کاتی) بریتییە لە هەموو جۆرە مارەکردنێکی کاتی، کە ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ دانرابێ، ئیتر ماوەکە کورت بێ یا درێژ، وەك ئەوە پیاو بە ژن بڵێ: ئەوا تۆم مارەکرد لەخۆم بۆ ماوەی ڕۆژێ، یا دە ڕۆژ، یا مانگێ، یا هەتا لەم شارە دەچمە دەرەوە، یا وێنەی ئەمە. ئەم جۆرە مارە بڕینە پووچەو نەیی لێکراوەو

بەیەك کەوتنی فەرمایشتی زانا پێشەواکانی هەر چوار مەزهەبەکە نا دروستو ناڕەوایە. بەڵگەیان لەسەر ئەمە زۆر شتە. وەك سەبرە {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: لە بەینی گۆشەی حەجەرولئەسوەدو دەرگای کابەدا پێغەمبەرم بە چاوی خۆم دی لەوێ ڕاوەستابوو، لەکاتی حەجی ماڵ ئاواییدا دەیفەرموو: خەڵکینە! ئەی موسوڵمانینە! لەمەوپێش ئەوە بوو خۆم ڕێگەم بە ئێوەدا بوو کە ژن سیغە بکەن (واتە: ژن بۆ ماوەیەکی کاتیی، دیاری کراو مارە بکەن) بەڵام لەم دەمەوە هەتا ڕۆژی قیامەت خودا ئەوەی حەرام کردووە (موسلیمو ئەبو داوودو نەسائی) شەفیعی {ڕەزای خوای گەورەی لێبێ} دەفەرموێ: هەواڵی بە ئێمە داوە سوفیانی کوڕی عویەینە لە زوهرییەوە، لە ریبعی کوڕی سەبرەوە لە باوکیەوە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی کردووە لە سیغەکردنی ژن، عومەریش {ڕەزای خوای گەورەی لێبێ} لەکاتی جێنیشینیی خۆیدا لەسەر دوانگە ژن سیغەکردنی حەرام کرد، هاوڕێکانی پێغەمبەریش {دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەسەر یارانی بێ} سەلماندیان بۆی، ئیتر بوو بە یەکگرتن. بەیهەقی لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ڕاگوێز دەکا: لە بارەی مارەکردنی وەختییەوە پرسیاری لێ دەکرێ دەفەرموێ: بڕێتییە لە داوێنپیسی بەبێ کەمو زیاد.

ڕۆژێ لە ڕۆژان مەئموون ویستی کە جاری ڕەوا بوونی ژن سیغەکردن بدا، قازی یەحیای کوڕی ئەکثەمی تەمیمی بە شەڵەژاوی چوو بۆ لای، مەئموون لێی پرسی هۆی ئەم ڕەنگ تێکچوونو شەڵەژاوییەت چییە؟ فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! خەفەتێکی گەورە ڕووی داوە، کارەساتێ لە دیندا قەوماوە، بە ئاشکرا

جارِ دراوه کـه شەروالْپیـسی رەوایـەو حـەلالْ کـراوە!! مـەئموون گـوتی: شەروالْپیــسی؟ چــۆن؟ یـــەحیا فـــەرمووی: بـــەلْیٚ ژن ســـیغەکردن شەروالْپیسییە ئەی چییە؟ مەئموون گوتی: چۆن بیسەلمێنە بۆم، ئەمەت لە کویٚ هێناوە؟ یەحیا فەرمووی: هەم لە نامەی خودادا هەیەو هەم لە فـەرموودەی پێغەمبـەری خـودادا هەیـە، خـوای گـەورە دەفـەرمویٚ: {وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ. فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ – ٢٣/٥ – ٧} (تەماشـای تـاجول ئوصـولْ بـەرگی حەوتـەم لاپـەڕە (٣٧) بفـەرموو: بـۆ راڤـەی ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـە. زوربـەی ئـەم ئایەتانەی وان لەم کتێبە پیرۆزەدا لـە تاجدا تەفسیر کـراون بـە کوردی. خۆزگـە رۆژیٚ لـە رۆژان سـوود لـەو راڤانـەی ئـەویٚ بـۆ راڤـەی ئیرەیش وەردەگیرا – وەرگێڕ) ئەوجا قـازی یـەحیا رووی دەمـی کـردە مـەئموونو پێی فەرموو: ئـەی فـەرمانڕەوای موسـولْمانان ئایـا ژنـی سیغە کـراو بـەر {مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ} دەکەویٚ کە خوا رەوای دیوە؟ گوتی: نەخـەیر بـەر ئـەم جـۆرە حەلالْـە ناکـەویٚ. فـەرمووی: باشــە خــۆ بــەر ئــەو ژنــە مارەبڕواەیش ناکەویٚ کە خوا بەشەکەلەپووری لە مێردەکەی، بۆ داناوە، وە لەویش بەشە کەلەپووری اناوە بۆ مێردەکە، وە ئەم جۆرە ژنە چەند مـەرجی خـۆی هەیـە؟ گـوتی: خـەیر بـەر ئـەمیش ناکـەویٚ. یـەحیا فەرمووی: کەواتە بەپێی ئەم ئایەتە حەلالْو هاوسەر دوو جۆری هەیـە، لەو دوو جۆرە بترازیٚ (عدوان)و لە سنووری شەرع دەرچوونەو بـەر ئـەم هەڕەشەیە دەکەویٚ کە دەفەرمویٚ: {فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ} واتـە: هەرکەسـیٚ جگـە لـەم دوو جـۆرە حـەلالْو هاوسـەرییە

جۆرێکی تر دابهێنێ ئەوە یاساو سنووری حەڵاڵو هاوسەری دەبەزێنێ!).
ئەمە بەڵگەی قورئانی، بفەرموو لە سوننەتی پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} بەڵگەت بۆ بهێنمەوە: ئەوەتا فەرموودەزانی گەورە ئیمامی زوهری دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵلاو لە حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنەفییەوە، لە باوکیەوە لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە {رەزای خودا لە هەموویان بێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکردم لەسەر فەرمانی ئەو بەناو مەردومدا جاڕمدا: گەرچی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەمەوبەر رێگەی ژن سیغەکردنی داوە بەڵام لەم رۆ بەدواوە ژن سیغەکردن حەرامە، خودا نەیی لێکردووە، جا مەئموون لە فەرموودەزانەکانی پرسی ئایا ئەم حەدیثەی زوهری لەناو فەرموودە شوناسەکاندا لەبەر کراوەو شتی وا هەیە؟ عەرزیان کرد بڵێ، جا کاتێ مەئموون زانی کە ئیمامی مالیك ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، لە رای خۆی پەشیمان بۆوەو فەرمووی: داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم، من هەڵە بووم. ئەوجا فەرمانی دەرکرد جاڕیاندا: کە ژن مارەکردنی کاتی حەرامە.

## ٣٠٠) باسی پەروەردەکردنی ساوا (حضانە):

پەروەردەکردنی منداڵ کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: حضانە، بە واتاگرتنە ئامێزو باوەشە، پەروەردەکردن لە شەرعا برێتیە لە ئاگاداریو سەرپەرشتیکردنی کەسێ کە نەتوانێ خۆی پەروەردە بکا، پەرومردەکردن جۆرە خاوەنێتیو هەقدارییەکە، وەلێ ئەوەندە هەیە ئەم

جۆره هەقدارییه كه پێی دەگوترێ حەضانە، یا پەروەردەكردنی ساوا، بۆ ژن لەبەرترو له بارتره، چونكه ژنان بۆ ساوا دڵسۆزترن‌و باشتر له لەیی‌و پەروەردەكردن شارەزان‌و پتر هۆگری ساوان‌و له كاروباری كۆرپه دەزانن. بەڵگەی ئەمەیش كه ژن له پێش تره بۆ لەلەیی ساوا ئەمەیه: عەمری كوڕی شوعەیب له باوكیەوە، باوكی له باپیری خۆیەوە كه عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاصە دەیگێڕێتەوە: عەبدوڵلا دەفەرموێ: ئافرەتێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم كوڕەمم نۆ مانگ بە چەرمی سك هەڵگرتووەو بەشیری مەمكم گۆشم كردووەو له كۆشما پەروەردەم كردووە، ئێستایش باوكی تەڵاقی داوم‌و بەرەڵای كردووم‌و كەچی دەیەوێ بە زۆر كوڕەكەشمم لێ بسێنێ. پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: تا شوونەكەیتەوە تۆ له پێشتری بەم كوڕە - واتە: شەرع دەیدا بە تۆ (ئەبو داوود/ حاكم. حاكم دەفەرموێ: رشتەكەی دروستە) بەڵام ئەم بڕیارە كه مناڵ هی دایكە بۆ هەموو كاتێ وانیە، ئەمە كاتێ وایه كه منال نەفامی‌و چاك‌و خراپی خۆی نەزانێ، جا هەر كاتێ فامی كردەوەو خۆی ناسی خۆی دەكرێ بەسەر پشك له نێوانی باوك‌و دایكدا، بە ئارەزووی خۆی هەركامێكیان هەڵبگرێ دەدرێ بەوەیان، بەپێی ئەم فەرموودەیە: ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} جارێ كوڕێكی مێرد منداڵی كرد بە سەرپشك، كه بە ئارەزووی خۆی، لای باوكی، یا لای دایكی هەڵبژێرێ‌و لەلای ئەوەیان بێ كه خۆی حەزدەكا (ئیبنو ماجەو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە. تیرمیذی بە فەرموودەیەكی جوانی داناوە) له گێڕانەوەیەكی ئەبو داوودو حاكمدا:

کوڕەکە دەستی دایکی گرت، ئیتر دایکەکەی بردی بۆلای خۆی (حاکم دەفەرموێ: رشتەکەی دروستە) تەمەنی خۆناسین حەوت ساڵە، یا لەو دەوروبەرەدایە، هەر فامین بەس نیە بەڵکوو دەبێ هۆشی بەوەیش بشکێ کە بۆچی ئەو لایە هەڵ دەبژێرێ، چونکە لەسەر ئەو بنیاتە دەگرێ بە سەرپشك کە خۆی هۆشی بە بەرژەوەندی ئاگاداریکردنی خۆی باشتر دەشکێ. خۆناسین ئەوەیە کە منداڵ بە تەنها خۆی بەبێ یارمەتیدانی کەسێکی تر بتوانێ نان و ئاو بۆ خۆی بخواو خۆی لە سەراوکردن پاك بکاتەوە بە تەنیا بەبێ یاریدەی پەروەردەکەر.

**بزانە:**

بڕیاری دایکی دایك کە کۆببێتەوە لەگەڵ باوك و باپیردا دەق وەك بڕیاری دایك وایە کە کۆببێتەوە لەگەڵ ئەم دوو کەسەدا. جا ئەگەر هەرمێینەی پەتی بەبێ نێرینە کێشەیان بوو لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ، ئەوە لەم کاتەدا دایك پێش پێش دەخرێ، ئەوجا دایکی دایك و ئەو نەنکانەی دایك کە بەهۆی مێینەوە پێی دەگەنەوە، کامیان نزیکتربێ لەو نەنکانە ئەوەیان پێش دەخرێ، ئەوجا دایکی باوك ئەوجا دایکی دایکی باوك و ئەو نەنکانەی دایکی باوك کە بەهۆی مێینەوە پێی دەگەنەوە، ئەوجا دایکی باوکی باوك کە بە هەمان شێوە بگاتەوە پێی، ئەوجا ئەو نەنکانەی دایکی باوکی باوك کە بەهەمان شێوە بن، ئەوجا دایکی باوکی باپیرەکە بەهەمان شێوەبێ، ئەوجا ئەو نەنکانەی دایکی باوکی باپیرەکە بە هەمان شێوەبن، ئەوجا خوشکی باوك و دایکی، ئەوجا خوشکی باوکی، ئەوجا خوشکی دایکی، ئەوجا

خوشکی دایك، ئەوجا خوشکی باوك. ئەگەر مێ‌و نێر کۆبوونەوەو لەسەر پەروەردەی منداڵ بوو بە کێشەیان دایك پێش دەخرێ ئەوجا دایك‌و نەنکی دایك کە بەمێنەی پەتی بگەنەوە پێی، ئەوجا باوك، ئەوجا باپیرە، ئەوجا خوشك، ئەوجا خوشکی دایك، ئەوجا خوشکی باوك‌و، ئەمەیش بەپێی دەقی ئیمامی شافیعی لەسەری.

براو کوڕی براو مامەو کوڕی مامە ئەوانیش وەك باوك‌و باپیرە وان لە مەسەلەی پەروەدەکردنی ساوادا، کێ نزیکتربێ ئەوە پێش دەخرێ بەریز لەسەر شێوەی ریزی کەلەپوور گران، ئەمەیش دیسان بەپێی دەقی ئیمامی شافیعی لەسەری.

**بزانە:**

لە بابەتی پەروەردەدا کچی خوشك پێش کچی برا دەخرێ هەروەك خوشك پێش برا دەخرێ.

## ۳۰۱) مەرجەکانی پەروەردەی ساوا:

وەك زانیت منداڵ پەروەردەکردن جۆرە سەروەری‌و هەقدارییەکە کە پێویستی بە دەسەڵاتە، وە دایك پێش باوك‌و کەسانی تریش دەخرێ، هەتا دایك وەستابێ کەسی تر مافی پەروەردەی منداڵی نیە، چونکە زۆر زۆر دڵسۆزە بۆی، بەڵام دایك ئەگەر خۆی ئارەزووی لە پەروەردەی منداڵی بوو بەم چەند مەرجە هەقی ئەوەی هەیە:

**یەکــەم:** دەبــێ ژیــرو ئاقــل بــێ، دایکــی شــێت مــافی منــاڵ پەروەردەکردنی نیە، چونکە شێتیو ئاگاداریو سەرپەرشتی کۆرپەیان نەگوتووە، شێت خۆی پێویستی بە کەسێکە سەرپەرشتی بکا ئیتر چۆن دەبی بە سەرپەرشتی کەسێکی تر.

**دووەم:** ئازادییە، دایکی کۆیلە مافی پەروەردەی نیە، چونکە ئەو کەلكو قازانجەکەی گشتی بۆ ئاغاکەیەتی، لەبەر ئاغاکەی نایپەرژێتە سەر مناڵەکەی، لەبەر ئەوەیش چونکە مناڵپەروەردەکردن جۆرە سەروەریو هەقدارییەکە، دەی کۆیلە مافی هەقداریو سەروەری نیە.

**سێیەم:** دایك دەبێ ئیسلام بێ، ئەگەر منداڵەکە ئیسلام بوو، هەر منداڵێ باوکی موسوڵمان بێ خۆشی دادەنرێ بە موسوڵمان، ژنی بێبڕوا مافی پەروەردەکردنی مناڵی ئیسلامی نیە، چونکە مناڵپەروەردەکرن سەروەرییە، بێبڕوایش نابێ بەسەرداروسەروەری موسوڵمان، دیسان لەبەر ئەوەیش دەگونجێ کە بیخەڵەتێنێو بەرەبەرە مناڵەکەیش خووە خراپەکانی ئەو بگرێ تووشی بێبڕواییو شتی وا ببێ.

**چــوارەم:** دەبــێ مــەردبێ، دایکــی بــەدکاری نامــەرد مــافی مناڵپەروەردەکردنی نیە، چونکە وەك گوتمان ئەم کارە سەروەریو هەقدارییە، بەدکارو نامەردیش مافی ئەوەیان نیە، سەرەرای ئەوەیش دوور نیە کە چاووراوی لێ بکاو فێری رەفتاری بەدی خۆیی بکا.

**پێنجەم:** دەبێ دەسپاكو ئەمیندار بێ، دایکی دەستپیسی ناپاك مافی پەروەردەی نیە، چونکە دەگونجێ گزیو ناپاکی لە بەخێوکردنیدا بکاو مناڵەکە بفەوتێ.

**شەشەم:** نابێ شووی کردبێتەوە، چونکە خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: تا شوونەکەیتەوە تۆ لە پێشتری بۆ بەخێوکردنی ئەم منالە. سەرەرای ئەوەیش دایك لەکاتی وادا لەبەر خەریك بوون بە خزمەتی مێردو مالیەوە ناپەرژێتە سەر ئەو، شتی وایش زیان لە منال دەدا. بەلام ئەگەر دایك شووی کردەوە بە پیاوێ کە مافی پەروەدەکردنی منالەکەی هەبێ، وەکوو مامو ئامۆزای منالەکە، ئەوە فەرمایشتی هەرە راست ئەوەیە کە ئەو مافەی بۆ هەیە، چونکە ئەو هەقدارە مافی بەخێوکردنی ئەوی هەیە، لە هەمان کاتدا دلسۆزییەتی چونکە کەسیەتی، کەواتە ئەوو دایکەکەی پێکەوە بە باشی سەرپەرشتی دەکەن.

**حەوتەم:** نیشتەجێییە، کاتێ دایك مافی بەخێوکرنی هەیە کە خۆیو باوکی منالەکە لەیەك شاردا نیشتەجی بن، بەلام ئەگەر هەر کامێکیان لەو شارەوە بچن بۆ سەفەری ئیشو کار، وەك سەفەری حەجو بازرگانیو غەزاو عەمرە، ئەوە نابێ مندالەکە لەگەل خۆی ببا بۆ ئەو سەفەرە، چونکە سەفەر جێگەی مەترسیو نارەحەتییە. بەلکوو لەو ماوەیەدا منال لەلای نیشتەجێکە یان دەبێ هەتا ئەویتریان دێتەوە، ئیتر ماوەی سەفەرەکە کورت بێ یا درێژ، بەلام ئەگەر سەفەرەکە سەفەری گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بوو، ئەوە باوك هەقی هەیە کە بیسەنێتەوە لە دایكو لەگەل خۆیدا بێ، بە مەبەستی پاراستنی ناوو رەسەنی خۆی، چونکە رەسەنو بنەچەو بنەمالە بە باوکە بە دایك نییە، سەرەرای ئەوەیش بەرژەوەندی تەمێو ئامۆژگاریو فێرکردن لەوەدایەو ئاسانتریش بەخێودەکرێ. بەلام ئەگەر دایکیش لەو سەفەرەدا لەگەل

باوك بوو ئەوە بەخێوكردن مافی خۆیەتی، هەروا ئەگەر لە سەفەری گواستنەوەیشەوە گەڕایەوە بۆ شارەكەی جارانی مافی بەخێوكردن دەگەڕێتەوە بۆ دایك. مەرجە كە ڕێگە ئەمین بێ‌و ئەو شارەی كە دەچێ بۆی ئەمن‌و ئاسایشی تیابێ، دەنا مافی نیە منالەكە لە ژنە بەخێوكەرەكەی بسەنێتەوە.

**بزانە:**

گشت باوەنەكانی تریش هەمان مافی باوكیان هەیە، دەتوانن لەم كاتانەدا منداڵ لە ژنەبەخێوكەرەكەی بسێننەوە، بەمەرجێ خۆیی بن‌و نامەحرەم نەبن، وەك باپیرەو براو مامە، چونكە ئەمانەیش مافی پاراستنی ناوی رەسەن‌و بنەچەی خۆیان هەیە، هەروا ئەگەر نامەحرەمیش بن، وەك ئامۆزا، بەلام بە مەرجی ئەوە لەم شێوەیەدا منالەكە كوڕ بێ، چونكە ئەگەر كچ بی نادرێ بە دەستی باوانی نامەحرەم، بەلام ئەگەر خزمی خۆیی لە باوان نەبوو لە خاڵوان بوو ئەوە مافی سەندنەوەی نیە، وەك خاڵ‌و مامی دایكی، چونكە ئەمانە مافیان بەسەر رەسەن‌و بنەچەوە نیە.

ئایا بۆ چەسپاندنی مافی دایكی بەخێوكەر ئەگەر منالەكە شیرە خۆرە بوو مەرجەكە مەمكی پێبدا یانا؟ دوو راهەیە، یەكێكیان دەفەرموێ: مەرج نیە، بەلكوو لەسەر باوكە كە دایەنی بۆ بگرێ، رای دروست ئەوەیە: كە ئەوە مەرجە، چونكە زەحمەتە بەكرێگرتنی دایەن.

## ٣٠٢) تاوانكارييەكان (الجنايات):

تاوانكارييەكان زۆرن، چوار جۆريان لە شەرعا تۆڵەيان بۆ دياری كراوە، كە بەو تۆڵەيە لە زاراوی شەرعا پێی دەگوترێ حەدی شەرعی:

**جۆری يەكەم:** ئەو چەشنە تاوانكارييەيە كە زيان بدا لە لەش‌و گيان‌و ئەندام، بەم جۆرە دەگوترێ: كوشتن يان زاماركردن.

**جۆری دووەم:** ئەو چەشنە تاوانەيە كە زيان بدا لە شەرمگاو لەزەتگا، بەم جۆرەيش دەگوترێ: داوێنپيسی‌و حيزی.

**جۆری سێيەم:** ئەو چەشنە تاوانەيە كە زيان بدا لە سامان، ئەمەيان دەبێ بە چەن چەشنەوە، هەر سامانێ بە شەڕ داگير بكرێ، وە ئەو شەڕە هيچ تەئويلێكی بۆ نەكرێ ئەوە فەرهوودو راورووتە، ئەگەر تەئويلی بۆ بكرێ ئەوە بەغيە، واتە: دەسدرێژی‌و زوڵم‌و زۆرە، هەر سامانێكيش بە دزكە بە نهێنی لە شوێنی پاراستنی ئاسايی خۆيدا ببرێ ئەوە دزييە، ئەوەی كە بەهێزی بازوو، وە بە زۆری زۆرداری‌و بەهێزی دەستەڵات‌و بەهۆی بەرزی پايەو پلەوە ببرێ ئەوە زەوت كردنە!.

**جۆری چوارەم:** ئەو چەشنە تاوانەيە كە زيان بدا لە ئابڕوو و لە ناموس‌و شەرەف، بەم جۆرەيش دەگوترێ: بوختان.

١) تاوانكاری كوشتنی بە قەستی (**جناية القتل العمد**): كوشتن سێ جۆرە: كوشتنی بە قەستی پەتی، كوشتنی هەڵەی پەتی، كوشتنی نيوەقەستی‌و نيوە هەڵە، كوشتنی بە قەستی پەتی ئەوەيە: كە بكوژ

نیازی کوشتنەکەیش‌و نیازی کەسە دیاری کراوەکەیشی کردبێ بەهۆی شتێکەوە کە زوربەی کات ئەو شتە کوشندەبێ، خوای ئەوشتە ئامێربێ یاشتی تربێ، وەك چەقۆو دەمانچەو زەهر. دەی ئەگەر بکوژێ نیازی ئیشەکەی نەبوو — واتە: بە مەبەستی کوشتنی کەس ئەو کارەی نەکرد، کە بووە بەهۆی کوشتنی کەسێ — وەك قاچی لە شتێ هەڵکەوێ‌و بکەوێ بەسەر منالێکاو منالەکە بەوە بمرێ — ئەوە تۆڵە لێسەندن‌و کوشتنەوەی لەسەر نیە. هەر وا ئەگەر بەنیازی کوشتنی کەسێکی تایبەت‌و بە نیازی کوشتنی کەس ئەو کارەی ئەنجام نەدابوو ئەوە دیسان کوشتنەوەی لەسەر نیە، وەك کەسێ لە تەقەی خۆشیدا گوللەی وێڵ بیکوژێ‌و دەربکەوێ کە ئەو گوللەیە حەمەلاو تەقاندوویەتی ئەوە حەمەلاو ناکوژرێتەوە لە جیاتی ئەو کوژراوە.

کوشتن بە ئامێرو بەشتی تریش دەبێت، وەك ئەوە: کەسێ بەند بکا نەخۆی نان‌و ئاوی بداتێ‌و نە بهێڵی خۆی هەوڵێکی ئەوە بدا هەتا لە برسانا دەمرێ، ئەوە کوشتنەوەی لەسەرە، هەروا ئەگەر حەپسی بکاو رووتی بکاتەوە هەتا لەسەرمانا بمرێ، یا بە بەندی لەبەر خۆر رایبگرێ هەتا تینی هەتاوەکە دەیکوژێ، ئەمەش کوشتنەوەی لە سەرە، یا وەك ئەوە دووکەس یا پتر شایەتی بدەن کە نەریمان ئەوڕەحمانی کوشت، وەقازی نەریمان لە تۆڵەی ئەوڕەحمانا بکوژێتەوە، پاشان شایەتەکان پەشیمان ببنەوەو بڵێن بە درۆ شایەتیمان لە نەیماندا، ئەمە دەبێ بەهۆی گۆشتنەوەی ئەم شایەتانە. یا وەك ئەوە خۆراکێکی زەهراوی بە نیازی کوشتنی بدا بە کەسێ‌و ئەو کەسە بمرێ، لە کاتی وادا تۆڵە پێویستە. یا وەك ئەوە سەری بیرێ لە دالانێکا بە فێڵ بگرێ‌و میوانێ

دەعوەت بکا بۆ ماڵەوەی بە نیازی ئەوە کە بە نامەردی بیخاتە ئەو بیرەوە، ئەویش لەسەر شوێنەکەوە بڕواو بکەوێتە ناو بیرەکەو بمری ئەمەیش کوشتنەوەی لەسەرە.

**بزانن:**

کە مرۆڤ کوشتن بە ناڕەوا تاوانێکی گەلێ گەورەیە لە پاش بێباوەڕی بە خوای گەورە گەورەترین گوناهی گەورەیە، ئایەتو حەدیثی زۆر فرە هەیە کە هەڕەشەی سەخت دەکا لە کاری وا ناهەمواری نالەباری ناڕەوا، وەك: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا – سورة النساء – ٤/٩٣} واتە: هەر کەسێ بە ناڕەوا موسوڵمانێ بە قەستی بکوژێ، ئەوە سزای ئەو بکوژە دۆزەخەو حاڵی وایە هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە). لە صەحیحی موسلیمدا حەزرەت واتە: بنووسرێ {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: بە هیچ جۆرێ کوشتنی موسوڵمان دروست نیە، مەگەر بەیەکێ لەم سێ شتە: موسوڵمان بووبێو لە ئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، یا خاوەن هاوسەر بووبێو لە پاشا داوێنپیسی بکا، یا بە ناهەقو بە زۆری زۆرداری مرۆڤێکی بێ تاوانی کوشتبێ. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: لەلای خودای گەورە ئەم جیهانە هەمووی لەناو بچێ نەوەکا موسوڵمانێ بە ناڕەوا بکوژرێ (تیرمیذیو نەسائی بە رشتەیەکی ساخ گێڕاویانەتەوە) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: هەر کەسێ کۆمەکی بکا لەسەر کوشتنی

موسوڵمانێ به ناڕەوا با بەنیو وشەیش بێ[1]، ڕۆژی قیامەت کە دەچی بۆ دیوانی خوا، بۆ پرسینەوە، لەناو چاوانی نووسراوە: ناهومێد لە ڕەحمەتی خودا.

## بڕیاری کوشتنی قەستی:

هەر کەسێ لەسەر ئەو شێوەی باس کرا موسوڵمانێ بە ئارەزوو بە ناڕەوا بکوژێ کوشتنەوەی پێویست دەبێ، بەپێی ئەم ئایەتە: {كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى - سورة البقرة - ١٧٨/٢} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! خوداوەندی مەزن داینـاوە لە سەرتان، تۆڵە سەندن لەهۆی کوژراوەکانەوە، بە یەکسانی، بەم ڕەنگە لەباتی ئادەمیزادی کوژراوی ئازاد ئادەمیزادی بکوژی ئازاد دەکوژرێتەوەو لە جیاتی بەندە بەندەو لە باتی مێیینە مێیینە) بەپێی ئەم ئایەتەی تریش: {وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ - سورة البقرة - ١٧٩/٢} واتە: ئەی هۆشمەندان و هۆشیاران! لە دامەزراندنی یاسای تۆڵە سەندندا بە یەکسانی، کە بریتییە لە کوشتنەوەی بکوژ لەباتی کوژراو، بۆ ئێوە، هەیە ژیان و

---

[1] لە (النهاية في غريب الحديث والاثر)دا دەفەرموێ: (وەك ئەوە بڵێ: ئوق لە وشەی (ئوق تول)دا، واتە پێی بڵێ: بیك لە وشەی (بیکوژە)دا ئەمە لە چەشنی ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە {دروودی خوای لەسەربێ} کە دەفەرموێ: كفى بالسيف شا) یرید شاهدا. خوا پەنامان بدا، بەراستی لە وڵاتی ئێمەدا پیاو کوشتن لە ئاو خواردنەوە ئاسانترە. سەد پیاو بکوژەو بچۆرە پاڵی حیزبێ ئیتر دەبی بە پاڵەوان.

- وەرگێڕ -

زیندەگییەکی گەورەو بەنرخ). بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش {درووده خواه لەسەربێ} کە دەفەرموێ: (بەهیچ جۆرێ کوشتنی موسوڵمان دروست نیە، مەگەر بەهۆی یەکێ لەم سێ شتەوە..تاد) لە (صەحیحەین)و شوێنانی تریشدا هەیە کە حەزرەت {درووده خواه لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ کەسێکی بکوژرێ خۆی سەرپشکە لەیەکێ لەم دوو کارە کامیان بەباش دەزانێ ئەوەیان هەڵبژێرێ: یا خوێن وەربگرێ، یا بکوژ بکوژێتەوە.

جا لەسەر ئەم بنیاتە هەقداری کوژراو هەقی کوشتنەوەی بکوژی هەیە، بەچی شێوەیەك کوژراوەکەی کوشتووە رێك ئاوا بەبێ زیادەو ئەتك پێکردن بیکوژێتەوە، وەك زاتی پاك دەفەرموێ: {وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ – سورة الإسراء – ٣٣/١٧} واتە: وە هەرکەسێ بە ناڕەوا کوژرا شەریعەتی خودا رێگەی هەقدارەکەی دەدا کە تۆڵە لە بکوژەکەی بە تەواوی بسێنێ، وەنابێ ئەو هەقدارە زیادەڕەوی لە کوشتنەوەکەدا بکا.

جا گریمان بکوژ بە ئامێرێ زەلامەکەی کوشتبوو، وەك ئەوە بە گوللە کوشتبووی، خۆشی بە گوللە دەکوژرێتەوە، ئەگەر بە زەهر کوشتبووی، - کە ئامێر نیە – خۆشی بە زەهر دەکوژرێتەوە، ئیتر هەروا، نابێ زیادەڕەوی لە کوشتنەوەکەدا بکا، وەك ئەوە ئەتکی پێ بکا، جا هەر وەك مافی تۆڵە سەندنی هەیە مافی ئەوەیشی هەیە کە بکوژەکە ببەخشێ. وەك خوای مەزن دەفەرموێ: {فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ – سورة البقرة

- ٢/١٧٨} ئەگـەر کوژراوەکـە خـۆی لــە پــێش گیــان دەرچــوونیا بکوژەکەی ئازاد کرد لە خوێنی خۆی، یا یـەکێ لـە کـەس و کـاری کـوژراو بکـوژی ئـازاد کـرد لـە بەشـەکەی خـۆی لـەو خوێنـە، ئـیتر نابـێ بکـوژ بکوژرێتەوە، وەدەبێ بـەپێی بـاوی نـاو خۆیـان و لەسـەر یاسایەکی جـوان خوێن وەرگرن، وە بکوژیش خوێنەکە بدات بە خاوەن خوێن بـە چـاکی) مەبەسـت لـە (عـەفو) لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا ئەوەیـە کـە هەقـدار واز لـە کوشـتنەوە بێنـی لـە کوشـتنی بـە قەسـتیدا، لـە جیـاتی ئـەوە بـە خـوێن وەرگرتن رازی بێ. ئیتتیباع بە مەعروفیش ئەوەیە کە خاوە، خـوێن لـە داوای خوێنـدا تونـدی و تیـژی بـەکار نـەهێنێ. بکـوژیش دەبـێ بـەبێ بەقنگاخستن و خاوەن خـاو خوێنەکـە بـە تـەواوی بـدا. ئـەم داسـتانەیش دیسان بەڵگەی ئەوەیە کە هەقدار خۆی سەر پشکە یـا هـەق دەسـێنێ یـا بکوژ لە کوشتنەوە ئازاد دەکا. حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فـەرمووی: ئـەی کۆمەڵەی خوزاعە! ئەوەتا ئێوە ئەم کوژراوەتـان کوشـتووە، کـە لـە هـوزی هوزەیلە، ئەوا من بەخودا خوێنەکەی دەدەم، بـەڵام لـەپاش ئـەم رووداوە هەرکەسێ کەسێ بکوژێ، کەسوکارەکەی خۆیـان سەرپـشکن، کـام لـەم دوو کارە بە چاك دەزانن ئەوە هەڵبژێرن:ئەگەر پێیان خۆش بوو ئـەوا بکـوژ بکوژنـەوە، ئەگـەر پێـشیان خـۆش بـوو خـوێن وەربگـرن. (ئـەبو داوود / تیرمیذی).

جا وەك گوترا خاوەن ماف ئەگەر تۆڵەی سەند ئەوا کارەکـە دیـارو ئاشکرایە، ئەگەر کابرای بەخشی خـوێن پێویـست دەبـێ کـە برێتییـە لـە سەد وشتر، دەدرێ لە خوێنی موسوڵمانی ئازاددا، جا ئەگـەر کوشـتنی بـە قەستی بوو ئەوا بە لە سێ رووەوە خوێنەکە قورستر دەبێ.

**یەکەمیان:** خوێنەکە دەکەوێتە سەر خودی بکوژەکە، ناکەوێتە سەر کەسوکارەکەی (عاقلە).

**دووەمیان:** پێویستە دەسبەجێ بەبێ دواخستن.

**سێیەمیان:** بەم شێوە قورستر دەکرێ: هەم ساڵی وشترەکان گەورە دەکرێن، هەم بەشەکان لە پێنج بەشەوە دەکرێن بەسێ بەش لەسەر ئەم شێوەیە: پێویستە بکوژ خۆی لە ماڵی خۆی ئەم ژمارە وشترانە بدا لە خوێندا: سیی وشتری مێچکەی سێ سالانە، سیی وشتری مێچکەی چوار ساڵانە، چل وشتری ئاوس، بەڵگەی ئەم بڕیارە ئەم فەرموودەیەتی {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ بە ئارەزوو موسوڵمانێ بکوژێ ئەوە دەدرێتە دەستی خوێنڕەسەکانی کوژراوەکە، ئیتر ئەوان ئارەزووی خۆیانە یا بکوژ دەکوژنەوە، یا خوێن وەردەگرن، خوێنباییش سەد وشترە، لەسەر ئەم شێوەیە: سیی وشتری مێی سێ ساڵەو سیی وشتری مێی چوار ساڵەو چل وشتری ئاوس. وە هەردوو لایش لەسەر هەرچی رێك بکەون دروستە ئەمەیش بۆیە وایە تا خوێنبایی گران بێ‌و خەڵك سڵ لە خوێن رشتن بکاتەوە (تیرمیذی‌و ئەبو داوود – تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی غەریبە).

٢) کوشتنی هەڵەی پەتی (الخطأ المحض): هەڵەی پەتی بەم دوو نموونەیە روون دەکەینەوە:

**یەکەم:** وەك ئەوە تیری بنێ بە شتێکەوە، وابزانێ کە نێچیرە، یا درندەیە، یا شتێ تری خوێن رەوایە، بەڵام بەر پیاوێ بکەوێ‌و بیکوژێ.

لـەم نموونـەدا بکـوژ نیـازی ئیـشەکەی بـووە، بـەڵام نیـازی کەسـەکەی نەبووە.

**دووەم:** نـە نیـازی ئیـشەکەو نـە نیـازی کەسـەکەی نـەبێ، وەك لـە کاتێکا کە بە ڕێگەدا دەڕوا پێی هەڵکەوێ لە منداڵێك و بکەوێ بـە سـەریاو بیکوژێ، یـا شـتێکی کوشـندەی بـە دەسـتەوەبێ دەسـتی بلـەرزێ و بـڕژێ بەسەر کەسێکاو بیکوژێ.

## بڕیاری کوشتنی هەڵە:

پێویـستبوونی خوێنباییـە، بـەپێی ئایـەتی: {وَمَـن قَتَـلَ مُؤْمِنًـا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ – سورة النساء – ٩٢/٤} واتە: موسوڵمانێ بە هەڵە موسوڵمانێ بکـوژێ ئەوە پێویـستە لەسـەری کـە بەندەیـەکی موسـوڵمان ئـازاد بکـا وە خـوێنیش بـدا بـە خوێنڕەسی ئـەو کـوژراوە). ئـەوەتا لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا خـودای گـەورە خوێنبایی پێویست کردووە بەڵام باسی تۆڵە سەندنی نەهێناوەتە ئاراوە. لە فەرموودەدا هەیە کە حـەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) نامـەیێ دەنوسـێ بـۆ خەڵکی وڵاتی یەمـەن تیایـدا دەفـەرموێ: خوێنبـایی مـرۆڤ سـەد وشـترە. خوێنبایی لە کوشتنی هەڵەی پەتیدا لەسێ لاوە سووك دەکرێ:

**یەکەم:** خوێنەکە لە جیاتی سێ بـەش دەکـرێ بە پێـنج بەشـەوە لەسەر ئەم شێوەیە: بیست وشتری مێچکەی یـەك ساڵانە، بیـست وشـتری مێـچکەی دوو ساڵانە، بیـست وشـتری نێـری دوو سـاڵانە، بیـست وشـتری مێچکەی سێ ساڵانە، بیست وشـتری مێـچکەی چوار سـاڵانە. بـەپێی ئـەو

فەرموودەیە کە ئیبنو مەسعوود گێڕاویەتەوە، کە ئەم تەفصیلاتەی تیادایە، کە هەندێ وایان گێڕاوەتەوە کە ئەو فەرموودەیە فەرمایشتی پێغەمبەرە. بەهەر حاڵ رای جەماوەری هاوڕێیانی پێغەمبەر لەسەر ئەوەیە کە خوێنبایی هەڵە دەگرێ بە پێنج بەشەوە.

**دووەم:** خوێنبایی لەم کاتەدا دەکەوێتە سەر کەس‌و کاری کابرای بکوژ، کە پێیان دەگوترێ (عاقیلە) کە بریتین لەو نێرینە تەکلیف لە سەرانە کە لەکاتی روودانی تاوانەکەدا هەن‌و ئەگەر کابرای تاونکار بمرێ کەلەپووری لێ دەبەن، بە مەرجێ بنەچەو وەچەی تاوانکارەکە نەبن، وەك باوك‌و دایك‌و باپیرو نەنك‌و کوڕو کچ، ئەمانە لە کەسوکاری بە واتا (عاقیلە)نین. سەربەڵگەی ئەم بڕیارە ئەم فەرموودەیە: ئەبو هورەیرە {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دوو ژنی هوذەیلی بوو بە شەڕیان یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان‌و خۆی‌و سکەکەی کوشت، جا کە بۆ دادخوایی دادیان بردە لای خۆشەویست {دروودی خوای گەورەی لەسەربێ} بڕیاریدا: کە خوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندەبێ یا کەنیزەك بێ دەبێ وە بڕیاریشیدا کە خوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی یکەکەی لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارەکەیە، نەك لەسەر ژنەکە خۆی. وە کەلەپووری ژنە کوژراوەکەیشی دا بە منداڵەکانی‌و بە خزمەکانی تری.. تا کۆتایی فەرموودەکە کە بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی گێڕاویانەتەوە (دانەر – رەحمەتی خوای لێبێ} بە تەصەرووف فەرموودەیەکی راپێچ کردبوو. بەندە دەقەکەیم لە تاجول ئوصولەوە راگوێز کرد – وەرگێڕ).

بۆیەکا لەم بارەدا خوێن دەکەوێتە سەر خوێنڕەسەکان، چونکە هەڵەو نیمچە هەڵە زۆر روو دەدەن، لەبەر ئەوە و بەباش دەزانرێ کە کۆمەکی تاوانبار بدرێ، تا تووشی هەژارای‌و دەسکورتی نەبێ‌و بەهۆی هەژاریشەوە تووشی دەیان هەڵەی تریش نەبێ، کابرا خۆشی بۆرە مەهانەیەکی هەیە، بە پێچەوانەی کوشتنی بە قەستییەوە، چونکە ئەو بەهیچ جۆر مەهانەدار نیە، لەبەر ئەوە شایستەی یارمەتی‌و دڵ پێسووتان نیە، لە هەمانکاتدا ئەم خوێنە بە چەند قیستێ دەدرێ، خوێنی نێرینەی موسوڵمان بە ماوەی سێ ساڵ دەدرێ، هەر ساڵەی سێ یەکی دەدرێ، خوێنی ژنە موسوڵمان بە دوو ساڵ دەدرێ خوێنی بێبڕوا بە یەك ساڵ دەدرێ، لەبەر ئەوە دانەکەی زۆر گران نابێ لە سەریان. (ئەمەی کە نوسیمان لە بارەی خوێنی ژن‌و خوێنی بێبڕواوە قسەی شەریعەتی ئیسلامی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم‌و دەقی فەرموودەی ئەصەححی مینهاجە. بەڵام دانەر رای بە جۆرێکی ترە بۆیە لە برگەی سێیەمدا دەفەرموێ):

**سێیەم:** خوێنەکەیش بە قیست لە ماوەی سێ ساڵدا دەدرێ شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئاگام لێ نیە کە کەسێ هەبێ لاری لەوە هەبێ کە ساخ بۆتەوە کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بڕیاری داوە کە ئەو خوێنەی خوێنڕەس بیدەن بە سێ ساڵ ئەدرێ.

وەکی تریش عومەرو عەلی‌و ئیبن‌و عەبباس‌و ئیبن‌و عومەر {رەزای خوای لێبێ} وەهایان داناوە کە ئەم جۆرە خوێنە لە ماوەی سێ ساڵدا بدرێ، وە کەسیش رەخنەی لە بۆ چوون‌و رای ئەم زاتانە نەگرتووە، لەبەر

ئەوە بڕیارەکەیان بووە بە یەکگرتن، چونکە ئەم زاتانە لە زانا گەورەکانی سەحابەکانن، شتی و گرنگ لە ئاییندا بەرای خۆیی نالێن، مەگەر بە (توقیف)[1].

٣) کوشتنی نیمچە قەستیو نیمچە هەڵە. نیمچە قەستی ئەوەیە نیازی ئیش (فیعیل)ەکەو کەسەکەی هەبێ، بەلاّم بە شتێك ئیشەکە ئەنجام بدا کە زۆرتر وابێ کوشندە نەبێ، وەکوو بە قەمچی یا بە تووڵێ یا بە بەردێکی بچووك بدا لە کەسێو بەو لێدانە سووكو کەمە بەرێکەوت بمرێ. بەم جۆرە کوشتنە کوشتنەوە پێویست نابێ، بەلاّم خوێنێکی قورس دەکەوێتە سەر خوێنرەس (عاقیلە) بەپێی تەمەنی وشترەکانو ژمارەی ساڵەکان کەسێنو زیاتر نین خوێنەکە قورسە، جا پێویستە کە سیی وشتری مێچکەی سێ ساڵانەو سیی وشتری مێچکەی چوار ساڵانەو چل وشتری ئاوس بدەن بە خاوەن خوێن. بەپێی ئەوەش کە دانی خوێنەکە دەس بەجێ نیەو مۆڵەتدارە هەتا سێ ساڵ دادەنرێ بە خوێنی سووککراو. بەڵگەی ئەمەیش داستانی دوو ژنە هوذەیلییەکانە کە لە پێشەوە رابورد.

بەلاّم ئەگەر کابرای کوژراو منالّ بوو، یا نەخۆش بوو، وە زوربەی کات وەك گەورەو ساخ بەرگەی ئەو جۆرە لێدانەی نەدەگرت، یا گەورەو بەهێزبوو بەلاّم کابرای تاوانبار کەرکوژی بەو تووڵە یا بەو قەمچییە

---

[1] تەوقیف ئەوەیە سەرچاوەی زانیاری لە بارەی بڕیارو چۆتیتیو هەوالّی شتەوە بگەڕێتەوە بۆ سەر سرووشی خوایی.

- وەرگێڕ-

دایگرت هەتا مرد، ئەوە دادەنرێ بە کوشتنی بەقەستی، وەکو شتنەوەی دەکەوێتە سەر (واتە: ئامێرو هۆی تاوان بەپێی کەس‌و بارودۆخ دەگۆڕێ – وەرگێڕ).

## ٣٠٢) مەرجەکانی پێویستبوونی تۆڵەسەندن:

**ئەم چوارە لەکاتی مسۆگەر بوونی کۆشتنەوەدا مەرجن:**

**مەرجی یەکەم:** دەبێ بکوژەکە تەکلیفی لەسەربێ، واتە: ڕەسیدەو هۆشیاربێ‌و بێبەڕوای جەنگکەر نەبێ. کەواتە کوشتنەوە نیە لەسەر نارەسیدەو شێت، چونکە وەك لە پێشەوە لە فەرموودەدا رابورد ئەم جۆرە کەسانە تەکلیفیان لەسەر نیە، هەروا خەوتوویش کە لە خەودا بەبێ ئاگا بەدەم خەوەوە بتلێتەوە بەسەر کەسێکداو بیکوژێ، ئەمیش تۆڵە سەندنی لەسەر نیە بەپێی هەمان فەرموودەی پێشەوە، هەروا کوشتنەوە لەسەر زیندەوەریش نیە، چونکە ئاژەڵ‌و زیندەوەران، مرۆڤی لێ دەرچێ، تەکلیفیان لەسەر نیە.

بەڵام هەموو کاتێ بوونی هۆشی ساخ مەرج نیە، وەك ئەوە کابرای بکوژ بە ئارەزوو، بەبێ مەهانەی ڕەوا، خۆی سەرخۆش بکا بە شتێکی نارەوا، کە پێی دەگوترێ سەرخشیی تاوانکار، لەم کاتەدا تۆڵەی لەسەرە. هەروا ئەگەر بە خواردنەوەی دەرمانێ کە پێی تاوانیار ببێ هۆشی خۆی لاببا، هەروەك لەم حاڵانەدا تەڵاقی تەڵاقخۆریش دەکەوێ، نەك هەر تەڵاق بەڵکوو لەسەر هەموو کردارێکی تریش بەر پرسیارە.

له هه‌مان کاتدا ئه‌گه‌ر بڕیاری کوشتنه‌وه‌ی نه‌ده‌ین مه‌عنای وایه ڕێخۆش ده‌که‌ین بۆ هه‌موو که‌سێ، هه‌ر کاتێ ویستیان که‌سێ بکوژن بچن له پێشدا خۆیان سه‌رخۆش بکه‌ن هه‌تا نه‌کوژرێنه‌وه! ده‌ی شتی واته: سه‌رده‌کێشێ بۆ خوێنڕشتنی زۆری ناڕه‌وا.

**مه‌رجی دووه‌م:** ئه‌وه‌یه که بکوژه‌که زیادی نه‌بێ به‌سه‌ر کوژراوه‌که‌دا، به‌هۆی ئیسلامه‌وه، که له‌م کاته‌دا کوژراو به سیفه‌تی بێبڕوایی که‌میی هه‌یه به‌رابه‌ر بکوژ، که‌واته: موسوڵمان ناکوژرێته‌وه له جیاتی بێباوه‌ڕ (ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم {ره‌زای خوایان لێبێ} فه‌رمووده‌یه‌کیان له‌م بابه‌ته‌وه گێڕاوه‌ته‌وه) (بڕوانه تاجول نوصول به کوردی ب – ١ ل – ٨٨ ز – ١٦ ف – ١ + ب – ٣ ل ٢٧٥ ف – ١ ز – ٩٩ – وه‌رگێڕ) ئه‌مه‌ی که ده‌فه‌رموێ: موسوڵمان له جیاتی بێ بڕوا ناکوژرێته‌وه مه‌ذهه‌بی مالیك‌و ئه‌حمه‌دو ئیسحاقه. ئه‌بو حه‌نیفه ده‌فه‌رموێ: موسوڵمان له جیاتیی بێبڕوای په‌نادراو (ذمی - ئه‌و کافرانه‌ی له په‌نای ئیسلامدا ده‌ژین) ده‌کوژرێته‌وه، به‌ڵام له جیاتی بێبڕوای په‌یماندار (موعاهه‌د – خاوه‌ن عه‌هدو په‌یمان، به‌ڵام له وڵاتی خۆی بژی، نه‌ك له‌ناو موسوڵماناندا)و له جیاتی بێبڕوای جه‌نگی ناکوژرێته‌وه.

**هه‌قایه‌تێ ده‌ڵێ:** جارێ موسوڵمانێ بێبڕوایێ ده‌کوژێ، بۆ دادگایی ده‌یبه‌ن بۆ خزمه‌ت ئه‌بو یوسف – که یه‌کێکه له شاگرده گه‌وره‌کانی ئه‌بو حه‌نیفه – ئه‌بو یوسف بڕیار ده‌دا که موسوڵمانه‌که له جیاتیی

بێبڕواکه بکوژرێتەوە، جا پیاوێ کاغەزێکی بۆ دەبا ئەم شیعرانەی تیا دەبێ:

| | |
|---|---|
| یـــا قاتـــل المـــسلم بالكـــافر | جـــرت، ومـــا العـــادل كالجـــائر |
| يـــا مـــن ببغـــداد وأطرافهـــا | مـــن فقهـــاء النـــاس أو شـــاعر |
| جـــار علـــى الـــدين أبـــو يوســف | بقتلـــــه المـــــسلم بالكـــــافر! |
| فاســترجعوا وابكـــوا علـــى ديـــنكم | واصــــطبروا فـــالاجر للـــصابر |

**واتـــە:**

لـــە جیـــاتی کـــافر دەکـــوژێ موســـوڵمان!

کـــەی ئەمـــە دادە ئـــەی خـــاوەن وێـــژدان

ئـەی خـەڵکی بەغدا، ئـەی خـەڵکی جیهـان!

لـــە مـــەلای زانـــاو لـــە شـــاعیری جـــوان

وا ئـــەبو یوســـف دینتـــانی فـــەوتان:

لـــە جیلتییـــی کـــافر دەکـــوژێ موســـوڵمان

(انـــا لله) کـــەن، بگـــرین بـــۆ دینتـــان

پاداشـی خـۆگـر واتـە: لـەلای یـەزدان!!!

هەروا دەبێ بکوژەکە زیادی نەبێ بەسەر کوژراوەکەدا بە ئازادی. کەواتـە: ئەگـەر ئـازادێ بەنـدەیێ بکـوژێ ناکوژرێتـەوە لـە جیـاتیی. خـوای ئـەو کۆیلەیـە بەنـدەبێ، یـا پاشـەمەرگە (مودەببـەر)بـێ، یـا کاغـەز پێـدراوبێ، یـا کـەنیزەکی دایکـی منـاڵ بـێ، بـەپێی ئایـەتی {الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ زنجيره - ٢٩٨}.

ئیمامی عەلی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: بووە بە یاسای شەریعەت کە ئازاد لە جیاتیی بەندە ناکوژرێتەوە. بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە: (کە ئەندامەکانی موسوڵمانی ئازاد لە جیاتیی ئەندامەکانی کۆیلە نابڕرێن، کەواتە: چۆن گیانی لە جیاتیی گیانی ئەو دەردەکرێ، ئەم خراپترە چۆن شتی وا دەبێ).

**مەرجی سێیەم:** نابێ بکوژەکە باوکو باپیرو دایکو نەنکی کوژراوەکەبێ، با بەرەو ژوورتریش بێ، واتە: بنچینە ناکۆژرێتەوە لە جیاتیی وەچەی خوێ، بەپێی ئەم فەرمایشتەی عومەر {ڕەزای خوای لێبێ} کە لەهۆی داستانێکەوە دەفەرموێ: (لەبەر ئەوە نەبێ کە بەگوێی خۆم لە زاری پێغەمبەرم بیستووە {درودی خوای لەسەربێ} دەیفەرموو: باوک ناکوژرێتەوە لە جیاتی کوڕی خۆی، لەبەر ئەمە نەبوایە دەم کوشتیتەوە. دەی زووکە خوێنەکەی بێنە، ئەویش خوێنەکەی هێنا بۆ عومەر، عومەریش دایە دەستی کەلەپوور گرەکانی کوژراوەکە) (بەیهەقی، دەیش فەرموێ: رشتەکەی دروستە، حاکمیش هەروا دەفەرموێ). وەکی تریش بنچینە هۆی پەیدا بوونی نەوەی خۆیەتی، لەبەر ئەوە نابێ وەچەی خۆی کە خۆی مایەی بوونیەتی ببێ بەهۆی نەمانو فەوتانی ئەو.

**مەرجی چوارەم:** ئەوەیە کە خوێنی کوژراوەکە پارێزراوبێ ئەگەر وا نەبوو خوێنی بەفیڕۆ دەڕوا، وەك ئەوە داوێنپیسی هاوسەر داربێ (زان محصن) خوای داوێنپیسیەکەی بە بەڵگەو شایەت چەسپابێ یا بە پێلێنان.

# ٣٠٤) کۆمەڵێ لە جیاتیی یەك کەس دەکوژرێنەوە:

هەر کاتێ چەند کەسێ بە هاوبەشی کەسێکیان کوشت، وە مەرجەکانی تۆڵە سەندن هاتنەجێ، ئەوە هەموویان دەکوژرێنەوە، بە مەرجی ئەوە کە کاری هەرکامەیان بە تەنها بگیرێ ببێ بەهۆی کوشتنی کوژاروەکە، چونکە ئەم ئایەتە گشتایەتی دەگەیەنێ کە دەفەرموێ:
{وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا} .

لەبەر ئەوەیش کە ئیمامی عومەر {رەزای خوای لێبێ} حەوت کەس یا پێنج کەسی لە خەڵکی صەنعای یەمەن لە جیاتی یەك کەس کوشتەوە، وە فەرمووی: ئەگەر سەرجەم خەڵکی یەمەن دەستیان لە کوشتنی ئەم کوژراوەدا هەبوایە هەموویانم وەك ئەم چەند کەسە لە جیاتی دەکوشتەوە. هەروا ئیمامی عەلیش {رەزای خوای لێبێ} سێ کەسی کوشتەوە لە تۆڵەی یەك کەسدا، موغیرەیش {رەزای خوای لێبێ} حەوت کەسی کوشتەوە لە تۆڵەی کەسێکدا. ئیبنو عەبباسیش {رەزای خودا لە هەموویان بێ} دەفەرموێ: ئەگەر کۆمەڵێ بگەنە سەد کەسیش یەکێ بکوژن بڕیاری کوشتنەوەی هەموویان دەدەم. کەسیش رەخنەی لەم فەرمایشتەی ئیبنو عەبباس نەگرتووە، لەبەر ئەوە بووە بە یەکگرتن، دیسان لەبەر ئەوەیش کە هەتا یەکێ لەو بکوژانە بمێنێ کەسوکاری کوژراوەکە ئۆخەی ناکەن، وە لەسەر ئەم شێوەیەیش تۆڵە نەسێنرێ چاوترسان دروست نابێ!.

## ٣٠٥) تۆڵەی ئەندام (قصاصی ئەطراف):

هەر وەك چۆن هاوكفیو هاوچەشنیی بكوژو كوژراو مەرج بوو بۆ تۆڵە وەرگرتن لە بكوژ، ئاوەها هاوسانیو هاو چەشنیی ئەندامی هەردوولا مەرجە. دەی ئەگەر كەسێ لە جیاتی كەسێ نەدەكوژرایەوە، وەك ئەوە بكوژ بنچینەی كوژراو بوو، ئەوە ئەندامیشی لە جیاتیی ئەندامی ئەو كەسە نابڕێتەوە، چونكە هاو چەشنیی پێویست فەوتاوە، كەواتە: دەستی موسوڵمان لە جیاتی دەستی بێبڕوا نابڕێ، هەروا دەستی ئازاد لە جیاتی دەستی كۆیلە، هەروا دەست لە جیاتی پێ نابڕێ، هەروا لووت لە جیاتی گوێ، هەروا دەستی ڕاست لە جیاتی دەستی چەپ، یا دەستی چەپ لە جیاتی دەستی ڕاست نابڕێ. هەروا هەموو ئەندامەكانی تریش. نە چاوی ڕاست لە جیاتی چاوی چەپو نە چاوی چەپ لە جیاتی چاوی ڕاست كوێر دەكرێن، وە نەلێوی خواروو لە جیاتی لێوی سەروو دەبڕێ، نە بە پێچەوانەوە، نە پەنجە تووتە لە جیاتی پەنجە كەڵە دەبڕێ نە بە پێچەوانەوە، وە نە سەر پەنجەی پەنجەیێ لە جیاتی سەر پەنجەی پەنجەیەكی تر كە لە چەشنی خۆی نەبێ دەبڕێ، چونكە هاو جۆریو هاو وێنەیی فەوتاوە، چونكە هەر ئەندامەی ڕێگەو جێگەو قازانجی تایبەتی خۆی هەیە كە جیایە لە هینی ئەوانی تر. هەروا دەستی ساغ لە جیاتیی دەستی ئیفلیج نابڕێ، یا چاوی ساغ لە جیاتیی چاوی كوێر دەرناهێنرێ یا كوێر ناكرێ، بە پێچەوانەی گوێچكەی ئیفلیجەوە كە لەجیاتی گوێچكەی ساغ دەبڕێ، چونكە كەڵكی هەرماوە، دەنگ كۆ دەكاتەوەو جرو جانەوەریش لە كركراگە دوور دەخاتەوە.

## ٣٠٦) تۆڵەی برین (قصاص له جراحاتدا):

هەر وەك تۆڵەی سەرو تۆڵەی ئەندام دەستێنرێ تۆڵەی چەند برینێکی تایبەتیش دەستێنرێ. بەپێی ئەم فەرمایشتەی زاتی مەزن: {وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ – سورة المائدة – ٤٥/٥} واتە: هەر برینێ مەودای ئەوەی هەبێ کە تۆڵەی بسێنرێ بەبێ زیادو کەم تۆڵەی بەپێی خۆی دەستێنرێ).

**روونکردنەوەیێ:**

برین هەیەتی جیاکەرەوەی پارچەیەکە لە لەش، هەیەتی جیاکەرەوە نیە، برینی جیاکەرەوەیش یا لە جمگەدا دەبێ، یا لە شوێنێکی تردا دەبێ، جا ئەگەر لە جمگەدا بوو ئەوە تۆڵەی هەیەو بە دوورو درێژی لەناو کتێبەکانی شەریعەتدا باسیان کراوە، ئەگەر برین لە جمگەدا نەبوو ئەوە تۆڵە (قیصاص)ی نیە، چونکە ئەستەمە زەبتی هاو وێنەیی لە نێوانی برینی تاوانکارو برینی هەقسێندا بکرێ، وەك ئەوە دەستی لە نیوەی لەپیدا بکرتێنێ، ئەمە تۆڵەی ناسەنرێ، بەلام (حوکوومەتی) نیو لەپی هەیە، لەسەر فەرمایشتی فەرموودەی دروست (حوکومەت: برێتییە لە ئەندازەیەك پارە کە حاکم بڕیاری دەدا بە بەرابەر بەو شکستەیە – شەریعەتی ئیسلام. مامۆستا عبدالکریم - وەرگێڕ) گریمان لە ناوەڕاستی باسکیدا دەستی کرتاند، لەمووچی دەستیدا دەستی دەبڕێ حوکوومەتی نیوەی باسکیشی لێ دەستێنێ، ئەگەر بەخشی ئەوە خوێنی لەپی دەکەوێ لەگەڵ حوکوومەتی نیوەی

باسکی، شکاندنی ئێسکیش تۆڵەی نییە،چونکە لە شتی وادا هاو وێنەیی دابین ناکرێ، بەڵام دەقەبڵێنرێ بە پارەوپارەکە دەدرێ بەئێسك شکاوەکە،وەکی تریش جیاکردنەوەی پارچەیش لەلەش ئەگەر لە جمگەدا بوو ئەوە تۆڵە پێویستە. ئەمانە دادەنرێن بەجمگە: سەرپەنجە، گرێ پەنجە، مووچ، کەشکەژنۆ، جمگەی پێ، جمگەی ڕان سەرجمگەی شان، جا ئەگەر دەتوانرا تۆڵە وەربگیرێ ئەوا تۆڵە وەردەگیرێ، لەجیاتیی دەست دەستی دەبڕرێ، بەڵام بەمەرجێ نەبێ بەهۆی ئەوە کە تەنیشتی ئەندامە بڕاوەکە کونی تێ ببێ‌و ناوسکی دەربکەوێ، ئەگینا تۆڵە سەندنیان تیا دروست نییە، گەرچی تاوانکار ناوسکیشی دەرخستبێ، چونکە ئەم جۆرە برینە قولانە زەبت ناکرێن،شتیش کە ئەندازەی نەزانرا تۆڵەی ناسەنرێ. هەر برینێ ئەندام لە لەش جیا نەکاتەوە تۆڵەی تیا نییە، یەك جۆرە برین نەبێ کەپێی دەڵێن: (موضحة: ئێسك دەرخەر) ئەم جۆرە برینە لە سەرو روخسارو سینگ‌و شوێنەکانی تری لەشیش دەکرێ، وەك باسك‌و وردیلەی پەنجە، بۆیە وا ناو نراوە چونکە پێست‌و گۆشت لە ئێسك دادەماڵێ‌و ئێسکەکە دەردەخا. برینی ئێسك دەرخەر بۆیە قیصاصی تیادا هەیە چونکە هاووێنەیی لە ئەندازەی روبەردا دابین دەکرێ، جا ئەگەر قرۆنجانەکە لەسەردا بوو، ئەوا بە موسێ سەری تاوانبار دەتاشرێ، ئەوجا بەقەد ئەندازەی برینی تاوان لێ کراو لەسەری تاوانکار دیاری دەکرێ، ئەوسا بە تێغێ ئێسقانەکەی دەردەخرێ! بەڵام نابێ بە شمشێر ئەم تۆڵە سەندنە ئەنجام بدرێ، چونکە دەمی شمشێر گەورەیە، کەمی‌و زۆریی برینەکەی پێ دابین ناکرێ، هەروا نابێ بە بەردو داردەستیش برینەکە لە لەشی تاوانبار

دروست بکرێ، با تاوانبار بەم شتانەیش برینەکەی لە جەستەی تاوان لێ کراو کردبێ، چونکە ئەم جۆرە برینە مەترسیدارانە بەم جۆرە ئامێرانە سەیتەرە ناکرێ بە سەریانداو کونترۆڵی لەمپەریان ناکرێ. بایەخ دانانرێ بۆ ئەستوری‌و تەنکی‌و کەم‌و زیادی پێست‌و گۆشت‌و قەڵەوی‌و لەڕی‌و قەبەیی‌و بوو دەڵەیی لە نێوانی تاوانکارو تاوان لێ کراودا، لە کاتی تۆڵە وەرگرتنی سەر (نەفس)و ئەندامدا، وەکوو یاسایەکی گشتیش: (هەر تاوانێ لەمپەری کونترۆڵ نەکرێ دە قەبڵی بە پارە بەپێی یاسای حوکمەت وەرگرتن).

## ٣٠٧) خوێنبایی: خوێن (دیە):

خۆێنبایی لە شەرعدا برێتییە لە سامانێ پێویست دەبێ لەسەر مرۆڤێکی ئازاد بەهۆی کردنی تاوانێکەوە، کە کردوویەتی لە سەریا لە ئەندام. خوێنبایی دوو جۆرە: خوێنی قورس‌و خوێنی سووك، خوێنی قورس برێتییە لە سەد سەر وشتر لەسەر ئەم شێوەیە: سیی وشتری مێچکەی سێ سالانە، سیی وشتری مێچکەی چوار سالانە، چل وشتری ئاوس، کە دەدرێ لە خوێنی کوژراوێکی موسوڵمانی ئازادی نێرینەدا. ئەمە دەقی پێغەمبەر خۆیەتی {دروودی خوای لەسەربێ} لەو نامەدا کە ناردی بۆ خەڵکی یەمەن. بە قسەی ئیبنو یوونس یەك دەنگی‌و یەکگرتن لەسەر ئەمە دامەزراوە (لە ئەصڵەکەدا دەفەرموێ: ئیبنو یوسف. بڕوانە کفایە الاخیار – وەرگێڕ) خوێنی سووکەڵەیش برێتییە لە سەد وشتر لەسەر ئەم شێوەیە: بیست وشتری مێچکەی یەك سالانە، بیست وشتری مێچکەی

دوو ساڵانە، بیست وشتری نێری دوو ساڵانە، بیست وشتری مێچکەی سێ ساڵانە، بیست وشتری مێچکەی چوار ساڵانە، بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە ئیبنو مەسعوود دەیگێڕێتەوە:حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خوێنی کوشتنی هەڵە دەکرێ بە پێنج بەش، هەر بەشەی پێنج یەکە. جەماوەری سەحابەکان لەسەر ئەوەن کە دەکرێ بە پێنج بەشی یەکسانەوە لە ژمارەی وشترەکاندا. ئەمە لە پێشەوە بە روونی رابورد.

جا هەر کاتێ خوێن کەوتە سەر کەسێ، خوای تاوانبارەکە خۆی بێ، خوای خوێنڕەسەکانی بێ، ئەوە سەرنج دەدەین و دەڵێین: ئەگەر کابرای خوێن دەرخۆی وشتری هەبوو ئەوە پێویستە لە وشترەکانی خۆی بیدا، هەر وەك پێویستە زەکات لەو ماڵە بدرێ کە هی خاوەنیەتی و گەیشتۆتە رادەی زەکات! لەسەر فەرمایشتی دیاریتر: ئەگەر تاوانبارو خوێنڕەسەکانی خۆیان وشتریان نەبوو دەبێ بەهاکەی بدەن، ئیتر بکاتە هەر چەندێ لە سەریانە کە بیدەن، چونکە پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} وشتری لەسەر خەڵکی دێهات دەقەبڵاند بە پارە، دەستووری وابوو کە وشتر گران دەبوو نرخەکەی پتر دەکرد، کە نرخی وشتر دادەبەزی نرخەکەی کەم دەکردەوە!.

لەبەر ئەوەش وشتر وەجەڵێکە شیاوی فەوتانە، وەکوو یاسایەکی گشتی هەر شتێ خودی خۆی لە جێگەیێ دەست نەکەوێ دەگەڕێینەوە سەر بەها قەبڵاوەکەی!.

ئەم قسەیە بەپێی فەرمایشتی نوێی ئیمامی شافیعییە {رەزای خوای لێبێ} بەڵام بەپێی فەرمایشتی دێرینی شافیعی ئەگەر خوێندەر

خۆی وشتری نەبوو ئاوا خوێن دەدا: خاوەن زێڕ هەزار لیرەی زێڕ دەدا، خاوەن زیو دوازدە هەزار درەمی زیوین دەدا، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} کاغەزی نووسی بۆ خەڵکی یەمەن، لەو کاغەزەدا فەرموویەتی: (لەسەر خاوەن زێڕەکان خوێنبایی دەکاتە هەزار لیرەی زێڕ، لەسەر خاوەن زیوەکان دەکاتە دوازدە هەزار درەمی زیو).

## ٣٠٨) بەهۆی چەند شتێکەوە خوێنی هەڵە قورس دەبێ:

وەك لە پێشەوە رابورد خوێنبایی هەڵە لە سێ رووەوە سووکەڵەیە، چونکە دەگری بە پێنج بەشەوەو دەکەوێتە سەر خوێنڕەس و مۆڵەتدار (موئەججەل)یشە، بەڵام هەندێ جار شتێ روودەدا دەبێ بەهۆی قورسبوونی، وەك ئەم سێ حاڵەتە:

١) وەك بەهەڵە لە بەستی مەککەدا کەسێ بکوژێ، بەڵام لە حەرەم (بەست)ی مەدینەدا شتی وا رۆڵ نابینێ.

٢) یاخود لە یەکێ لە چوار مانگە حەرامەکەدا تاوانەکە روو بدا، کە برێتین لە نێو جەژنان و قوربان و موحەررەم و رەجەب.

٣) یاخود خزمێکی خۆیی خۆی بکوژێ، وەك براو خوشك و پوور، بەڵام کوشتنی خزمی ناخۆیی واتە: نامەحرەم وەکوو ئامۆزاو پورزا خوێنبایی پێ قورس نابێ. بەڵگەی قورسبوونی خوێنبایی هەڵە بە بۆنەی ئەم هۆیانەوە ئەوەیە کە سەحابەکان {خۆشنوودی خودایان لەسەر بێ} ئاوایان

کردووە. بەقسەی هەندێ لە زانایانی شەرع ئەم کارەی سەحابەکان دەنگی داوەتەوەو کەس رەخنەی لەمە نەگرتووەو سەرەنجام بووە بەیەکدەنگیو بەیەك گرتن. ئیمامی عومەر {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: (هەر کەسێ لەناو سنووری بەستی مەککەدا کەسێ بکوژێ، یا خزمێ بکوژێ، یا لە مانگە رێزدارەکانا کەسێ بکوژێ، کە لە زاراوی شەرعی شەریفا ناویان ئەشهورو لحوروکە، ئەوە خوێنێکی تەواوو سێیەمە خوێنێ دەکەوێتە سەری). ژنێکیش لەکاتی تەوافدا بوو بوو بە ژێر پێوە، ئیمامی عوسمان {رەزای خوای لێبێ} بڕیاریدا کە خوێنەکەی دەکاتە هەشت هەزار درەم، شەش هەزاری خوێنی ئاسایی ژنە، دوو هەزاریشی لەبەر خاتری رێزی بەست. کابرایەکیش لەناو بەستی شاری مەککەدا، لە مانگی حەرامدا، بە هەڵە پیاوێ دەکوژێ، ئیبنو عەبباس {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: خوێنەکەی دەکاتە بیست هەزار درەم، چونکە خوێنی ئاسایی پیاو دوازدە هەزار درەمە، چوار هەزار درەمی دەخرێتە سەر لەبەر خاتری شکاندی رێزی مانگی حەرام، چوار هەزاری تریشی دەخرێتە سەر لەبەر خاتری رێز شکاندی بەلەدولحەرام، سەرجەمی دەکاتە بیست هەزار درەم، کەسیش لە هاوڕێیانی پێغەمبەر {درودی خودا لەخۆی و رەزای خوا لە یارانی} لارییان نەبوو لەم بڕیارەی ئیبنو عەبباس. لەبەر ئەوە بوو بە ئیجماعو یەکگرتن. دەی ئەم جۆرە کارو بارە شەرعییانە بە کۆششکاریو ئیجتیهاد پەییان پێ نابرێ، بەڵکوو تەنیا لە رێگەی وەرگرتن لە پێغەمبەرەوە دەزانرێنو بەس. کە بەوە لە زاراوا دەگوترێ: تەرقیف.

## ٣٠٩) خوێنبایی ژن:

خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە بەپێی فەرموودەکەی عەمری کوڕی حەزم: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە. ئەمە دەگێڕنەوە لە عومەرو عوسمانو عەلیو لەهەر چوار عەبدوڵلاکانەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) وەرای ئەم زاتانە بەهەر چوار لادا بڵاو دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشا کەس ڕەخنەی لێیان نەبووە، ئیتر بووە بە یەککگرتن. عەبدوڵلاکان کە چوار کەسنو ناودارن بە عەبادیلە، خۆیانو باوکیان سەحابەن. ئەمەیش ناوەکانیانە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر.

## ٣١٠) خوێنبایی خاوەن نامەکان:

خوێنی جوولەکەو مەسیحی سێیەکی خوێنی موسوڵمانە. خوای پەیمانداربن، یا خاوەن ئەمان بن، یا خاوەن عەهدو پەیمان بن، شتی وا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە، دەگێڕنەوە ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) خوێنی جوولەکەیەکی کوژراوی دانا بە چوار هەزار درەم، مەجووسییەکیش کوژرابوو بڕیاریدا کە خوێنەکەی هەشت سەد درەمی زیوبێ (بەیهەقی گێڕاویەتەوە بە ڕشتەیەکی دروست) لەبەر ئەوەیش چونکە ئەمە کەمترین ئەندازەی خوێنی ئەمانەیە کە قسەی لێ کرابێ، بنەڕەتیش ئەوەیە کە ئەستۆ خاوێنە لەهەر شتێ کە لەمە زیاتربێ، هەتا بە بەڵگەیێ ئەو پترییە دەچەسپێ!.

بەمەرجێ خوێن دەدرێ بە ئاگر پەرست کە ئەمان پێ دراوبێ، دەی ئەم جۆرە بڕیارو ئەندازە دانانە هەروا لە خۆوە بە قسە نابن، مەگەر بە وەرگرتن لە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ). وەك دەرکەوت خوێنی ئاگر پەرستو ئەو نەتەوانەی تر کە لە ریزو پایەی ئاگر پەرستانن پێنج یەکی خوێنی خاوەن نامەکانە، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ کارکردن بەم سەرنجە: گاورو جوولەکە خاوەنی نامەی خوداییین، کە تەوراتو ئینجیلە، لە بنچینەدا لەسەر ئایینی راستو دروست بوون، ژن خواستن لێیان دروستە، گۆشتی ئاژەڵی سەر بڕاوی دەستیان بۆ موسوڵمان حەلاڵە، هەر کاتێ سەرانە بدەن لە سەرحاڵو ماڵی خۆیان ئیقرار دەکرێن. بەڵام مەجووسی (واتە:ئاگر پەرست) لەم پێنج بەهرەیە تەنیا یەکێکیانی بۆ هەیە کە ئەویش ئەوەیە: بەهۆی دانی سەرانەوە ئامان دەدرێنو سەرو ماڵو ناموسیان دەپارێزرێن!.

**بزانن:**

کە خوێنی بتپەرستو رۆژ پەرستو گا پەرستو دارو بەرد پەرستو زەندیقو بێ ئایین دەق وەك خوێنی ئاگر پەرست وایە، بەزیو دەکاتە هەشت سەد درهەم، بەزێڕ دەکاتە: بیست لیرەی زێڕ، بەوشتر دەکاتە: شەش وشترو دوو سێیەکی وشترێ، خوێنی ژنو نێرو مێشیان نیوەی خوێنی پیاویانە.

## ٣١١) بڕینو لـه کارخستنی هەنـدێ ئەنـدام خوێنێکی تەواویان دەکەوێ:

وەك زانیت خوێنی سەر (نەفس) دەکاتـه سـەد سـەر وشـتر، لەسـەر فەرمایشتی نـوێی ئیمـام، وە دەکاتـه هـەزار لـیرەی زێـڕ، یـا دوازدە هـەزار درەم لەسـەر فەرمایـشتی دێرینـی ئیمـام {ڕەزای خوای لێبێ} لـه هەمانکاتـدا ئەوەیشمان زانی کە تاوان یا تاوانە لەسەر، یا تاوانە لە شتێ تری لـەش، تاوان لە بەشەکانی لەش یا تاوانە لـە ئەنـدام یـا تاوانـە لـە شتێ تـر، جا بزانـە کـە هـەر تاوانـێ بـەپێی گـەورەو بـچووکی خـۆی جـۆرە تۆڵـە، یـا بژاردن، یا قەبلاوێکی هەیـە، تۆڵـە: قیـصاصە، بـژاردن: ئەرشـە، قـەبلاو: حوکوومەتـە، کـە لەمـەولا قـسە لـەم باسـانە دەکـرێ. جـا هـەر تاوانـێ بژاردنی بۆ دیاری کرابێ یـا کـەڵکی ئەندامەکەیـە، وەك نـەمانی بینـایی چـاو، یـا ئەندامەکـەو کەڵکەکەیـەتی پێکـەوە، وەك هـەردوو دەسـتو هەردوو پێو هەردوو گوێ، کە هەرکامێ لەمانە بڕیاری خۆی هەیە.

جا وا دەبێ لە دەسچووەکە لـە تاوانەکـەدا بـەس ئەندامەکەیـە، یـا هەر کەڵکەکەیەتی، لەگەڵ ئەوەیشا خوێنی ئەو فەوتاوە، خوێنی ئـەو لـە دەسچووە دەکاتە خوێنی مرۆڤێکی تەواو. بۆ نموونە: لە بڕینـی هـەردوو دەستا تەواوی خوێنێ پێویست دەبێ، کـە دەکاتـە سـەد وشـتر، لـە بڕینـی یەك دەستدا نیو خوێنی تەواو پێویست دەبێ. چونکە پێغەمبـەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە فەوتانی هەردوو دەستا خوێنێ پێویست دەبـێ. وەك لە فەرموودەکەی جابیردا وا دەفـەرموێ: لـەو نامەیـەدا کـە نـاودارە بە نامەکەی عەمری کوڕی حەزم {ڕەزای خوای لێبێ} کـە پێغەمبـەر {درووودی خوای

لەسەربێ} ناردی بۆ خەڵکی یەمەن ئەمەی تێدا بوو: هەر کەس لە خۆیەوە بە قەستی موسوڵمانێکی بێ سووچ بکوژیو بە شایەتو بەڵگە ئیسپات ببێ لەسەری ئەوە لە جیاتیی دەکوژرێتەوە، مەگەر خاوەن خوێنەکان بە خوێن وەرگرتن رازی بن).

خوێنی هەموو کەسێکیش دەکاتە سەد وشتر، لووتیش ئەگەر بە تەواوی قرتا بوو یەك خوێنبایی تەواوی دەکەوێ، زمانیش ئە ئەگەر بڕا خوێنێکی تەواوی دەکەوێ، هەروەها هەردوو لێو، هەروەها هەردوو هێلکەی باتوو، وە هەروەها چووك، هەروەها بڕ بڕاگە، هەروەها هەردوو چاو، یەك پێش نیو خوێنی دەکەوێ، وە ئەو زامەیش بگاتە پەردەی مێشك خوێنەکەی دەکاتە سێیەکی خوێنبایی، هەروەها ئەو زامەیش کە بگاتە بۆشایی سەر یا سینگ یا سك، وە ئەو زامەیش کە تویخی سەر ئێسك بگوێزێتەوە (المنقلە) خوێنەکەی دەکاتە پازدە وشتر، خوێنی هەموو پەنجەیەکیش (چ هی دەست بێ چ هی پا) دەکاتە دە وشتر، خوێنی هەموو ددانێکیش دەکاتە پێنج وشتر، خوێنی ئەو زامەشی کە ئێسکی دەرخستبێ دەکاتە پێنج وشتر، وە بێگومان کە پیاویش لە جیاتی ژن دەکوژرێتەوە، وە ئەو کەسەیش کە زێڕی هەیەو دەیەوێ بەزێڕ خوێن بدا نەك بە وشتر دەبێ هەزار دیناری زێڕ بدا (ن/ د/ ت).

مەبەست لە دەست لەپە هەتا مووچ، بەپێی ئایەتی {فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا – سورة المائدة – ٣٨/٥} واتە: دەستی دز، چ پیاوبێ، چ ژن بێ ببڕن). چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەستی دزی لە جمگەی مووچی دەستیدا دەبڕی، ئەوەیش راڤەی ئەم ئایەتەیە بە کردەوە، وە

نیشانەی ئەوەیە کە دەست بڕێتییە لە پەنجەو ناو لەپ هەتا مووچ، هەم لە زمانا هەم لە شەرعا.

بەڵام ئەمە کاتێ وایە کە دەستەکە ساغ بێ، چونکە هاوسانی لە نێوان ئەندامەکاندا مەرجە، کەواتە دەستی ساغ لە جیاتیی دەستی ئیفلیج نابڕرێ، بەڵکوو ئەوە قەبلاوی تیا هەیە، چونکە دەست دوو بەهرەی هەیە: کەڵك‌و جوانی، لەم کاتەدا قەبلاو بەرابەر بە جوانی یەکەیەتی. بڕینی هەر دوو قاچیش خوێنێکی تەواوی دەکەوێ. پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لە بڕینی هەردوو پێدا خوێنێ پێویست دەبێ، وەك لە فەرموودەکەی ئیبنو شوعەیبدا وا دەفەرموێ: سەرنجی فەرموودەکەی {درووودی خوای لەسەربێ} کە بە کاغەز ناردی بۆ خەڵکی یەمەن بفەرموو بەڵام لە قاچا فەرقی قاچی شەل‌و قاچی ساغ نیە، چونکە عەیبەکە لە خودی قاچەکەدا نیە، بەڵکوو شەلییەکە یا وا لە راندا، یا وا لەلاقدا، یا وا لە رەگدا بەهۆی کورتبوونەوەو شتی واوە دەشەلێ، لووتیش: نەرمە لووتە (مارن) کە بڕێتییە لە سێ پەردە، کە عیبارەتن لەم لاولای نەرمەی لووت لەگەڵ ئەو تیغە گۆشتینەی کە لە نێوانی هەردوو کونە لووتدا هەیە، کە بێ ئێسکن، جا لە بڕینی ئەم سێ پەردەیەدا خوێنێکی تەواو هەیە، چونکە کەڵکی ئەم نەرمە لووتەیە ئەوەیە لە هەموو لایەکەوە بۆن کۆدەکاتەوە لەناو بۆری لووتا، دەی کە بڕرا ئەو کەڵکە دەفەوتێ، چونکە پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: لووتیش ئەگەر بە تەواوی قرتابوو یەك خوێنبایی تەواوی دەکەوێ. ئەگەر دنیابوو نەرمەی لووتی بەهەر سێ پەردەکەیەوە بڕی لەگەڵ هەندێ لە بۆری لووتی ئەوە خوێنێکی دەکەوێ لەگەڵ قەبلاوێکا. لە

برینی هەردوو گوێدا خوێنێ پێویست دەبێ، بە مەرجێ لە بندا خشتیان بکا، بەڵگەی ئەمە حوکمکردنی عومەرو عوسمانە لەم مەسەلەیەدا لەسەر ئەم شێوەیە، وە کەسیش لاری لە بڕیارەکەیان نەبوو، لەبەر ئەوەیش دوو ئەندامن ئەمانیش خاوەنی دوو بەهرەن، دەق لە دوو دەست دەچن لەم بارەیەوە. کەڵکەکەیان ئەوەیە لەهەر چوار لاوە دەنگ کۆدەکەنەوەو دەیگەیەننە ناو کرکراگەی گوێ، کە جێگەی پەردەی ناو گوێیە کە دەنگ دەبیستێ، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا ناهێڵێ ئاوو هەوای ساردو گەرم بڕواتە ناو کونی گوێچکەوە، لەمەدا (واتە: لە برینی گوێ خشت لەبندا) جیایی نیە لە نێوانی بیسەرو کەڕدا، گوێی کەڕو گوێی بیسندە لەکاتی بریندا خوێنێکی تەواویان دەکەوێ. لە هەڵکۆڵینی هەر دوو چاودا خوێنێ دەکەوێ، بەپێی نامەکەی عەمری کوڕی حەزم، لەبەر ئەوەیش چاو لە مەزنترین ئەندامەکانی جەستەیە، لە کەڵکا مانەندی کەمە، کەوابێ چاو باشتر خوێنی دەکەوێ. وە لە پێویست بوونی خوێندا جیاوازی نیە لە نێوانی چاوی ساغو چاوی ناساغ دا، وەك چاوی تیژو چاوی کز، وەك چاوی ساغو چاوی زەدەدار، وەك چاوێ تانەی لەسەربێ، یا چاوێ کەتکەتك بکا، یا شەو کوێربێ، یا خێلبێ، یا بچووکبێ، بە مەرجێ بینایی تەواوبێ. یەك چاو نیو خوێنی دەکەوێ، چونکە حەدیثێ هەیە لە بابەتی ئەوەوە کە خوێنی یەك چاو نیو خوێنە، لەبەر ئەوەیش کە بووە بە یاسا هەر دوو ئەندامێ کە پێکەوە خوێنەکەیان بکاتە خوێنێکی تەواو خوێنی یەکێکشان بە تەنها دەکاتە نیو خوێن، وەك هەردوو دەستو هەردوو قاچ، لە برینی هەر پێڵوویەکی چاویشدا چواریەکی خوێنێ هەیە، وە لەهەر چواریاندا

خوێنی کەسەکە بەتەواوی پێویست دەبێ، چونکە رەنگو روخساریان پێ تەواو دەبێو دەبن بە مایەی جوانیو بەهۆی کەڵك، لەبەر ئەوە لەم لایەنەوە وەکوو دوو دەستەوان، خواه ئەو پێڵووانە برژانگیان ببێ یا نەیانبێ، وە خواه پیلّووی چاوی بینابن یا هی چاوی کوێربن، بۆیە هەر پیلّووەی چواریەکی خوێنی تیایە چونکە مەسەلەکە پەیوەندی بە دابەشکردنەوە هەیە. لە بڕینی تەواوی زماندا لەبندا خوێنێ پێویست دەبێ، چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (لە بڕینی زماندا خوێنێ هەیە) هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمە فەرمایشتی ئەم زاتانەیشە: ئەبو بەکرو عومەرو عەلی {رەزای خوایان لێبێ} نەبیستراوە کە کەسیش لاری لە قسەکەیان هەبێ. ئەمە سەرەڕای لایەنی جوانکاریو لایەنی کەڵك. ئەمانە هەموو یەکسانن: عەرەبو عەجەمو پسكو تورو لاڵەپەتەو زمان قورس کە بەگران قسەی بۆ بکرێو زمان پسو یا کەسێ پیتێ بکا بە پیتێکی تر وەك هەندێ کەس لە جیاتی (گا ڕەش) دەڵێن: (گاغەش)!! لە بڕێتی هەردوو لێویشدا خوێنباییەکی تەواو هەیە. چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لە نامەکەی کە نوسی بۆ عەمری کوڕی حەزم ئەمەی تیادا باس کردبوو لەبەر ئەوەیش دوو لێوە بە راستی مایەی جوانیو هۆی کەڵکن، کەواتە ئەوانیش وەك دوو دەستەوان. لە بڕینی هەر لێوێکدا نیوە خوێنێ هەیە، ئەگەر کەسێ بە تاوان دوو لێوی ئیفلیجکرد خوێنێکی تەواوی دەکەوێتە سەر، دەق وەك ئیفلیجکردنی دوو دەستە، هەروا لە بڕینی چووك ·ئەندامی نێرینەی پیاو)دا تەواوی خوێنبایی پێویست دەبێ، هەروا لە بڕینی هەر دوو هێلکەی گوندا خوێنێ هەیە، لە بڕینی یەك هێلکەدا نیو خوێن هەیە. سەر بەڵگەی

ئــەم دوو بڕیــارەیش فەرموودەکــەی عــەمری کــوڕی حەزمــە، لەبــەر ئــەوەیش چــونکە ئەنــدامی پیــاو هــۆی ســەرەکی کــەڵکی زاوزێیــە، کــە مــەزنترین گەڵکــە، لەمەیــشدا شــلە پەتــەو خەســێنراوو ســاغ یەکسانن، چــونکە شــلە پەتــەیی نەنگێکــە وا لــە غــەیری چــووکدا، ســەرەڕای ئــەو بەڵگەیــەی کــە دەربــارەی دوو هێلکــەی گــون لــە فەرموودەکــەی عــەمری کوڕی حەزمدا هەیە بەڵگەیەکی تــریش هەیــە کــە ئەمەیــە: چــونکە ئــەم دووە تــەواو کــەری هەیکەلــەو بنیــادی لەشــن و عــەماری تــۆوی زاوزێــن، ئەگەر هەردوو هێلکە گون ببڕیو ببی بەهۆی ئەوە تۆویشی نەمێنێ دوو خوێنی دەکەوێتەسەر.

## ٣١٢) باسی لابردنی کەڵك و هێز:

لەپاش ئــەم روونکردنەویانــە لــە بــارەی تــاوانکردن لــە ئەنــدام دێینە سەر باسی نەمانی کەڵك و لابردنی هێز لە گیانی ئادەمیزاددا، ئەو هێزانەی کە بـژاردنی تایبـەتی هەیـە بەرابـەر بـە نەهێـشتنیان ئەمانەن.

**یەکەم:** هێزی قسەکردنە. لە لابردنی هەموو هێزی قسەکرندا لــە زامنــی گۆیــادا خــوێنی کەســێ بــە تــەوای پێویــست دەبــێ. چــونکە بــووە بەهۆی لە کیسچوونی باشترین کەڵکی زمان، دەق وەك سۆمای چاو، وە لە لابردنی هێزی گوتنی هەندێ پیتدا بەشە خوێنبایی بۆ دادەنرێ، بـەپێی ڕێژەی تێکڕای ئەو پیتانە کە لـە زمـانی ئـەو کەسـەدا بـە عـادەت بـەکار

دەهێنرێن. بەڵام ئەگەر کەوتەوە سەر قسەکردنو زمانی بەربوو ئەوە دەبێ خوێنەکە رەت بکاتەوە!.

**دووەم:** هێزی چاوە. لە لابردنی هێزی بیناییدا تەواوی خوێنبایی کەسێ پێویستە، چونکە کەڵکی هەردوو چاو برێتییە لە هێزی دیتن، واتە: سۆمای چاو، دەی لەناوچوونی ئەو سۆمایە رێك لەناوچوونی هێزی هەردوو دەست دەکا، کە ئیفلیج کرابن، کەوابێ ئەمیش وەك ئەو دەبێ بەهۆی پێویستبوونی خوێنێ لەسەر تاوانکارەکە.

**سێیەم:** هێزی بیستنە. لەلابردنی هێزی بیستنی هەردوو گوێدا خوێنێ هەیە، چونکە ئەمە بڕیاری ئیمامی عومەرە {رەزای خوای لێبێ} کەسیش راجیایی نیشان نەداوە، لەبەر ئەوەیش کە هێزی بیستن لە نازدارترین هەستەکانی مرۆڤە، لەبەر ئەوە رێك وەك بینایی وایە لەم بارەیەوە.

**چوارەم:** هێزی بۆن کردنە. لە لابردنی هێزی بۆن کردندا بە تەواوی، خوێنێ دەچەسپێ لەسەر تاوانکار، چونکە هێزی بۆنیش یەکێکە لە پێنج هەستە، لەبەر ئەوە لە بینایی دەچێ! گوتیارێ دەبێژێ: لە لابردنی هێزی بۆنکردندا خوێن نیە، بەڵکوو قەبلاو (حوکومەت) هەیە، چونکە کەڵکی دەسگای هەستی بۆنکردن لە چاو دەسگای هەستەکانی تردا زۆر لاوازو بی هێزە.

**پێنجەم:** هێزی ژیرییە، کە پێشی دەگوترێ: هۆش: ئەقڵ. لە لابردنی هێزی ئەقڵدا خوێنێ هەیە، واتە: ئەگەر کەسێ بە ناڕەوا بەهەر شێوەیێ، ئەقڵی کەسێکی نەهێشت، ئەوە دەبێ تەواوی خوێنی ئەو

کەسەبدا، چونکە لەو نامەیەدا کە حەزرەت نووسی بۆ ئالی عەمری کوڕی حەزم لە یەمەن ئەمەی تیادا بوو، لەبەر ئەوەیش کە ئەمە فەتوای عومەرو زەید بووە، وە کەسیش راجیایی نیشان نەداوە، لەبەر ئەوەیش کە هۆش لە نازدارترین هەستەکانە، کەواتە: لەناو گشت هەستەکاندا ئەو لە گشتیان لە پێشترە لەوەدا کە خوێنی تەواوی بکەوێ لەکاتی فەوتانیدا. مەبەست لە ژیری کە لابردنی خوێنی پێویست دەکا ئەو هۆشە زکماکییەیە کە تەکلیفی پێوە پەیوەستە بەڵام ئەو ژیریو زرنگییەی کە لە ئەنجامی خوێندنو رۆشنبیریو هەوڵو تەقەللای زۆردا پەیدا دەبێو مرۆڤی پێ رۆشنبیرو زرنگ دەبێ ئەوە قەبلاوی تیایە (لە شەریعەتی ئیسلامدا مامۆستا مەلا عەبدولکەریم دەفەموێ: ئەم هێزانە چواردەن، ئەمانەیش ئەوانی تریانن: (٦- هێزی دەنگ ٧- هێزی چەشتن ٨- هێزی جاوێنی خواردەمەنی ٩- هێزی هەڵمەتی دەست ١٠ — هێزی هەڵمەتی پێ ١١ - هێزی دەرپەڕندنی ئارەزووی مرۆڤە ١٢- هێزی خۆشی وەرگرتنە لە چوونەلای ژن ١٣- هێزی ئاوس کردنی ژنە ١٤- هێزی ئاوس بوونی ژنە) تکایە بڕوانە: شەریعەتی ئیسلام بەرگی چوار لاپەڕە (٦٧) وەرگێڕ).

## ٣١٣) باسی برینی ئێسك دەرخەرو ددان:

لە خوێنی برینی ئێسکدەرخەر (موضیحە)و یەك ددان دا پێنج وشتر دەدرێ، چونکە بە دەق لە هەندێ گێڕانەوەکانی فەرموودەکەی عەمری کوڕی حەزمدا {وەزای ئەولاد ئینبە} وا دەفەموێ: وەك لە پێشەوە

رابورد، ئەوەیش بزانە هەرکاتێ ژمارەی برینەکان، یا ژمارەی ددانەکان زیاد بکەن ژمارەی بژاردنەکەیشیان بەقەد ژمارەی ئەوان زیاد دەکەن، کەواتە: خوێنی دوو زامی ئێسکدەرخەر دەکاتە دە وشتر، خوێنی خستنی دە ددان دەکاتە پەنجا وشتر.. ئیتر هەروا. بەڵگەی ئەم دوو بڕیارەیش لە پێشەوە رابورد.

## ٣١٤) خوێنی ئەو ئەندامەی کە سوودی دیاری نیە:

هەر ئەندامێ کەڵکی گەورەی دیاری کراوی نەبێ، هەروا هەر زامو برینێ کە بژاردنی بۆ دیاری نەکرابێ، هەروا هەر تاوانێ لە لەش‌و لە هۆش کە بژاردنی تایبەتی بۆ بڕیار نەدرابێ، هەروا شکاندنی ئێسك، ئەم جۆرە تاوانانە حوکمڕانی شەرع ئەندازەیەك پارە بڕیار دەدا لە بەرابەریدا، کە لە زاراوەی شەرعی پیرۆزدا بەو ئەندازە پارەیە دەگوترێ (حوکومەت – قەبلاو). رێژەی ئەم ئەندازە پارەیە لەچاو کابرای تاوان لێ کراودا وەکوو رێژەی ئەو ئەندازەیەیە کە کەمی کردووە لە نرخ‌و بەهای کابرای تاوان لێکراو بەهۆی برینەکەوە یا بەهۆی تاوان‌و شکستەکەوە لەچاو بەهاکەیدا بەساغی. بۆ نموونە: وا دادەنێین حەمەلاو کە موسوڵمانێکی نێرینەی ئازادە لەپاش تاوانەکەو لە پێش تاوانەکەدا ئەگەر بەندە بوایە بایی چەند دەبوو، با بڵێین لە پێش تاوانەکەدا بایی سەد لیرە دەبوو، لەپاش تاوانەکە بایی نەوەد لیرە دەبوو، کەواتە: دەیەکی بە هاکەی کەم بۆتەوە، دەی کەوابێ دەیەکی خوێنی خۆی کە موسوڵمانێکی نیرینەی ئازادە خوێنی لە جیاتی ئەم تاوانە دەکەوێ، کە

به وشتر دەكاته دە وشتر، بەزێڕ دەكاتە سەد دیناری زێڕ. ئەگەر تاوان لێكراو ژن بێ، یا خاوەن نامە بێ، یا ئاگر پەرست بێ، یا بەندە بێ، یا كەنیزەك بێ، بە هەمان شێوە ئەندازە بۆ خوێنی زیانەكەی دیاری دەكرێ، كەواتە لەم نموونەیەدا لە جیاتی حەمە لاو دادامین بێ، كە ژنێكی ئازادی موسوڵمانی مەردە، خوێنەكەی ئاوا دەفەرموێ: دۆزینەوە: دەڵێین: ئەگەر ئەم ژنە ئازادە تاوان لێ كراوە ئەگەر كەنیزەك بێ بایی چەندە؟ دەڵێین بایی دە دینارە لە پێش تاوانەكەدا، بەڵام لە پاش تاوانەكە بایی نۆ دینارە، كەواتە: دەیەكی خوێنی خۆی دادەنرێ بە قەبلاوی ئەم تاوانە. كە بە حوشتر دەكاتە پێنج حوشتر، وە بە زێڕ دەكاتە پەنجا دیناری زێڕ، چونكە خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە.

## ٣١٥) باسی خوێن بایی بەندەو ئاوەڵەی ناوسك:

هەركاتێ كەسێ بەندەیێ یا كەنیزەكێ بكوژێ پێویستە لە سەری كە بەهاكەی بە تەواوی بدا بە خاوەنەكەی، ئیتر بكاتە هەر چەند دەبێ ئەو ئەندازەیە بدا، بە مەرجێ ئەو كەسە بەرپرسیار بێ لە ضەمانەتی ئەو بەندەو كەنیزەكە، چونكە بەندەو كە نیزەكیش جۆرێكن لە سامان، لەبەر ئەوە وەك گشت سامانێكی تر بژاردنیان بۆ هەیە، ئەگەر كەسێ سكێكی لە باری كەنیزەكێ برد، بەهۆی تاوانێكەوە، دەیەكی نرخی دایكەكەی خوێنی ئەو سكە لەبار براوەیە. چونكە كۆرپەڵەیەكی ئادەمییە، لەبەر ئەوە دەستە بەردەكرێ بە دەیەكی بەهای دایكی. نرخی

ئەو رۆژەی دایکەکە حلێبە کە زەبرەکەی لێ دراوە، چونکە ئەو زەبرە بووە بەهۆی لەبار چوونی. بەڵام خوێنی کۆرپەڵەی ناو سك کە کورپەڵەکە موسوڵمانی ئازادبێ، خوای نێرینە بێ یا مێیینە، ئەگەر کەسێ بە تاوان لەباری بەرێ دەکاتە سەرێ کۆیلە، خوای ئەو کۆیلەیە بەندەبێ یا کەنیزەك بێ دەبێ. چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لە مەسەلەیەکا کە براوەتە خزمەتی ئاوای بڕبارداوە (شەیخان فەرموودەیەکیان لەم بارەیە وەرگێڕاوەتەوە. بڕوانە تاج / ٣ ل – ٢٢٠ ز – ٨٤) بەهەرحاڵ نابێ خوێنی ئەم کۆرپەڵەیە لە نیوەی دەیەکی خوێنی باوکی کەمتربێ، یا لە دەیەکی خوێنی دایکی کەمتربێ، کە دەکاتە بەهای پێنج وشتر، چونکە عومەر {رەزای خوای لێبێ} نرخی سەرە کۆیلەکەی دادەنا بە پەنجا دیناری زێڕ، کە دەکاتە دەیەکی خوێنی دایكو بیستیەکی خوێنی باوك، هەروا عەلیو زوەیدیش بەهای ئەو کۆیلەیان بەو جۆرە بڕیار دابوو، کەسیش سەرپێچی لە کارەکەیان نەکردووە.

## ٣١٦) چەند مەسەلەیێ:

ئەگەر کەسێ قیڕاندی بەسەر منداڵێکی نەفاما کە لەسەر قەراخی سەربانێ بوو، یا لەسەر کەناری چۆمی بوو، یا لەسەر لێواری بیرێ بوو، وە منداڵەکە لە قیژەکە ترساو راچەنیو کەوتە خوارەوەو پێی مرد، ئەوە خوێنێ پێویست دەبێ، بەڵام بەبێ کوشتنەوەی قیژەکەرەکە، گریمان منالەکە لە زەوییەکی تەختاییدا بێ بەو قیژەیە بمرێ، لە سەرړای فەرموودەی سەنگین ضەمانو دەستە بەری لەسەر کابرای

پیرەکەر نابێ، چونکە مردن بەهۆی شتی واوە لەوپەڕی دووریدایە، شێتو دێوانەیێ کە بەهۆی شتی واوە سەرسام دەبێو تووشی دڵەڕاوکێ دەبێ، هەروا خەوتوو و ژنی بێ هێزیش لەم مەسەلەیەدا وەك منداڵی نەفام وان. پەلاماری چەكدان لە كەسێو هەڕەشەی توند لەم مەسەلەیەدا بڕیارەکەیان وەك بڕیاری قیژەو قیڕە وایە، ئەگەر کەسێ قیژاندی بەسەر منالێکی گچکەدا، منالەکە لەترسا ئەقلی فەوتاو هۆشی نەما، دەستە بەری پێویستە ئەگەر کەسێکیش بەشمشێرەوە نیشتە سەر کەسێ، مەسەلا، وە کابرا لە بەری رای کرد، وە لە ترسا خۆی هەڵدایە ناو چەمێ، یا لە هەڵدێرێکی بەرزەوە خۆی فڕەدایە خوارەوە، یا خۆی خستە ناو بیرێ، وە مرد ئەوە دەستە بەریی ئەو کەسە لەسەر شمشێر بە دەستە هەڵفڕێنەکەی نیە، چونکە هەڵهاتووەکە خۆی هەڵساوە بە دەسپێشخەری لە مردنی خۆیدا، لەکاتی وایشدا ئەوەی راستەوخۆ هەڵسێ بە تاوانێ پێش ئەو کەسە دەخرێ کە بووە، بەهۆی ئەو تاوانە!.

وەلێ ئەوەنە هەیە ئەگەر هەڵهاتوو لەم بارو دۆخەدا ئاگای لە هۆی ئەو سەر تیاچوونەی خۆی نەبوو، وەك ئەوە بەبێ ئارەزووی خۆی کەوتە خوارەوە، لەبەر ئەوە کە کوێر بوو، یا لە تاریکیدا بوو، یا دنیا شەو بوو، چاوی لەبەر پێی خۆی نەبوو، ئەوە لەم کاتەدا دەستەبەری پێویستە.

ئەگەر کەسێ منالێ بداتە دەستی مەلەوانێ هەتا فێری مەلەی بکا، منالەکە لە ئاوەکەدا بخنکێ، ئەوە خوێنی نیمچە قەستی دەکەوێ، لەسەر قسەی فەرموودەی دروست، هەروەها ئەگەر مامۆستا بۆ تەمێکردن لە منال بداو بەو تەمێو لێدانە بمرێ ئەویش خوێنی نیمچە

قەستی دەکەویٚ. خاکو خۆڵی ناو ماڵو توێکڵی کاڵەکو شووتیو مۆزو شتی تری وا، ئەگەر لە وێرانەییٚ یا لە سەلوێنكو زبڵدان فڕەبدرێن، وە بوون بەهۆی نەمانی کەسیٚ، یا بوون بەهۆی فەوتانی سامانیٚ، نابێت بەهۆی دەستە بەریی، بەڵام ئەگەر لە سەرەڕیٚ فڕەیان بدا، وە زیانێکی سامانی، یا زیانێکی گیانیی بە هۆیانەوە رووبدا خاوەن زبڵەکە دەبیٚ بە دەستەبەر، بە مەرجیٚ ئەو کەسەی کە ئەو زیانەی لیٚ دەکەویٚ خۆی ئەوە نەزانیٚ، بەڵام ئەگەر خۆی بە ئارەزوو بە سەریا رۆیشتو قاچی هەڵخلسکاو قاچی شکا، یا سەعاتەکەی دەستی شکا، مەسەلا، ئەوە هیچی ناکەویٚ. بەڵام ئەگەر بۆ بەرژەوەندیی گشتی سەر جادەکەی ئاورشێن کرد، هەتا تەپوتۆز لە هاتوچۆکەرەکان نەنیشیٚ، وە مرۆڤیٚ لێی هەلخلیسکا، یا ئاژەڵیٚ، ئەوە دەستە بەریی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر ئەو ئاورشین کردنە بۆ قازانجی خۆی بوو ئەوە دەستەبەرە، هەروەها ئەگەر قوڕی سەرەڕیٚ تەڕ بکاتەوە دەبیٚ بە دەستەبەری هەرشتیٚ بەو قوڕە بفەوتیٚ، هەروەها ئەگەر سەکۆییٚ لە بەردەم دەرگای ماڵەکەیدا دروست بکا وە ببیٚ بەهۆی فەوتانی مرۆڤیٚ یاخود فەوتانی زیندەوەرێکی تر دەبیٚ بە دەستەبەر.

## ٢١٧) باسی پاکانە (قەسامە):

پاکانە (واتە: دڵپاك کردنەوەی کەسیٚ بە سوێند بۆ خواردنی) لە شەرعا برێتییە لە نیشانەیەکی وا کە هێز بدا بە دروستییو راستیی داواکار لە داواکەیدا. شێوەکار (صوورەت)ی پاکانە ئاوایە: تەرمی

کوژراوێ شوێنێ بێ، نەزانرێ کە کێ کوشتوویەتی، بەڵگەیش نەبی لەسەر هۆی کوشتنەکەی، وە هەقدارەکەی تۆمەتی کوشتنی بدا لە کەسێکی ناوبراو، یاخود لە کۆمەڵێکی دیاری، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا نیشانەو قەرینەیەکی وا لە ئارادا هەبێ کە بۆنی ئەوەی لێبێ کە قسەی خوێن رەسەکان راستە، کە بەوە دەگوترێ: (اللوث: البینة الضعیفة: وردە بەڵگە: قولاخ: سووسە) پاکانە زیاتر ئەوەیە کە داواکار پەنجا سوێند بخوا لەسەر راستیی ئەو داوای کوشتنەی کە دەیکا لە داوا لێکراو، جا هەر کاتێ لەسەر داواکەی پەنجا سوێندی خوارد، ئەوە لە کوشتنی دەستەنقەستیدا خوێن لەسەر داوا لێ کراو خۆی پێویست دەبێ، وە لە کوشتنی هەڵەو نیمچە هەڵەدا خوێن لەسەر خوێنرەسەکانی داوا لێکراو پێویست دەبێ نەك لەسەر خۆی.

وردە بەڵگە (لەوث) نموونەی زۆرە، وەك ئەوە تەرمی کابرای کوژراو لەناو هۆزێکا، یا لە قەڵایەکا، یا لە گوندێکی بچووکا، یا لە گەڕەکێکی بچووکابێ، کە بەشێ بێ لە گەڕەکێکی گەورەتر، وە ئەو شوێنەی کە تەرمەکەی لێ هەیە هی کەسانێ بێ لە دوژمنانی خاوەن تەرمەکە، بە مەرجێ دوژمنایەتییەکەیان ئاشکرا بێ، یا وەکوو ئەوە کۆمەڵێ کۆببنەوە لەسەر کەسێ، وە پاش ئەوە کە بڵاوەیان کرد تەرمی کابرایەکی کوژراو لەوێدا بەجێ بمێنێ، یا وەکوو ئەوە کۆمەڵێ بۆ کارێ لە شوێنێکا کۆببنەوە، وەك مزگەوت، یا بێستانو باخ، یا سەرە رێگەیێ، یا سارایێ، ئەوە دەبێ بە وردە بەڵگە، ئەگەر لە دوا بڵاوەکردنیان تەرمێ لەو ناوەدا کەوتبوو، وەکوو ئەوە یەك پیاوی ئازادی دادپەروەر شایەتی بدا لە سامان کە ئەو رەحمانی کوشتووە، ئەمەیش رێگەیەکی ترە لە

ڕێگەکانی سوسەکردنو وردە بەڵگەو قوڵاخکردن، لە مەسەلەی پاکانــەدا.
بــەڵام ئەگــەر کۆمــەڵێ لــە ژن، یــا لــە منــاڵ، یــا لــە بەنــدە پێکــەوە هــاتنو
شایەتییاندا کە نــەریمان سامانی کوشــتووە، ئــەوە لەســەر رای مــەرجووح
(ناسەنگین) نابــێ بــە وردە بەڵگــە، بــەڵام لــە ســەرڕای سەنگین (راجیح)
دەبــێ بــە وردە بەڵگــە، هــەروا ئەگــەر تــاكو تــەرا بــە رودوا هــاتنو ئــەو
شایەتییەیان دا ئەوە دەبێ بە وردە بەڵگە.

## سەر بەڵگەی:

ئــەم مەســەلەیەی پاکانەیــە ئــەم فەرمووەیــە: رافیعــی کــوڕی
خــەدیج (ڕەزای خــوای لێبــێ) فــەرمووی: موحەییــصەی کــوڕی مەســعوودو
عەبدوڵڵای کوڕی سەهل دەچن بۆ خەیبــەر، ئــەو کاتــە خەیبــەر لەگــەل
موسوڵمانانــدا ئاشــت بــوو، ڕێکــەوتن لــە نێوانی دانیشتوانیو لــە نێوانی
موسوڵمانانــدا هەبوو، جا لەوێ بەناو باخە خورماکانیدا بڵاودەبنــەوە، وە
عەبــدوڵڵایان دەکــوژرێ، کاتــێ موحەییــصە دەچــێ بــۆ لای عەبــدوڵڵا
دەڕوانێ وا لــە خــوێنی خۆیــدا گــەوزاوەو کــوژراوە، جــا تەرمەکــەی لــەوێ
دەنێــژێو خــۆی دێتــەوە بــۆ مەدینــە، وە گومــان دەخەنــە ســەر
جوولەکــەکانی خەیبــەر، جــا عەبــدوڕەحمانی برایــیو دوو ئــامۆزای (کــە
حووەییصەو موحەییە بوون) هاتنــە خزمەتی حەرزەرت (دروودی خوای لەسەربێ)
جا عەبدوڕەحمان (کە لــەوان بــچووکتر بــوو) ویــستی باسی براکەی بکــا،
پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو: ڕێزی لە خــۆت گــەورەتر بگــرە،
یا فەرمووی: با گــەورە دەســت پێبکــا، ئــیتر ئــەویش بــێ دەنــگ بــوو، جــا
ئــەوان هــەردووکیان باسی داســتانی ئامۆزاکــەیانیان کــرد، پێغەمبــەریش

{دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: پەنجا کەس لە ئێوە سوێند بخۆن لەسەر پیاوێ لەوان، ئەو پیاوە پەت دەکرێ‌و دەدرێتە دەستتان لە جیاتی کوژراوەکاتان بیکوژنەوە، گوتیان: شتێ کە بەدیاریەوە نەبووبین ئێمە چۆن سوێندی لەسەر بخۆین؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: کەواتە جوولەکەکان پەنجا کەسیان سوێندتان بۆ دەخۆن‌و بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هۆزێکی بێ بڕوان‌و سوێندی ئەوانە لە کوێ بایەخی هەیە؟ جا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} خۆی خوێنی کوژراوەکەی لە وشتری زەکات دا (ش / د / ت / ن = شەیخەین / ئەبو داوو / تیرمیذی / نەسائی - رەزای خودا لە هەموویان بێ) ئەم فەرموودەیە لە سەهلی کوڕی ئەبو خەیثەمەیشەوە گێڕراوەتەوە. ئەم فەرموودەیە تەرخانکەر (مخصص)ی گشتایەتی ئەم فەرموودەی ترە کە دەفەرموێ: بەڵگە لەسەر داواکارەو سوێند لەسەر داوالێکراو. دارە قوطنی ئەمەی لێ پتر کردووە: تەنیا مەسەلەی پاکانە (قەسامە)ی لێ دەرچێ.

بایستی ئەوە کە لە پاکانەدا لە پێشدا سوێند دەدرێ بە داواکار ئەمەیە: لایەنی داواکار لەم مەسەلەیەدا بەهۆی ئەو وردە بەڵگەیەوە کە هەیە هەندێ بە هێزترە، لەبەر ئەوە شەرع لە پێشدا سوێند دەدا بەو، دەی ئەگەر قولاخ‌و نیشانەو وردە بەڵگە لە ئارادا نەبوو ئەوە سوێند دەدرێ بە داوالێکراو بەپێی یاسای دامەزراوی شەرع: بەڵگە لەسەر داواکارەو سوێند لەسەر داوالێکراوە.

## ٣١٨) باسی کەفارەتی کوشتن:

هەر کەسێ کەسێ بە نارەوا بکوژێ کەفارەتێ پێویست دەبێ لەسەری خوای بە دەسەنقەست بیکوژێ، یا بەهەڵە، یا بە نیمچە هەڵە. کەفارەتەکە بریتییە لە ئازادکردنی بەندەیێ، کە موسوڵمان بێو پاك بێ لەو نەنگانەی کە لەشتی فرۆشتندا بە نەنگ دەژمێررێن. ئەگەر بەندە دەست نەکەوت، یا بکوژ لات بوو ئەوە پێویستە دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژووبێ. خواە کوژراوەکە موسوڵمان بێ یا بیبڕوا، پەیماندار بێ یا خاوەن پەیمان، ئازاد بێ یا بەندە، بەندەی بکوژەکە خۆی بێ یا بەندەی کەسێکی تر، ژیرو خاوەن هۆش بێ یا شێت، مناڵ بێ یا گەورە، لە دایك بووبێ یا کۆرپەلەی ناوسك بێ. کۆگری ئەمە ئەوەیە: خوێنی کوژراوەکە بەهۆی ئیمانەوە یا بەهۆی ئەمانەوە پارێزراوبێ.

کەفارەت پێویست نابێ بە کوشتنی بێبڕوای جەنگیو لە ئیسلام وەرگەڕاوو جەردەو رێگرو داوێنپیسی هاوسەردارو بە کوشتنی ژنو مناڵی بێبڕوایان لەکاتی غەزاو جەنگدا، چونکە کوشتنی ژنو مناڵ لەکاتی غەزادا گەرچی نادروستە بەڵام لەبەر رێزی خۆیان نیە، بەڵکوو لەبەر بەرژەوەندی موسوڵمانانە، تا دەسمایەی گوزەرانیان زیانی پێ نەگا.

پێویستبوونی کەفارەت لە کوشتنی هەڵەدا بە یەکگرتن چەسپاوە، دەقی ئایەتیش هەیە لەسەری کە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ - سورة النساء - ٩٢/٤} هەتا کۆتایی ئایەت. واتە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی تر

بکوژێ ئەوە لە سەری پێویستە کە بەندەیەکی موسوڵمان ئازاد بکا، وە خوێنیش بدا بە خوێنڕەسی ئەو کوژراوە.

پێویستبوونی کەفارەت لە کوشتنی دەسەنقەستیشدا بەم فەرموودەیە چەسپاوە: وائیلەی کوڕی ئەسقەع دەفەرموێ: هاوڕێیەکمان بەهۆی موسوڵمان کوشتنەوە دۆزەخی بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو، جا بەم بۆنەیەوە چووینە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: لە جیاتی خۆی بەندەی بۆ ئازاد بکەن. لە گێڕانەوەیەکدا: با بەندەیێ ئازاد بکا، خودای گەورە لە جیاتیی هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە ئەندامێکی ئەو لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەکا (ن/د/ ئیبنو حیببان و حاکم بە دروستی دادەنێن. حاکم دەفەرموێ: فەرموودەیەکی دروستە بەپێی مەرجی شێخی بوخاری و شێخی موسلیمە) دیارە کە بکوژ کاتێ ئاگر مسۆگەر دەکا بۆ خۆی کە بە قەستی بە ناهەق کەسێکی کوشتبێ، سەرەڕای ئەوەیش ئەمیش هەر کوشتنی ئادەمیزادی خوێن قەدەغە کراوە لەبەر رێزداری خوێنەکەی، کەواتە لە میشدا کەفارەت وەکوو کوشتنی هەڵە پێویستە ئەگەر گۆمەڵێك پێکەوە یەکێکیان کوشت، گەرەکە لەسەر هەر یەکێکیان سەربەخۆ کەفارەتێکی تەواو بدا، چونکە ئەم کەفارەتە هەقێکە پەیوەندی بە خودی کوشتنەوە هەیە، بەش بەشیش ناکرێ، لەبەر ئەوە پێویستە دەق وەك تۆڵە لێسەندن هەر کەسەیان کەفارەتێکی تەواو بدا، سەرەڕای ئەوەیش کە مانای پەرستنی تیادایە، عیبادەتیش بەش بەش ناکرێ. هەیشە دەفەرموێ: بە هەموویان یەك کەفارەتیان لەسەرە چونکە کەفارەتماڵێکە بەهۆی کوشتنەوە پێویست دەبێ. ئەگەر بکوژەکە مناڵ، یا شێت بوو،

هەقدارەکانیان هەر کەسەیان لەماڵی خۆی کەفارەتەکەیان بۆ دەدا، هەر وەك چۆن زەکات لە ماڵی خودی منداڵەکە یاخودی شێتەکە دەردەکرێ. بەڵام بە بەهیچ جۆر هەقدارو سەرپەرشت لە جیاتی منداڵ، یا لەجیاتی شێت بەرژوو نابن، بەڵکوو رۆژوو لەسەر خۆیانە لە پاش رەسیدە بوون، بە مەرجێ خاوەن هۆش بن.

## ٣١٩) باسی تۆڵەی تاوان کە ناودارن بە حەددە شەرعییەکان:

تۆڵەی تاوان بە عەرەبی ناوی (الحدود)ە کە کۆی (حد)ە حەددیش لە زمانا بە واتا سنوورە کە نیشانەی سەرەتای قەدەغە بوونو رێ لێگرتنە، جا بۆیە تۆڵەی تاوان وا ناونراوە چونکە رێگە لە روودانی کاری شەرم ئاوەری نالەباری ناهەموار دەگرێو سنووری بۆ دادەنێ.

تۆڵەی تاوان (یا حەددی شەرعی) لە شەرعی پیرۆزدا بریتییە لە تۆڵەیەکی تایبەتی لەسەر تاوانێ کە پێویست بووە لەبەر ئەوەی کە هەقی خودایە، وە لە بابەتی داوێن پیسیدا وایە، یا لەبەر ئەوەی کە هەقی مرۆڤە، وەك تۆڵەی بوختان. بە پێچەوانەی تەمێکردنەوەکە لە شەرعا پێی دەگوترێ: تەعزیر، چونکە تەمێکردن سزایەکی نادیارییە فەرماندار بە کۆشش دایدەنێ.

## ٣٢٠) تۆڵە (حەدد)ی شەرواڵپیسی:

شەرواڵپیسی دوو جۆری هەیە: هاو سەردارو بێ هاوسەر واتە: محصنو ناحصن.

مرۆڤی خاوەن هاوسەر، چ پیاو بێ چ ژن، تۆڵەکەی ئەوەیە ئەگەر داوێنپیسیی لەسەر چەسپا، بە گڵمتكو بەردی پڕ بە مشتو بچووکتر سەنگەسار دەکرێ هەتا دەمرێ، بەڵام داری حەددی لێ نادرێ، بێ هاوسەریش (واتە: کورو کچیش) سەد داریان لێ دەدرێو تاماوەی ساڵێکیش شار بەدەر دەکرێن. کۆگری هۆی ئەم تۆڵەیە ئاوایە: مرۆڤێکی رەسیدەی خاوەن هۆش بە ئارەزووی خۆی نەك بە زۆری زۆردار، سەری چووکی خۆی، ئەو ئەندازەیەی کە خەتەنە دەکرێ، یا بە ئەندازەی ئەوە نوقوم بکا بە زێی ژنێکی زیندووی وادا کە پێی حەرام بێ، لە هەمان کاتدا گومانو شوبهەی حەڵاڵبوون لە ئارادا نەبێ، یاخود ژنێ کەرەسیدەو هۆشدار بێ بە ئارەزوو قەبووڵی ئەوە بکات. پیاوو ژن وەك یەك تۆڵەیان لەسەرە، چونکە ئیمامی عومەر {رەزای خوای لێبێ} لە وتارێکدا فەرمووی: بێگومان کە خودا موحەممەدی ناردووە لەگەڵ ئاییینی راستداو قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی، ئایەتی بەردەبارانکردنی داوێنپیسیان جاران ئایەتێ بوو لە قورئان کە ئەمە دەقەکەیەتی: (الشیخ والشیخة اذا زنیا فارجموهما البتة) واتە: پیاوو ژنی سەرە ئەگەر داوێنپیسیانکرد بەبێ چەندو چوون سەنگەساریان بکەن. ئێمە بەخودی خۆمان ئەو ئایەتەمان خوێندۆتەوەو لە مبەستەکەی تێگەیشتووین، هەرچەندە ئەم ئایەتە لە تیلاوەتدا نەسخ بۆتەوەو لە

خوێندنـــەوەدا سـڕاوەتەوەو لــە قورئانــدا نانووســرێ، بــەڵام دەگــەرو بڕشتەکەی هەر ماوەو هێشتا حوکمی پێدەکرێ، بۆیە پێغەمبـەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) داوێنپیسانی بەردەباران دەکرد، ئەوەتانێ ئێمەش لەپاش ئـەو بـەردە بارانیـان دەکـەین، بـەڵام دەترسـم کـە موسـوڵمانان بکەونـە چـەرخێکەوە، کەسـێ پەیـدا ببـێ بڵـێ: لــە نامــەی خــودادا ئایــەتی بەردەبارانکردنی تیادا نیە. جا بە نەکردنی ئەرکێ که خودا لە قورئانا دایناوە لـە سـەریان تاوانیـار دەبـنو لـە ڕێگـە دەردەچـن! بێگومـان کـە بـەردەبارانکردن فـەرمانی نامــەی خودایـەو ڕاسـتو دروسـتە، وە ئـەم فەرمانە (حوکم)ە بۆ ئەو پیـاوو ژنانەیـە کـە لـەوەوپێش ژنیـان هێنابـێو بە دەستیان گرتبێ، یاخود شوویان کردبێو مێرد بـە دەستی گـرتبن، وەلێ لە هەڵو مەرجێکا کە بەڵگە هەبێ کە برێتییە لە چوار شایەتی نێرینـەی دادپەروەر یا سك دیاری بدا، یا پێلێنانو چوونە ژێر لە کایەدا بێ.

سوێندم بە زاتی خودا ئەوە نەبێ کە خەڵك بڵێن: عومـەر شت لـە نامــەی خــودا، ئایــەت لــە خۆیــەوە لــە قورئـان زیـاد دەکـا، دەنـا ئـەیم نوسیبیەوە! (شـەیخانو ئـەبو داوودو تـیرمیذیو نەسائی گێڕاویانەتـەوە) ئەم وتارەی عومەر لەبەر چاوی کۆمەڵێ لە یارانی پێغەمبـەر بـوو (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی بێ) لەگەڵ ئەوەش کەس لاری لێی نەبووە.

وەکی تریش ئەگەر داوێنپیس هاوسـەردار نـەبوو (واتـە: ڕۆژێ لـە ڕۆژان ژنی نەهێنابوو، وە هێشتا هەر بوخچەی نـەکراوە بـوو، واتـە: کـوڕ یـا کـچ بـوو) ئـەوە سـەرنج دەدەیـن: ئەگـەر زیناکارەکـە ئـازاد بـوو ئـەوە تۆڵەکەیان برێتییە لەوە یەکی سەد داریان لێبدرێو بۆ ماوەی ساڵێ شار بـەدەر دەکـرێن. لـە بـارەی دارکارییەکـەوە خـوای گـەورە دەفـەرموێ:

{فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ – ٢/٢٤} واتە: ژنی داوێن پیس‌و پیاوی داوێنپیس یەکی سەرو سەد داریان لێ بدەن) پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کچ‌و کوڕ یەکی سەرو سەد داریان لێ دەدرێ‌و تاماوەی ساڵێکیش شار بەدەر دەکرێن. (موسلیم). مەرجە ئەو شوێنەی داوێنپیسی بۆ رەهەنە دەکرێ ماوەی دوو قۆناغ یا زیاتر دوور بێ، کە ماوەی کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، چونکە مەبەست لێی ئەوەیە کە کابرا هەست بە نامۆیی‌و بێ هاودەنگی بکاو دووربێ لە کەسوکارو نیشتمانی خۆی. گریمان پێشەوای موسوڵمانان وا بە باش بزانێ کە دووری بخاتەوە بۆ دوورتریش دەتوانێ. چونکە ئەبو بەکری صەدیق رەهەنەی دەکرد بۆ فەدەك‌و عومەر بۆ شام‌و عوسمان بۆ میصرو عەلی بۆ بەصرە، بەڵێ پێویستە ژنەکە لەگەڵ خوییەکی خۆیدا دوور بخرێتەوە، هەر چەند بەکرێش لەگەڵیدا بڕوا، کرێکەیش لەسەر ژنەکەیە.

جا هەر کاتێ مرۆڤێکی هۆشداری رەسیدەی سەپشك بە ئارەزووی خۆی داوێنپیسی ئەنجام بدا، خوای موسڵمان بێ، یا پەیماندار (ذیممی) بێ، یا هەلگەڕاوە بێ، تۆڵە پێویست دەبێ لە سەری. موسوڵمان بە یەکگرتن، پەیمانداریش لەبەر ئەوە کە هەموو نەتەوەکان بە یەك دەنگ دەڵێن: شەروالپیسی نا دروستە، ئەمە لە کاتێکا کە ئەو پەیماندارە پابەندی بڕیارەکانی ئیسلام بووەو پەیمانی داوە کە سنوورەکانی ئیسلام نەبەزێنێ، کەواتە لەم رووەوە لە موسوڵمان دەچێ‌و بڕیاری موسوڵمانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، سەرەڕای ئەم بەلگانەیش بەلگەیەکی رۆشنی تریش هەیە کە کردەوەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ) چونکە پێغەمبەر

خـوّی {دروودی خوای لەسەربێ} ژن‌و پیـاوێکی جوولەکـەی بـەردەبارانکرد کـە داوێنپیسییان کردبوو، کـە هـەردووکیان خـاوەن هاوسـەر بـوون (بڕوانـە: تـاج/٣ ل - ٢٤٣ – وەرگێـڕ). هەڵگـەڕاوەیش باشـتر تۆڵـەی لێ دەسـێنرێ، چونکە گشت بڕیارێکی ئیسلامی لەسەر جێبەجێ دەکرێ.

بـەڵام تۆڵـە لەسـەر زۆر لێکـراو نیـە، چ پیاوبـێ چ ژن، لەسـەر فەرمایشتی دروست زۆر لێکردن بۆ پیاویش رێگەی تێ دەچێ، بـەڵام بـۆ ژن رێتچوونی زۆر لێکردن بەبێ راجیایی هەیە.

دیسان بـۆ پێویـستبوونی ئـەم تۆڵەیـە ئـەوەیش مەرجـە کـە سـوور بزانـێ کـە شەرواڵپیـسی نادروسـتە، لەبـەر ئـەوە کەسـێ کـە ئـەوە نـەزانێ حـەددی لەسـەر نیـە، وەك کەسـێ لـە چۆڵەوانی گـەورە بووبـێ، یـا نـۆ موسوڵمان بێ، لەبـەر ئـەم مەرجەیـە کـە حـەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} بـە ماعیزی فەموو: ئایا دەزانی کە داوێنپیسی چییە؟. دەی ئەگەر نـەزانینی واتای داوێنپیـسی رێگـەی لـە جێبـەجێکردنی تۆڵە نەگرتایـە پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئەم پرسیارەی لـە مـاعیز نـەدەکرد، سـەرەڕای ئەمـەیش دەڵێین: تۆڵـە پاشـکۆو ئـەنجامی تاوانـە، نـەزانیش تاوانبـار نیـە! کەواتـە: تۆڵەی لەسەر نیە.

## هاوسەرداریی (الاحصان):

ئیحـصان لـە زمـانی عەرەبـدا واتـە: مـەنع، مـەنعیش بـە کـوردی واتـە: نەهێـشتن، خـوای مـەزن دەفـەرموێ: {لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ – ٢١} واتە: هەتا نەهێڵێ زەبرو زەنگ لـە جەنگدا بـە یـەکتری بگەیـەنن،

له عورفی شەرعدا بە زۆر واتا هاتووە، بە واتا ئیسلام هاتووە، وەك ئەم ئایەتە {فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ - سورة النساء - ٢٥/٤} بەپێی قسەی هەندێ ڕاڤەکار (أحصن) لەم ئایەتەدا بە واتا (أسلمن)میە، بە واتا ئازادیش هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: {فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ - سورة النساء - ٢٥/٤} لەم شوێنەدا موحصەنات بە واتا ژنانی ئازادە، بە واتا مەردیو داوێن پاکیش هاتووە، وەك {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ - سورة النور - ٤/٢٤} لێرەشدا موحصەنات بە واتا ژنانی مەردی داوێنپاکە، بە واتا بە شوودانیش هاتووە، وەك {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ - سورة النساء - ٢٤/٤} ژنە مێرد دارەکان، بە واتا چوونە لایش هاتووە، وەك {مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ - سورة النساء - ٢٤/٤} ئەوەیش کە دەڵێین: ئیحصان لەم باسەدا واتای وایە: کە دروستبوونو جووتبوون لە هاوسەرییەکی دروستدا رووی دابێ، بەپێی ئەم فەرمایشتەیەتی (درووده خوای لەسەربێ): هەر موسوڵمانێ شایەتمان بهێنێو بڵێ: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله): بە دڵ باوەڕم هەیەو بە زمان دەڵێمو شایەتی دەدەم کە هەر خودا یەو بەس، خودای تر نیە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایش پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خودایە. ئیتر خوێنی ئەو کەسە حەرامەو بە هیچ شێوەیێ خوێنی بە کەس ڕەوا نابێ، مەگەر لە یەکێ لەم کاتانەدا: بێوە پیاوی داوێنپیس بێ یاخود بێوەژنی داوێن پیس بێ، یا کەسێ بە ناڕەوا کەسێ بکوژێ، یا لە ئایینی خۆی وەرگەڕابێو لە کۆمەڵەی موسوڵمانان تەرابووبێ! (شەیخان گێڕاویانەتەوە) زاناکان بە یەك دەنگ دەفەرموون: وشەی (الثیب: بێوە

پیاو، یا بێوەژن) لەم فەرموودەیەدا مەبەست لێی ئەوەیە. ئەو پیاوە یا ئەو ژنە لەوەوپێش لەگەڵ هاوسەری حەڵاڵی خویدا دروست بووبێ.

## ٣٢١) مەرجەکانی هاوسەرداری ئەمانەن:

**یەکەم:** ئەرکداریو ئەرك لە سەری (تەکلیف) کەواتە تۆڵەو داری حەدد لەسەر منداڵو شێت نیە، بەڵام بە شتێ کە چاو ترسێنیان بکا تەمێ دەکرێن، وەك لەسەر کردنی هەموو شتێکی نادروست تەمێیەکی ئاوا دەکرێن کە عاریان پێبنێ.

**دووەم:** ئازادی. کۆیلە بە هاوسەردار بەم مەعنایە دانانرێ، با لەوەوپێش لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەری خۆیدا جووت بووبێ! چونکە ئازادی نیشانەی تەواویو خانەدانیو گەردن بەرزیو سەر بەرزییە، خانەدانیش خۆی لە شتی وا دەپارێزێ کە ناموسو ئابڕووی بەرێ، بە پێچەوانەی کۆیلەوە، چونکە کۆیلە لە پێکراوە ئەوەندە بە چاوی سووك تەماشاکراوە دەربەستی ئەوە نەماوە کە وەك مرۆڤی ئازاد پارێز لە سووکایەتی بکا!.

جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە پەیمانی لە ژنان وەرگرت، لەسەر ڕەفتارکردن بەم ئایەتە بەیعەتی لێ وەردەگرتن: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ} کە ئەمە پوختەی ڕاڤەکەیەتی: ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات کە پەیمانت پێ بدەن لەسەر ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە هاوبەش بۆ خودا بڕیار

نەدەن‌و دزی‌و حیزی‌و داوێنپیسی نەکەن... تاکۆتایی ئایەت، جا هیند (ڕەزای خوای لێبێ) کە بۆ یەکەمجار ئەمەی بیست بەسەرسامی لەو گۆشە نیگایەوە کە ئافەرەتی ئازاد چۆن شتی وا دەکا گوتی: بۆچی ژنی ئازادیش حیز دەبێ؟!!.

**سێیەم**: دروستبوون لەگەڵ هاوسەردا، بۆ ئەمە ئەوەندە بەسە کە سەری چووك ئەو ئەندازەیەی کە سوننەت دەکرێ، نوقم ببێ لەناو زێدا، با ڕەحەتبوونیش روونەدا. مەبەست لە هاوسەری دروست‌و حەڵاڵ ئەوەیە کە ژن‌و مێرد بە مارە بڕینی دامەزراو بە یەك گەیشتبن، کەواتە مارە بڕینی دانەمەزراو بەرناکەوێ، چونکە ئەوە نابێ بەهۆی هاوسەرداری (احصان) چونکە نادروستەو نابێ بەهۆی مەردی‌و ڕەوشت تەواوی. بزانە بۆ جێبەجێکردنی تۆڵە مەرج نیە هەردوو لا هاوسەرداربن، لەبەر ئەوە ئەگەر کوڕێ لەگەڵ ژنێکی هاوسەرداردا ئەو ئیشەی کرد، یا کچێ لەگەڵ پیاوێکی هاوسەرداردا ئەو ئیشەی کرد، لەم دوو کاتەدا هاوسەردارەکەیان بەردەباران دەکرێ‌و بێ هاوسەرەکەیان دارکاری دەکرێ‌و ساڵێ ڕەهەنە دەکرێ.

## ٣٢٢) تۆڵەی بەندەو کەنیزەك:

بەندە یا کەنیزەك هەر کاتێ داوێنپیسیان کرد پەنجا داری حەددیان لێ دەدرێ، بەپێی ئایەتی: {فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ – سورة النساء – ٢٥/٤} لەبەر ئەوەیش کە کۆیلە بەهۆی کۆیلەییەوە ناتەواوە، کەواتە باوەك ژنهێنان‌و عیددەو

تەڵاق بەقەد نیوەی ئازاد حسێبی بۆ بکرێ، چونکە بەندە بۆی هەیە دووو ژن بهێنێ، عیددەی کەنیزەك نیوەی عیددەی ژنی ئازادە، تەڵاقی بەندەیش نیوەی تەڵاقی ئازادە، کەواتە با حەددەکەیشی نیوەی حەددی ئازاد بێ! کۆیلە نیو ساڵ شار بەدەر دەکرێ واتە: شەش مانگ.

## ٣٢٣) باسی نێربازیو چوونە لای چوار پێ:

نێربازیو هەتیوبازی تاوانێکی گەلی گەورەیە، لە گوناهە هەرە گەورەکانە، هۆی پێویستبوونی تۆڵەیە، برێتییە لەوە کە مرۆڤ بە پاش بچێتە لای مرۆڤی نێرینە. دەی هەر کەسێ بە ئارەزوو بە پاش بچێتە لای مرۆڤێکی نێرینە، ئەوە لە چەشنی تۆڵەی داوێنپیسی تۆڵەی لێ دەسێنرێ، ئەگەر هاوسەرداربێ بەردەباران دەکرێ، ئەگەر بێ هاوسەر بێ سەدداری لێ دەدرێو ساڵێ رەهەنە دەکرێ، خواه موسوڵمان بێ یا پەیماندار بێ، یا هەڵگەڕاوەبێ، بە مەرجێ ئەرك لەسەر (مكلف) بێو بزانێ کە ئەوە نادروستە. چونکە خودای گەورە ئەم کارە پیسەیشی ناو ناوە فاحیشە. واتە: کاری شەرماوەری ئابڕووبەر، وەك قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی حەزرەتی لووط (دروودی خودای لێبێ) دەفەرموێ: {أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ – ٧/٨٠} هەروا دەفەرموێ: {وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا – سورة النساء – ٤/١٦} پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: (ئەگەر پیاوێ سواری پیاوێ بوو هەدووکیان داوێنپیسن) هەیشە دەڵێ: بەبێ بەندو مەرج تۆڵەی کوشتنە، خوای هاوسەردار بێ یاخود بێ هاوسەربێ، بەڵگەی ئەم

فەرمووده‌یەتی (دروودی خوای لەسەربێ): (هەر کاتێ دیتانو ساخ بۆوه بۆتان کە کەسێ پیشه پیسەکەی هۆزی لووط دەکات - واتە: بە پاش سواری یەکێ بووه – بکەرو بدەر هەردووکیان بکوژن) لە گێڕانەوەیەکدا: ئەوی سەرەوەو ئەوی ژێرەوە هەردوو لایان بەردەباران بکەن. (ئەبو داوودو تیرمیذیو ئیبنو ماجه. حاکم دەفەموێ: رشتەکەی دروستە).

## چۆنێتی کوشتنی نێرباز:

لە چۆنێتیی کوشتنی نێربازدا راجیایی هەیە: هەیە دەڵێ: وەك هەلگەڕاوە بە شمشێر دەکوژرێ، چونکە لە دێریندا کوشتن زۆرتر بە شمشێر دەبوو، نەوەوی ئەم رایە بە دروست دادەنێ، هەیشە دەڵێ: بەردە باران دەکرێ، لەبەر ئەم گێڕانەوەی تر: ئەوەی کە لە ژێرەوەیە سەنگەسار بکەن. لەبەر ئەوەیش کە هۆی ئەم کوشتنە چوونەلای نارەوایە، کەواتە دەبێ وەك کوشتنی داوێنپیس بە بەردەباران بێ، هەیشە دەفەرموێ: دەکرێ بە ژێر دیوارەوەو دیوارێ دەرووخێنرێ بە سەریدا، یا لە هەڵدێرێکەوە گولۆر دەکرێتەوە هەتا دەمرێ، ئەمەیش لە چۆنێتی سزای هۆزی لووت وەرگیراوە وەك لە قورئاندا باس کراوە. جیاوازی نیە لە نێوانی بیانیو نا بیانیدا، یا لە نێوانی بەندەی خۆیو بەندەی کەسێکی تردا، چونکە بە هیچ شێوەیێ کۆم حەلاڵ ناکرێ، جا ئەگەر ژنێکی بیانی وا لێ کردو بە کۆم چووە لای ژنێ کە ژنی خۆی نەبوو، یا کەنیزەکی نەبوو، ئەوا هەمان راجیایی پێشوو لە بارەی بکەرەکەوە لەم حاڵەیشدا دووبارە دەبێتەوە، چونکە لەسەر فەرمایشتی هەرە دروست چوونە لای ژنی بیانی بە پاش حوکمی چوونە لای هەتیوی

هەیە. بەڵام سزای ژنەکە لەسەر رای هەرە دروست: سەددارو رەهەنە کردنە. ئەگەر مێرد بە کۆم بڕواتە لای ژنی خۆی ئەگەر دووبارەی کردەوە تەمێ دەکرێ، بەڵام لە جاری یەکەمدا تەمێ ناکرێ، ئەمە دەقی فەرمایشتی شافیعی خۆیەتی لە کتێبی (المختصر)دا، کۆمەڵێ تریش ئەمەیان بە راشکاوی ئاشکرا کردووە، بە هەرحاڵ بە کۆم بڕواتە لای حەڵاڵی خۆی کارێکی نادروستەو لە شەرعا رێگەی نەدراوەو نەیی لێکراوە.

هەروا چوونە لای چوارپاو ئاژەڵ نا دروستە، بەبێ گومان چونکە ئەمیش دادەنرێ بە (فاحشە)وە تۆڵەی داوێنپیسی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، لەسەر قسەی قیلێ، وە فەرقی هاوسەردارو داراوبێ هاوسەر دەکرێ،چونکە ئەمیش تێرۆکردنی چوو کە بە زێدا، کەواتە وەك تێرۆکردن بە زێی ژندا وایە، کەواتە بڕیاری ئەوی هەیە، قیلێ تر دەفەرموێ: تۆڵەی کوشتنە (خوای هاوسەردار بێ یا بێ هاوسەر بێ) بەپێی فەرموودەکەی {درووده خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ بڕواتە لای چوارپا (بهیمە)یێ خۆیو چوارپاکە بکوژن. (ئەبو داوودو تیرمیذیو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە. حاکم دەفەرموێ: رشتەکەی دروستە) قیلێکیش دەفەرموێ: تەنیا تەمێکرن پێویستە. قسەی ئەم قیلە راستو دروستە، بەڵگەیش ئەم فەرمایشتەی ئیبنو عەبباسە {رەزای خوایان لێبێ} کە دەفەرموێ: حەدد لەسەر کەسێ نیە کە بڕواتە لای گیانلەبەران. (نەسائی) دەی شتی وا ئیبنو عەبباس لە خۆیەوە نایڵێ، بەڵکوو لە سوننەتی وەرگرتووە، سەرچاوەی سوننەتیش سرووشی خواییە کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر. دەی وا بەپێی ئەم فەرمایشتەی ئیبنو

عەبباس حەدد نیە، کەواتە تەمێکردن دەچەسپێ چونکە کابرا تاوانێکی وای ئەنجام داوە کە نەحەددو تۆڵەی هەیە نە کەفارەت، دیسان بەڵگەی دروستی قسەی ئەم قیلە ئەمەیە: ئەم جۆرە زێیە دڵی مرۆڤی دەروون پاك بە سروشت حەزی لێناکا حەددیش لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە دانراوە کە مرۆڤ چاوترسێن بکا نەبادا شتێکی حەزلێکراو بکا. ئەم رایە دەقی قسەی شافیعی لەسەرە، هەندێ زانایش بەبێ سێ‌و دوو بە رای هەرە دروستی دادەنێن.

## ٣٢٤) حوکمی چوونە لایێ بە شەرمگا نەبێ:

هەرکاتێ کەسێ خۆی هەڵسووی لە ژنێکی بیانی‌و خۆی پێ رەحەت کرد، بەبێ ئەوە کە زەکەری بکا بە فەرجیدا، ئەوە حەددی لەسەر نیە، گەرچی ئەندامی بکا بە ناوکیدا، یا بە دەمیدا، بە پێی ئەم فەرموودەیە کە ئەبو داوود لە ئیبنو مەسعوودەوە دەیگێڕێتەوە: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} گوتی: من خۆم هەڵسووی لە ئافەرتێ خەڵکی ئەو پەڕی شارە، خۆم پێ رەحەت کرد، بەلام بە دەستم نەگرت، وا بەپێی خۆم هاتوومەتە بەردەستی تۆ بڕیاری شەرعی خودام بەسەردا جێبەجێ بکە. حەزرەتی عومەریش {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: تۆ خودای گەورە سڕی پۆشیوی، بۆ سڕی خۆت هەڵدەماڵی؟ پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} وەلامی پیاوەکەی نەدایەوە، هەتا رۆیشت، جا پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} پیاوێکی دواخست، رۆیشت هەتا گرتیەوە، لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە:

{وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ – سورة هود – ١١٤/١١} واته: هەموو شەوو رۆژێ پێنج نوێژه فەرزەكان لەكاتی خۆیانا بكەن، ئەم نوێژانه له كردەوه هەره باشەكانی ئێوەن، بزانن كه یاسایەكی خوداییه كه كردەوەی باش‌و كاری چاكه هەمیشه كردەوەی خراپ‌و تاوان لا دەبەن‌و دەیسڕنەوه تا كۆتایی ئایەت. جا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمه به تایبەتی هەر بۆ ئەو وایه یا بۆ گشت كەسێ هەر وایه؟ فەرمووی: ئەم بڕیاره بۆ گشت كەسێ وایه) (موسلیم / تیرمیذی) (بڕوانه تاج/١ ل – ١٨٥ ز – ٤٣ – وەرگێڕ).

بەڵێ ئەگەر دوو كەسی بیانی كه لەیەك حەرام بن به گیانی خۆیان، كۆم‌و زێی لێ دەرچێ، ئاوی خۆیان بهێننەوه، یا هەر یەكێكیان بەوی تریان لەسەر ئەم شێوەیه خۆی رەحەت بكا، ئەوه تۆڵه (واته: حەدد) لەسەر هیچ كەسێكیان پێویست نابێ، بەڵام تەمێ دەكرێن. تەمێكردنیش سزایەكه نابێ له كەمترین حەدد كه ده قەمچییه تێپەڕ بكا، چونكه خۆشەویست (درووده خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەگەر بۆ حەددی شەرعی كه شەرع ژمارەی جارەكانی دیاری كردووه ئەگینا لەسەر هیچ شتێكی تر له دەدار، یا له دەقەمچی زیاتر له كەسێ بدات، نادرێ (ش/د/ت/ن) له گێڕانەوەیەكا: كەسێ به قەد حەددێ له كەسێ كه حەددی لەسەر نەبێ ئەوه دەست درێژیكاره.

## ٣٢٥) باسی ئاو هێنانەوە (استمناء):

ئاو هێنانەوەو خۆرەحەتکردن بە دەست نادروستە بەڵکوو لە گوناهە هەرە گەورەکانە، وە کەسێ ئەوە بکا بەر ئەم نەفرەتو لەعنەتە دەکەوێ کەوا لەم فەرموودەیەدا: نەفرەت لێکراو ئەو کەسەیە بە دەستی خۆی ئاوی خۆی بهێنێتەوە. دیسان لەبەر ئەم هۆیەیش نادروستە: خۆرەحەتکردنی وا بە ئەزموون دەرکەوتووە سەر دەکێشێ بۆ شێواویی هۆشو زەبوونیو لاوازیی لەشو دەیشبێ بەهۆی وەجاخ کوێریو برانەوەی نەتەوە، بڕیارەکەی وەك بڕیاری خۆرەحەتکردن بە ژنی بیانی وایە، کە بە لەشی نەك بە پاشو پێشی ئاوی خۆی بهێنێتەوە، کەواتە: ئەمیش تەمێکردنی لەسەرە (مەبەست لە ژنی بیانی – المرأة الاجنبية – لەم جۆرە شوێنانەدا ژنێکە کە حەڵاڵو هاوسەر نەبێ، ژنی خوۆییش بۆ ئەم مەبەستە بە بیانی دادەنرێ، چونکە مارەی نایەت لە پیاوی خۆیی – وەرگێڕ).

## ٣٢٦) پانپانۆکێی ژنان (تساحق النساء):

پانپانۆکێ: خۆ بە یەکتر رەحەتکردنی ژنانە (تەماشای فەرهەنگی خاڵو هەنبانە بۆرینەی هەژار بفەرموو – وەرگێڕ) هەر ژنێ کاری وا بکا تەمێی شەرعی – کە پێی دەگوترێ: تەعزیر – دەگرێ. چونکە کارێکی نادروستە، گوناهەکەی بەقەد گوناهی داوێنپیسییە، بەپێی ئەم فەرموودەیەی {دروودی خوای لەسەربێ}: ژن سواری ژن ببێ هەردوو لایان دادەنرێن بە داوێنپیس.

## ٣٢٧) بوختان (القذف):

بوختان – که له عەرەبیدا پێی دەگوترێ (قەذف) واتە: فڕەدانو بۆ هەڵدان. وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (فاقذفیه فی الیم) واتە: ئەوجا هەڵی بدەرە ناو دەریای نیلەوە، لە عورفی شەرعی شەریفا بریتییە لە هەڵبەستنی تۆمەتی بوختانی داوێنپیسی بۆ کەسێ بە جۆرێکی وا کە تووشی شەرمەزاری بکا. ئەم جۆرە بوختانە لە گوناهە هەرە گەورەکانە، بەپێی نامەو ڕێگەی ڕەهبەرو یەکگرتنی نەتەوە، حەددی تایبەتی خۆی هەیە.

**مەرجی بوختانکەر: ئەم سێ شتە مەرجە:**

**یەکەم:** دەبێ ڕەسیدەو هۆش ساغ بێ، کەواتە: منداڵو شێت حەددیان لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر بەشی خۆیان فامیان هەبوو بەپێی ئەوە تەمێ دەکرێن.

**دووەم:** نابێ بوختان بۆ کراوەکە لە نەوەی بوختانکەرەکە بێ، واتە: بوختانەکەر لە بنچینەی نزیك یا دووری بۆختان بۆ کراو نەبێ، وەك باوكو دایكو باپیرەو نەنك. چونکە لە شوێنێ بنەچە لە جیاتی وەچەی خۆی نەکوژرێتەوە ئیتر چۆن بەهۆی بوختان بۆی، داری حەددی لێ دەدرێ؟!

بەڵام بنەچە ئەگەر بوختانی داوێنپیسی بۆ نەوەی خۆیان بکەن تەمێ (تەعزیر) دەکرێن، چونکە بوختان ئێش بە دڵ دەگەیەنێ.

**سێیەم:** ئەوەیە بە ئارەزووی خۆی بوختانەکە بکا، بە زۆر پێی نەکرێ، جا ئەگەر کەسێ بە زۆر ئەوەی کرد حەددی لێ نادرێ بەپێی فەرموودەی: (قەڵەمی تەکلیف لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوە) (لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەم دوو مەرجەی تریشی هەیە:-

**چوارەم:** ئەوەیە بڕیار (ئەحکام)ەکانی ئیسلامی لە ئەستۆ گرتبێ، کەواتە حەددی بوختان نادرێ لە بێبڕوای جەنگی.

**پێنجەم:** ئەوەیە کابرای بوختان بۆ کراو خۆی ڕێگەی ئەوەی نەدابێ – وەرگێڕ).

## مەرجەکانی بوختان بۆکراو:

ئەوەیە کە داوێنپاکبێ (واتە: موحصەن بێ) چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ – نوور – سورة النـور – ٤/٢٤} وە ئەو کەسانەی کە نیسبەتی ئافەرتی حوڕی باڵغی عاقڵی موسوڵمانی پاك لە داوێنپیسی دەدەن. (تەفسیری نامی) دیارە کە مەرجی ئیحصان ئیسلام و ڕەسیدە بوون و هۆشی ساغ و ئازادی و داوێن پاکی و مەردییە. کەواتە: ئەگەر بوختانی داوێپیسی بکا بۆ بێبڕوایێ، یا منداڵێ، یا شێتێ، یا بەندەیێ، یا کەنیزەکێ، یا زیناکارێ ئەوە حەددی لەسەر نیە، چونکە بە مەرج گرتنی داوێنپاکی بەپێی ئایەتەکە ئەمانە بەرناکەون. بەڵێ ئەوەندە هەیە بۆ ئەوەی نەبێ بەهۆی ئازارو ئاژاوە بەرپابوون، کەسێ کارێکی وا بکا تەمێ دەکرێ.

## ٣٢٨) حەددی بوختیان:

حەددی بوختیانکەری رەسیدەی خاوەن هۆشی ساغی سەربەست (مختار) خوای موسوڵمانبێ، یا پەنادراوبێ، یا پەیماندار بێ، یا هەڵگەڕاو بێ، بەپێی دەقی قورئانو سوننەتو یەکگرتن چەسپاوە، بە مەرجێ رێگرێ نەبێ، وەك ئەوە بوختیارنکەر بنەچەی بوختیان بۆ کراوبێ، یا بوختیان بۆکراو موحصەن نەبێ. جا ئەو بوختیانکارە ئەگەر ئازاد بوو حەددەکەی هەشتا دارە، بەپێی ئایەتی {فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً – سورة النور– ٢٤/٤}. ئەبوو داوود لە عائیشەوە (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە: کاتێ کە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە کە باسی داوێنپاکیو پاکیی منیان تیادایە، کە ئەو بوختانەی بۆ منیان کردبوو ئەو ئایەتانە پووچیان کردنەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەستا چووە سەر دوانگەو وتارێکی خوێندەوەو ئەو باسەی باس کردو ئایەتەکانی خوێندەوە بۆ خەڵکەکە، جا کە هاتە خوارەوە لە دوانگەکە فەرمانی فەرموو داری حەددیان دا لە هەردوو پیاوەکە کە حەسسانی کوڕی سابیتو میسطەحی کوڕی ئوثاثە بوون، وە هەروەها داری حەددیان لە ژنکەیشدا کە حەمنەی کچی جەحش بوو کە ژن خوشکی پێغەمبەر بوو.

طەحاوی دەفەرموێ: واتە: یەکی سەرو هەشتا داریان لێ دان، بۆیە حەددی بوختان کەمترە لە حەددی داوێنپیسی چونکە بوختان خۆشی کەمترە لە داوێنپیسی.

بەڵام ئەگەر بوختیارنکەرەکە کۆیلە بوو حەددەکەی چل دارە، ئیتر خوای بەندەی تەواوبێ، یا پاشمەرگە (مودەببەر) بێ، یا دایکی

منالْ بێ، یا بەشبەش (مبعض)بێ. چونکە ئەبو بەکرو عومەرو عەلی (رەزای خوایان لێبێ) هەروا کاربەدەستەکانی تری دوا ئەوانیش لەکاتی وادا چل داریان لە بەندە دەدا، وەکەسیش رەخنەی لێ نەگرتوون، وەکی تریش ئەم حەددە لەو جۆرە حەددانەیە کە قەبوولی بەش بەشکردن دەکا، کەواتە لەمیشدا وەك حەددی داوێنپیسی یا حەددی بەندە نیوەی حەددی ئازادبێ!

ئەگەر کەسێ گوتی: ئایەتەکە رەهایە بەبێ مەرج و بەند دەفەرموێ، هەرکەس بوختیان بۆ ژنی مەردی داوێنپاك بکا هەشتا داری لێ بدەن، کەواتە ئازادو بەندە وەك یەك دەگرێتەوە کەواتە ئێوە چۆن دەڵێن حەددی بوختیانی بەندە چل دارە؟ لە وەلاما دەڵێین: ئایەتەکە سەبارەت بە مرۆڤی ئازادە، بەڵگەی ئەم وەلامە فەرموودەی زاتی مەزنە: {وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا – سورة النور – ٢٤/٤} چونکە بەندە بەبێ بوختیانکردنیش شایەتیدانی بەیەخی نیە! ئایەتەکەیش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەمانە لە پێش بوختیانەکەدا شایەتیان قەبوولْ بووەو بایەخی بووە، کەواتە مەبەست لێیان مرۆڤی ئازادە نەك بەندە.

## ٣٢٩) بەچی حەددی بوختان لە کۆڵ دەکەوێ؟

**بەم سێ رێگەیە ئەم حەددە لە کۆڵ دەکەوێ:**

**یەکەم:** راستکردنەوەی بەڵگە لەسەر بوختان بۆکراو. خوای بوختان بۆکراو ژنی کابرای بوختانکەر بێ، یا ژنێکی بیانی بێ، بەڵگەی

ژنی بیانی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ: {لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً - سورة النورثم - ٤/٢٤} ئەوەتا ئایەتەکە کاتێ فەرمان دەکا بە جەڵدە لێدان کە شایەتو بەڵگە نەبێ لەسەر راستیی داواکە. بەڵگەی ئەوەیش کە بەراست کردنەوەی بەڵگەو شایەت حەددی بوختان لە کۆڵ مێرد دەکەوێ فەرموودەکەی هیلالی کوڕی ئومەییەیە کە لە باسی شەڕە نەفریندا رابورد، کە تۆمەتی ناپاکی لە ژنەکەی خۆیدا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} پێی فەرموو: یا بەڵگەو شایەت لەسەر راستیی ئەم قسەیە راست دەکەیتەوە، یاخود پشتی خۆت ئامادە بکە بۆ داری حەددی بوختان بۆ ژنی مەردی داوێنپاك! وە چەند جارێ ئەم گوفتوگۆیە لە نێوانی هیلالو پێغەمبەردا دووبارە بۆوە!.

**دووەم:** کاتێ بوختان بۆکراو خۆی دانی نا بە تاوانی خۆیدا حەددەکە لەکۆڵ بوختانکەر دەکەوێ، چونکە پێلێنان سەروەری هەموو بەڵگەکانەو باشترینو رۆشنبیرین بەڵگەیە.

**سێیەم:** لێخۆشبوونی بوختان بۆکراو، چونکە ئەم تۆڵەیە مافی تایبەتی خۆیەتی، لەبەر ئەوە بەبێ رەزابوونی خۆی ئەم تۆڵەیە جێبەجێ ناکرێ، جا کاتێ لە کابرا خۆش بێ تۆڵەی لە کۆڵ دەکەوێ.

## ٣٣٠) مەیخۆر - بادەنۆش - مەینۆش:

بادەنۆشی تاوانێکی گەلێ گەورەیە، لە گوناهە هەرە گەورەکانە، هۆش لابەرەو دەبێ بەهۆی لابردنی هۆش.

دەی هەر شتێ بە شێوەیەکی یاساخ ببێ بە مایەی لابردنی هۆش لە شەریعەتی هەموو نەتەوەکانا شتی وا یاساغو نادروستە. چونکە هۆش یەکێکە لەپێنج هەمەکییەکان، کە ناودارن بە (کلیاتی خەمس) کە لە شەریعەتی هەموو میللەتێکا دەپارێزرێن. ئەوەتا خودای گەرەیش لە نامەی نازداری خۆیدا کە قورئانی پیرۆزە فەرمانمان پێ دەفەرموێ کە بەهیچ جۆرێ توخنی ئارەقو مەیو بادە نەکەوین، وە بۆی روون کردووینەتەوە کە شتی وا پیسو چەپەڵەو لە کارو کردەوەی شەیتانەو لە مرۆڤی موسوڵمانی هۆشیار ناوەشێتەوە. خوا دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - سورة المائدة - ٥/٩٠} خۆشەویستیش (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو سەرخۆشکەرێ نادروستە (موسلیم) لە بوخاری شەریفا دەفەرموێ: چەند هۆزێ لەناو نەتەوە (ئوممەت)ی مندا پەیدا دەبن ئەم سێ شتە بە حەڵاڵ دەزانن: ئاوریشم بۆ پیاوو مەیو ئامێری مۆسیقاو شتی وا لە گێڕانەوەیەکا لە ئەبو مالیکی ئەشجەعیەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): بەخودا رۆژێ دێ گەلێ کەس لە نەتەوەی من مەی دەخۆنەوە، بە ناوێکی ترەوە ناوی دەنێن، بەزمو رەزمیان بۆ ساز دەگرێو بلوێرو زورناو شتی وایان بۆ لێ دەدرێ، لە ئەنجاما گەلێ لەمانە خودا بە ناخی زەویدا رۆیان دەچوێنێو هەندێکیشیان دەکا بە مەیموونو بەراز[1].

---

[1] لە پێش جەنگی کەنداودا هەندێ مرۆڤی ریژدان مردوو بە ناوی حەجەوە دەچوون بۆ حیجاز، کە دەهاتنەوە: کاغەزی قومارو ڤیدیۆو ویسکیو شتی وایان لەگەڵ خۆیان

جەوهەری {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: هەر خواردنەوەیەك كە زۆری مرۆڤ سەرخۆش بكا كەمیشی وەكوو زۆری حەرامە. چونكە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ}: هەرشتێ زۆرەكەی خەڵك سەرخۆش بكا كەمەكەیشی حەرامە وەك زۆرەكەی.

## ٣٣١) حەددی ئارەقخۆر:

هەر موسوڵمانێكی رەسیدەی هۆش ساغی سەرپشك (مختار) شتی سەرخۆشكەر بخواتەوە حەددی لەسەر پێویست دەبێ، مەرجی جێبەجێكردنی ئەم حەددە چەند شتە:-

**یەكەم:** ئەوەیە مەیخۆر موسوڵمانبێ.

---

دەهێنا منیش بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرەم گوت:

حاجی و ڤیدیۆو قومارو ویسكی

ئەمە پێی دەڵێن حاجی برێكی

مەبەستم ئەوەیە كە ئەو هەڕەشەیەی لەم فەرموودەیەدا كراوە، هاكا هاتەدی. جا خودا پەنای حاجی و شێخ و مەلاكان بدا، چونكە بە راستی شیرازەی كروبار تەواو ئاڵۆسكاوە لە ستایشی مەلای سۆشیالیستا گوتوومە:

مەلا بانگی كرد بە بانگی پارە

ویردی سەرزاری باسی دوولارە

- وەرگێڕ -

**دووەم:** ئەرك لەسەر (مكلف)بێ.

**سێیەم:** ئەوەیە سەرپشكبێ. واتە: بە ئارەزووی خۆی بێ.

**چوارەم:** ئەوەیە كە بزانێ ئەوە مەیە دەیخواتەوە.

**پێنجەم:** ئەوەیە بزانێ كە ئەرەق خواردنەوە حەرامە.

بەلام مەرج نیە كە ئەوەندە بخواتەوە هەتا سەرخۆی بكا. جا مەینۆشەكە ئەگەر ئازاد بوو چل داری لێ دەدرێ. چونكە وەلید ئارەقی خوردبۆوە، لە خزمەت عوسماندا داری حەددیان لێدا، عەبدورەحمانی كوڕی جەعفەر دارەكانی لێ دەدا، عەلیش دەیژماردن، هەتا بوون، بە چل دار، عەلی گوتی: ئیتر بەسە. ئینجا فەرمووی:پێغەمبەر خۆی (درووده‌ی خوای لەسەربێ) چل داری لێ دەدا، ئەبو بەكریش هەروەها بەلام عومەر هەشتا داری لێ ئەدا، ئەمانە هەموویان هەر شوننەتن‌و ڕێگەی شەرعن، بەلام من بەش بەحالی خۆم چلەكەم پێباشترە لەبەر ئەوە كە ئەمە سوننەتی پێغەبەر خۆیەتی (درووده‌ی خوای لەسەربێ) (موسلیم) لە فەرموودەیەكی تری موسلیمدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووده‌ی خوای لەسەربێ) فەرمانی كرد كابرایەكی مەیخۆریان داركاری كرد، بە دوو پەلكە خورما چل جاری لێدا. ئەگەر پێشەوای موسولمانان وای بەباش زانی كە داری حەددی ئازاد بگەیەنێتە هەشتا دارو داری حەددی بەندە بگەیەنێتە چل دار دروستە بۆی كە ئەوە بكا. بەپێی ئەو فەرموودەیەیی كە موسلیم دەیگێڕێتەوە كە دەفەرموێ: ئیمامی عومەر ژمارەی داری حەدی بادەنۆشی كرد بە هەشتا دار. عەلیش بە عومەری فەرموو: پیاو كە خواردیەوە سەرخۆش دەبێ، كە سەرخۆش بوو دەبرسكێنێ، كە

برسکاندی بوختـان دەکـا، دەی ژمـارەی داری حـەددی بوختیانکـەریش هەشتا دارە، جا عومـەریش رەفتـی بـەم فـەتوای عەلییـە کـرد، کەسـیش رەخنەی لێ نەگرت.

## کەی ئەم تۆڵەیە جێبەجێ دەکرێ؟

حـەددی شـەرعی تۆڵەیـە کـە پێویـستە لەسـەر تۆڵـە لێ سـەنراو جێبەجێ بکرێ بە هاتنەدی یەکێ لەم دووشتە:

**یەکـەم**: کـابرا بـەدەمی خـۆی پـێ لـە تاوانەکـەی بنـێ بـەبێ زۆری زۆردار، چونکە پێڵێنان سەرومری بەڵگەکانەو گەورەترین بەڵگە لەسـەر تاوانباریی تاوانبار ئەوەیە کە خۆی پێ لە تاوانی خۆی بنـێ. وەك ئـەوە بڵێ: بە ئارەزووی خۆم بادەم نۆشیوە، هـەقیش دەمزانـی کـە ئـەوە مەیـە دەیخۆمەوە، باش باشیش دەزانم کە مەیخواردنەوە نادروستە.

**دووەم**: ئەوەیە کە دوو پیاو یا زیاتر شایەتی لێ بـدەن بـە مـەرجێ مەرجی شایەتیان تیادابێ. بەهۆی رشانەوەوە یـا بـەهۆی بـۆنی ئارەقـەوە حەددی لێ نادرێ، چونکە هەڵدەگرێ کـە زۆر لێکراو بووبـێ، یـا بەهەڵـە بووبێ، لەبەر ئەوەی تریش کە گەڵێ شتی تـریش بـۆنی وەك بـۆنی مـەی وایـە، بنـەڕەتیش پـاکیو بـێ تاوانییـەو نـەبوونی تۆڵەیـە، یاسادانەریش (کە خودای گەورەیە) بە ئارەزووی تـەواوەوە چاوەنواڕی ئەوەیـە کـە بـە نیمچە مەهانەیێ حەدد لەسەر موسوڵمان لابرێ.

## ٣٣٢) خۆتیمارکردن بە مەی دروست نیە:

خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} هەواڵی داوە: کە مەی دەردە نەك دەرمان طاریقی ئەل — جەعفی - {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد {دروودی خوای لەسەربێ}: من ئارەق دروست دەکەم، ئەویش رێگەی ئەوەی نەدام، یا فەرمووی: حەزرەت پێی ناخۆش بوو کە شتی وا بکەم، منیش عەرزیم کرد: خۆ من بۆ دەرمان دروستی دەکەم نەوەك بۆ خواردنەوە؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: ئارەق دەرمان نیە بەڵام دەردە! (ئەحمەد / موسلیم / ئەبو داوود / تیرمیذی) دەی ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروست نیە خۆ دەرمانکردن بە بادە بکرێ، چونکە خۆی دەردە، دەی چۆن دەرد دەبێ بە دەرمان؟! کەواتە: مەی حەرامە رێك وەك مردارەوەبوو وایە، بەکارهێنانی دروست نیە مەگەر لەکاتی ناچاریدا، بەڵام ئەگەر کابرا پارووێ گیرایە قورگیو لە ئارەق بەولاوە شتێ تر نەبوو خۆی پێ رزگار بکا، ئەوە دروستە بۆی ئەوەندە بخواتەوە کە پاروەکە بەرێتە خوارەوە. یا وەك ئەوە کەسێ تووشی کێشەیەکی دڵ ببێ، جگە لە مەی شتی تر نەبێ کە چاری ئەو کێشەیەی پێ بکرێ ئەوە دروستە بۆی کە ئەوەندە بخواتەوە کە کێشەکە بەری بدا، یا وەك ئەوە کەسێ وەخت بێ لە سەرمانا رەق ببێتەوە، شتێ تر نەبێ کە گەرمی بکاتەوەو لە رەقبوونەوە رزگاری بکا جگە لە خواردنەوەی مەی. بەڵێ لە وێنەی ئەم بارودۆخانەدا دروستە ئەوەندەی لێ بخواتەوە کە زیانەکە نەهێڵێ. چونکە یاسایەکی رەسای دامەزراو هەیە دەفەرموێ: ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکا. بەس ئەوەندە هەیە: شت

لەکاتی ناچاریدا بە ئەندازەی ئەو ناچارییە ئەندازەی بۆ دیاری دەکرێ، نەك وەك کاتی ئاسایی! بۆ زیادە روون کردنـەوە دەڵێین: گۆشت لـەکاتی ئاساییدا چەند دەخۆی بخۆ، ئەندازەی بۆ دیاری نـەکراوە، بـەڵام گۆشتی مردار، لەکاتی ناچاریدا ئەندازەی بۆ دیاری کراوە، دەبێ ئەوەنـدە بخۆی کە بەری دڵت بگرێو لە مردن رزگارت بکا، نابێ وەك کاتی ئاسایی تێرو تەسەلی لێ بخۆی.

## ٣٢٣) باسی حەددی دزی:

دزی لە عورفی شەرعا ئەوەیـە مـاڵی کەسێکی تـر بـە نهێنـی بـە دزەکە دزکەبەری بۆ خۆت، بـە مـەرجێ ئـەو ماڵە لـە جێگـەی پاراستنی وێنـەی خۆیـدا دانرابـێ. دزی دەبـێ بـەهۆی دەسـت بـڕین بـە نامـەو بەرێگـەی رەهبـەرو بـە یـەکگرتنی نەتـەوە. زاتـی مـەزن دەفـەرموێ: {وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – سورة المائدة ٣٨/٥} واتە: دەسـتی پیـاوی دزو دەستی ژنـی دز لەسـەر دزێتـی ببڕن، چونکە ئـەوە ئـەو تۆڵەیـە کـە خـودا بریویێتـەوە بۆیـان، تـاببن بـە پەنـد بـۆ چـاو ترسـاندنی خـەڵکی تریش.

صـەفوانی کـوڕی ئومەییـە فـەرمووی: لـە مزگـەوت خـەوتبووم لەسـەر کراسـێکی خـوری گـوڵ گـوڵی، کراسـەکە دزرا، دەزەکـەمان گـرتو بردمان بۆ لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بۆ دادگایی، فـەرمانی فـەرموو کە دەستی ببڕن، عەرزیم کرد: قوربـان! لەسـەر کراسـێکی خـوری دەسـتی

زەلامیٚ دەبڕی!؟ من کراسەکە دەبەخشم پێی. فەرمووی: دەبوو لە پێش ئەوەدا کە بیهێنی بۆ لای من و شکاتی لێ بکەی ئەوەت بکردایە!) (ئەبو داوود / ئیبنو ماجە / نەسائی / مالك / شافعی / حاکم. حاکم بە دروستی داناوە).

## ٣٣٤) مەرجەکانی دەستبڕینی دز:

مەرجەکانی دەسبڕینی دز چەند شتە: هەیانە لە دزەکەدا ڕەچاو دەکرێ، هەیانە لە دزراوەکەدا ڕەچاو دەکرێ. مەرجی دزەکە ئەوەیە: ڕەسیدەی هۆش ساغی سەرپشك (مختار)بێ، ئیتر خوای موسوڵمان بێ، یا پەیماندار بێ، یا هەڵگەڕاوە بێ دیەستی دەبڕێ، کەواتە: دەستی منداڵ و شێت و زۆر لێکراو نابڕێ. ماڵە دزراوەکەیش مەرجی ئەوەیە بگاتە ڕادەی خۆی، واتە: بگاتە ئەو ئەندازەیە کە دەستی لەسەر دەبڕێ، کە چارەکە دینارێکی زێڕی ساغی سکە لێدراوە، یا شتێکی تر بێ نرخی بکاتە چارەکە دیناری، یا لەم ئەندازەیە زیاتر بێ. کەواتە: ئەگەر کەسێ چارەکە مسقاڵێ زێڕی سکە لێ نەدراوی دزی، کە نرخی کەمتر بێ لەسکە لێ دراو ئەوە دەستی نابڕێ. بەپێی ئەم حەدیثە کە عائیشە {ڕەزای خوای لێبێ} گێڕاویەتەوە: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: دەستی دز کاتێ دەبڕێ کە بایی چارەکی دیناری زێڕ بدزێ، یا بایی زیاتر بدزێ! (ش/ د/ ت/ ن). ئەوەی کە گوتمان: لەسەر ئەوەیش دەستی دەبڕێ کە شتێکی تر جگە لە زێڕ بدزێ کە نرخی بکاتە چارەکە دیناری، ئەوە قسەی ئیمامی شافیعی خۆیەتی {ڕەزای خوای لێبێ} چونکە

پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} خۆی ئەوەی کردووە ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینی قەلغانێ، کە بایی سێ درەم بووا (ش/د) (سێ درەم لەسەر دەمی پێغەمبەردا بایی چارەکە دینارێکی زێڕ بووە، چونکە دینارێ بە دوازدە درەم بووە – وەرگێڕ).

**شاعیرێ قسەیەکی نەستەقی هەیە، لەم بارەیەوە دەڵێ:**

**يد بخمس مئين عسجد وديت**

**ما بالها قطعت فى ربع دينار؟**

**قازی عەبدول وەهابی مالیکیش** {رەحمەتی خوای لێبێ} **ئاوا وەڵامی دەداتەوە:**

**عز الامانة أغلاها، وأرخصها:**

**ذل الخيانة فافهم حكمة البارى**

**شیعری یەکەم هی ئەبو عەلای موعەررییەو مەبەستی رەخنەیە لە شەریعەتو واتای ئاوایە:**

**پێنج سەد لیرەی زێڕ خوێنی دەستێ بێ**

**سەیرە! دەبڕێ لەسەر یەک روبعێ!**

**شیعری دووەمیش کە وەڵامەکەیەتی مانای ئاوایە:**

**دەستپاکی بەهای دەستی گران کرد**

**دەستپیسیش نرخی تەواو هەرزان کرد**

**مەبە بەکوێری یاخی لە خودا**

**دانایی خودا فێربە ئەی گەدا!**

(وەك بزانین ئەبو عەلای موعەرری کوێر بووە – وەرگێڕ).

جا ئەگەر کەسێ شتێکی خودپیسی دزی وەك مەیو بادە ئەوە دەستی نابڕرێ، خودپیس واتە: نجس العین: یا زور ناو تەمووورەو ئامێری تری کەیفو رابواردنی دزی ئەویش دەستی نابڕرێ، چونکە ئەمانە حەرامن پێویستە لەناو بدرێن، دروست نیە راگرتنیانو هێشتنەوەیان لەلای موسوڵمان، مەرجێکی تری ماڵی دزراو ئەوەیە: ئەو ماڵە بە یەکێ لەم دوو شێوەیە پارێزراوبێ، بەهۆی چاودێری کردنیەوە لە لایەن کەسێکی تواناوە، یا ماڵەکە خوێ لە شوێنێکی مەحکەمو قایمدا دانرابێ، کە بەم شوێنە لە زاراوی شەرعا دەگوترێ: حیرزی میثلی خۆی واتە: جێگەی قایمی پاراستنی وێنەی خۆی. کەواتە: هەر ماڵێ لە جێگەی قایمی پاراستنی خۆیدا نەبێ، ئەگەر کەسێ بیبا بۆ خۆی دەستی نابڕرێ، وەك ئەوە قاتێ جل لەسەر تەنوور دابنرێ، یا لەبەر هەیوان دابنرێ ئەوە جێگەی راپاستنی خۆی نیە، ئەم مەرجە دەقی لەسەر هەیە. ئەم مەرجی پاراستنە بەپێی گۆڕانی ماڵەکەو بارودۆخی رۆژگارو چۆنێتی جێگەو شوێن دەگۆڕێ. بۆ ئەم گۆڕانکارییەیش دەگەڕێینەوە بۆ سەر باوی ناسراوی ناو کۆمەڵ (عرف) چونکە (حیرز) - واتە: پاراستن – نە لە شەرعاو نە لە زماندا کۆگری بۆ دیاری نەکراوە، هەشتێکیش لەم دووشتەدا کۆگرێ نەبێ لە بارەیەوە دەگەڕێینەوە سەر باوی باشی ناو کۆمەڵ. لەم گۆشە نیگایەوەیە ماوەردی (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: جا لەسەر

ئەم بنیاتە شتی وا هەیە لە هەندێ کاتدا دادەنرێ بە پاراستن، بەڵام لە هەندێ کاتی تردا ئەو شتە دانانرێ بە پاراستن، چونکە رۆژگار دەگۆڕێو لەسەر یەك بار نامێنێ، وە هەموو شتێ حسێبی خۆی بۆ دەکرێ.

## بزانە:

لە کاتی قاتو قڕیو گرانی گەورەدا دەست نابڕرێ، ئەم قسەیەی عومەر کە لەم بارەیەوە دەیکا بەسەر ئەم بۆچوونەدا دەبڕرێ کە دەفەرموێ: لە ساڵی برسێتیو گرانی گەورەدا دەستی دز نابڕرێ لەسەر دزی.

مەرجێکی تری شتە دزراوەکە ئەوەیە: ماڵی کەسێکی تر بێ ماڵی دزەکە خۆی نەبێ، وەك ئەوە کابرا ماڵی بارمتەی خۆی لە بارمتەکەر بدزێتەوە، یا لەو کەسە بدزێ کە بەکرێی گرتووە لێی، یا لێی خواستووە، یا بە ئەمانەت لەلای داناوە یا لە ئیشکەری قازانج بەهاوبەشی بدزێتەوە، یا لە جێداری خۆی، یا هاوبەشی خۆی!

مەرجێکی تری دزراو ئەوەیە: کابرای دز بیانووی ملکایەتیو کۆڵکە گومانی ملکایەتی لەو شتەدا نەبێ کە دزیویێتی چونکە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەتا بۆتان دەکرێ بە کۆڵکە مەهانەیێ، بە نیمچە گومانێ حەدد لەکۆڵ موسوڵمان بخەن!. کەواتە: دەستی منداڵو نەوە لەسەر دزینی ماڵی باوكو باپیرەو دایكو نەنكو بنەچەی خۆیان نابڕرێ، هەروا دەستی بنەچەیش لەسەر دزینی ماڵی وەچەی خۆی نابڕرێ، چونکە ماڵی هەریەکێ لە بنەچەو وەچە ئامادەیە بۆ

جێبەجێکردنی پێویستی ئەوی تریان، لەبەر ئەوەیش گومانی ئەوەیش هەیە کە ئەمانە لەناو خۆیانا هەقی ژێواریان لەسەر یەکتری هەیە. هەروا دەستی بەندە لەسەر دزینی سامانی ئاغای نابڕرێ، چونکە گومانی ئەوە هەیە کە هەقی لە سامانی ئاغایدا هەیە، دەستی ژنیش لەسەر دزینی مالّی مێردی نابڕرێ، چونکە شوبهەی ئیستیحقاقی نەفەقەی لە مالّی مێردەکەیدا هەیە، چونکە ژێواری ژن لەسەر مێردە، بەلاّم بە پێچەوانەوە ئەگەر مێرد سامانی ژنی خۆی بدزێ لە سەری دەستی دەبڕرێ، چونکە ژیواری پیاو لەسەر ژن نیە، کەواتە شوبهەو گومانی ملّکایەتیی لە شتە دزراوەکەدا نیە هەتا ببێ بە مەهانەی دەست نەبڕین چونکە هەموو گومانێکی خاوەنێتی مەهانەیە.

## ٣٢٥) سەرئەنجامی دزی:

### کاتێ دزی ساخ بۆوە دوو شت پێویست دەبێ:

**یەکەم:** گەڕانەوەی مالّە دزراوەکە بۆ خاوەنی، ئەگەر خودی مالّەکە خۆی مابوو، دەنا وەجەلّەکەی، چونکە فڕی دزەکەی پێوە نیە لەبەر ئەوە دەبێ یا خودی مالّکە رەدکاتەوە یا بیبژێرێ.

**دووەم:** دەستبڕین پێویست دەبێ، بەپێی ئایەتی {وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا ➡} لەسەر ئەم شێوەیە: دەستی راستی دزەکە دەبڕرێ لە جمگەی مووچیدا کە یەکەم جمگەی دەستە، چونکە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوەیە، لەپاش خۆشی

هەرچوار جێنشینە باشەکانی ئاوایان کردووە. ئەو کابرای کە کراسەکەی سەفوانی دزی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانیدا کە لە مووچیدا دەستی ببڕێ. جا ئەگەر پاش ئەوە دزەکە جارێکی تریش دزیی کردەوە پێی چەپی دەبڕێ لە قولاپەیدا، چونکە فەرمانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوەیە، شافیعی فەرموودەیەکی لەم بارەیەوە گێڕاوەتەوە، ئەبو بەکرو عومەریش لە جاری دووەمدا قاچی چەپی دزیان دەبڕی، کەسیش سەرپێچی لە کارەکەیان نەکردووە،

بە قیاس لەسەر رێگرو جەردەیش، خوای گەورە دەفەرموێ:
{أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ - سورة المائدة - ٥/٣٣}
بۆیەیش پێ لە قولاپەدا دەبڕێ چونکە عومەر وای دەکرد. بەڵام مەرجی بڕینی قاچ ئەوەیە کە جێگەی دەستە بڕاوەکەی سارێژببێ‌و چاك ببێتەوە ئەوجا قاچی دەبڕێتەوە، تا یەك کەوتنی بڕینەکان تەشەنە نەکەن بۆ سەرتیاچوون، جا ئەگەر دووبارە دزیی کردەوە دەستی چەپی‌و لە جاری چوارەمدا قاچی راستی دەبڕێ، چونکە فەرمانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوەیە، ئەبو بەکریش ئاوای کرد لە کابرایەکی دەست‌و قاچ بڕاو. ئەگەر لە پاش بڕینی هەرچوار پەلی کابرا هەر دەس بەردار نەبوو لە دزی تەعزیرو تەمێ دەکرێ. چونکە دەست‌و پا بڕین لەسەر بڕیاری قورئان‌و سوننەت‌و یەکگرتن چەسپاون، کەواتە باسی شتی تر نەکراوە، لە هەمان کاتا دزی تاوانە، گشت تاوانێ کە تۆڵەی تایبەتی نەبێ خاوەنەکەی تەمێ دەکرێ لەسەری. قیلێ دەڵێ: ئەگەر لەوەدوا دزیی کردەوە دەکوژرێ، چونکە لە فەرموودەیەکی ئەبو داوودو نەسائیدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای

{لەسەربێ} تا چوار جار فەرمانی کرد بە بڕینی دەستو پای دز، وە لە جاری پێنجەما فەرمووی: بیکوژن. بەڵام فەرمایشتی یەکەم دورستی تەواوە، وەڵامی ئەم فەرموودەیە ئاوا دراوەتەوە: کە ئەم حەدیثە مونکەرە. زوهری دەفەرموێ: کوشتن هەڵوەشاوەتەوە، چونکە دزێکیان برد بۆ دادگایی بۆ لای پێغەمبەر بۆ جاری پێنجەم دزی کردبوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیکوشت! شافیعیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: حوکمی کوشتنی دز بەبێ ڕاجیایی لەناو زاناکانا هەڵوەشاوەتەوە دیسان لەبەر ئەم بەڵگەیەی تریش ناکوژرێ چونکە هەموو تاوانێ کە ببێ بەهۆی تۆڵەیێ دووبارە بوونەوەی بۆ چەند جارێ نابێ بەهۆی پێویستبوونی کوشتنی تاوانبار.

## ٣٣٦) باسی تۆڵەی ڕێگرو جەردە (قطاع الطرق):

بۆیەوا ناو نراون چونکە ڕێ لە خەڵك دەبەستنو مەردم ناتوانن لە ترسی ئەوان بە ئاسایی هاموشۆ بکەن. لە دەقی قورئاندا تۆڵەی ڕێگرو جەردە دیاری کراوە، دەفەرموێ: {إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ – سورة المائدة – ٥-٣٣} واتە: سزاو تۆڵەیێ کە بەپێی تاوانی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ خودادا شەڕ دەکەنو بە گژی پێغەمبەری خودادا دەچنو ئاژاوە دەگێڕن لەناو وڵاتاو ئاشوبو خراپە بەرپا دەکەن لەسەر ڕووی زەوی، سزایەکی وا کە شایستەی ئەمانە بێ ئەوەیە کە بکوژرێنو بۆ

پەندو عیبرەتیش بکرێن بەدارا، یاخود دەستو پێیان ببڕێ لەسەر شێوەی راستو چەپ، یاخود رەهەنەوشاربەدەر بکرێنو بەبێ پشوودان لەم شارەوە بۆ ئەو شار دەربەدەر بکرێن).

## چەتەو جەردەو رێگر لە شەرعا چوار جۆرن:

**یەکەم**: ئەگەر ئەم رێگرانە ماڵیان لە خەڵك نەدەسەند، بەلاّم خەڵکیان دەکوشت ئەوە دەکوژرێنەوە.

**دووەم**: ئەگەر هەم خەڵکیان دەکوشتو هەم ماڵیان لە مەردوم دەسەند ئەوە دەکوژرێنو لە پاش شۆردنو کفنکردن نوێژیان لەسەر دەکرێو لەپاش ئەوە تا سێ رۆژ بەدارێکی پاندا هەڵدەواسرێن، ئەوسا دەهێنرێنە خوارەوەو دەنێژرێن.

**سێیەم**: ئەگەر هەر ماڵیان لە مەردووم دەسەند، خەڵکیان نەدەکوشت ئەوە دەستی راستو پێی چەپیان دەبڕرێ، بە مەرجێ ئەو ماڵە سەندراوە بگاتە ئەندازەی حەددی دزی کە دەکاتە چارەکە دینارێکی زێڕی سکەلێدراو.

**چوارەم**: ئەگەر هەر خەڵکیان دەتۆقان، نەماڵیانم لە کەس دەسەندو نە کەسیان دەکوشت ئەوە بەندو حەپس دەکرێنو بەهۆی بەندکردنو شتی تری واوە تەعزیرو تەمێ دەکرێن، وەك شار بەدەرکردنو رەهەنە کردن. مەرج نیە کە جەردەو رێگر نێرینەبن، یا کۆمەڵ بن، یا هەر لە دەشتو دەر جەردەیی بکەن، بەڵکوو ئەگەر تاقە کەسێکیش بێ، لەناو ئاوەدانیشدا تاوانەکانی ئەنجام بدا دادەنرێ بە

ڕێگر، بە مەرجێ ئەوەنـدە بـەهێز بـێ بتوانـێ بـە تـەنیا زاڵ بـێ بەسـەر خەڵكداو بە زۆر دەسدرێژی لەسەرو ماڵیان بکاو بە ئاشكرا ئـەوە ئـەنجام بدا. ئەم جۆرە چـەتەو ڕێگرانـە دروست نیـە بـەریان بۆ بـەرەڵا بكرێ، هەتا بەكەیفی خۆیان لە وڵاتا تەراتێن بكەنو ئاژاوە بەرپابكەن، بـەڵكوو پێویستە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان بەزوویی تەمێ خواردوویـان بكـا، هـەتا دروسـت نیـە لێیـان خـۆش بـێو عافواتیـان بـۆ دەربكـات، دەی نەفرەتو لەعنەتی خـودا لەسـەر هـەموو ستەمكارو زۆرداری، كـەڕێ بـە خـەڵك دەگـرنو ئـاژاوە بـەرپا دەكـەنو ئاسـایش لـە بەنـدەكانی خـودا هەراسـان دەكـەنو ڕێگـە بـە پیـادەكردنی شـەریعەتی خـودا نـادەن (بـە تایبەتی ئەمانەی ناو كوردستان — وەرگێڕ).

وەلێ ئەوەنـدە هەیـە هـەر سـزایەك بكەوێتـە سـەر ڕێگـر بـەهۆی ڕێگرییـەوە، ئـەوە ئەگـەر لـە پـێش ئـەوەدا كـە پێشەوا دەسـتی بەسـەردا بگرێ، بە ئارەزووی خۆی تەوبەی كردو وازی لە ڕێگریی هێنا، ئـیتر ئـەو سزایەی لەسـەر لادەچـێ، بـەڵام ئـەوەی مـافی تایبـەتی خـەڵك بـێ، وەك كوشـتنی بـێ تـاوانو خـواردنی مـاڵی خـەڵك بـە نـاڕەوا، ئـەوە بـە تەوبـە لاناچـێ، خـواه لـە پـێش تەوبـەدا یـا لـە پاش تەوبـە بگیرێ. جا ئەگـەر فەرماندار لە پێش تەوبەكردندا دەستی لێی گیربوو، ئەوە ئـەو تۆڵەیـەی كـە خـوا بـۆی بڕیوەتـەوە لـە سـەری جێبـەجێ دەكرێ، تەنانـەت ئەگـەر لەپاش دەسگیركردنی تەوبە بكا تۆڵەی جەردەیی لە كۆڵ ناكەوێ، بەپێی چەمكو مەفهوومی ئەم ئایەتە: {إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ — ٣٤/٥} . تەوبـە كـای پـێش دەسـت لێ گیربـوون، ئەگـەر خـەڵكی كـشتبوو، ئـەوە مـەرج نیـە كـە

بکوژرێتەوە، بەڵکوو هەقداری کوژراوەکە بۆی هەیە کە لە جیاتی تۆڵە بیکوژێتەوە، یا لێی خۆش بێ، وە ئەگەر خەڵکی کوشتبوو وە ماڵیشی لە خەڵك سەندبوو، ئەوە هەڵواسینەکەو پێویستبووی کوشتنی لە کۆڵ دەکەوێ، چونکە ئەم دووە مافی خوان بە تەوبەی پێش دەسگیرکردن لەکۆڵ دەکەون بەڵام کوشتنەوەو دانەوەی ماڵەکەی لەسەر دەمێنێ، خاوەن خوێن دەتوانێ بیکوژێتەوە یا لێی خۆشبێ، خاوەن ماڵیش بۆی هەیە یا ماڵەکەی پی دابین بکا یا لێی خۆش بێ. وە ئەگەر بەس ماڵیان لە خەڵك سەندبوو ئەوە دەت بڕین‌و قاچ بڕینەکەیان لەکۆڵ دەگەوێ، چونکە ئەمە حەددەو مافی خودایە، مافی خودایش بە تەوبەی پێش دەسگیربوون لە کۆڵ دەکەوێ، بەڵام ماڵەکەیان لێ دەسەنرێتەوە، چونکە ماڵ‌و کوشتنەوە (قیصاص) هەقی ئادەمیزادن، هەموو هەقێکی ئادەمێزادیش بە تەوبە لاناچێ. بەڵێ حەددی داوێنپیسی‌و دزی‌و مەی خواردنەوە، لەپاش چەسپ (ثابت) بوونی هەرگیز لاناچێ، چونکە ئەو بەڵگانەی ئەم حەدانەیان پێ ساغ دەبێتەوە بەرەهایین‌و فەرقی رێگرو کەسانی تر ناکەن (مامۆستا عەبدولکەریم – خودای گەورە دەست بە تەمەنی پیرۆزی بگرێ‌و سەد هەزار رەحمەت لە خۆی‌و باوك‌و کەسوکارو مردوو زیندووی ئەویش‌و ئێمەیش) لە شەریعەتی ئیسلامدا (ب/٤ل/١٥٢) دەفەرموێ: لە توحفەدا دەفەرموێ: هەموو ئەم فەرمووددانە بە نیسبەت ظاهیری شەرعەوەن، ئەگینا لە بەینی ئینسان خۆی‌و خوادا هەرکاتێ تەوبەی راستەقینەی کرد هەموو حەددێکی لەسەر لائەچێ – وەرگێر).

## ٣٢٧) باسی هەڵمەتهێنان (الصیال):

**هەڵمەت**: پەلامارو تاودانەسەر کەسێکی تر. لە شەرعا ئەوەیە: کەسێ بە ناڕەوا پەلاماری کەسێ بدا. لەپێش ئەوەدا کە یەکگرتن لەسەر هەڵمەتهێنان دابمەزرێ سەر بەڵگەی ئەم باسە ئەم ئایەتەیە: {فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ – سورة البقرة – ١٩٤/٢} واتە: دەی هەرکەسێ دەسدرێژی لێکردن ئێوەیش بەقەد دەس درێژییەکەی ئەو دەسدرێژی لێ بکەنەوە. لەگەڵ ئەم فەرموودەیدا (درووده خوای لەسەربێ) یاریدەی برای خۆت بدە، لەسەر هەق بێ، یا لەسەر ناهەق بێ! پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لەسەر هەق بێ ئەوا جێگەی خۆیەتی یارمەتی دەدەم، بەڵام پێم بفەرموو ئەگەر لەسەر ناهەق بێ چۆن چۆنی یارمەتی بدەم؟ فەرمووی: مەهێڵە ئەو ناهەقییە بکا ئەوە باشترین یارمەتییە بۆی! (بوخاری) دەی هەڵمەتهێنەر ناهەقیکارە، کەواتە یامەتیدانی پێویستە، یارمەتیەکەیشی بەپێی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە نەهێڵی ئەو ناهەقییە بکا.

دەی ئەگەر کەسێ بە ناڕەوا هەڵمەتی بردە سەر موسوڵمانێ‌و ویستی بیکوژێ ئەوە دورستە بۆ ئەو هەڵمەت بۆهێنراوە کە بەرگری لەخۆی بکا، بەڵام تا ئەو بەرگرییە بە شێوەیەکی سووک‌و بێ زیان دەست بدا بۆی دروست نیە بە شێوەیەکی گران‌و زیانبەخش ئەنجام بدرێ، بۆ نموونە ئەگەر بەڕاکردن، یا بەخۆ حەشاردان لە شوێنێکی قایمدا، یا بە پاڕاوە، یا بە هەڕەشەکردن، یا بە هاواربردن بۆ کەسێ، یا بەهەر شتێ تری بێ زیان چاری دەکرا نابێ دەستی لێ بوەشێنێ، چونکە

ئەو لە سەریەتی بەپێی ئەم ئایەتە خۆی رزگار بکا، کە دەفەرموێ: {ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ - سورة المؤمنون - ٣٤/٤١} واتە: تۆبە شێوەیەکی زۆر شیرینو جوان شتی خراپ لە ناوا مەهێڵە) قسەی دروستو فەرمایشتی ساغ ئەمەیە کە گوترا، بەلام هەیە دەڵێ: بۆی هەیە بەهەر شێوەیێ بۆی دەلوێ بەرگری لە خۆی بکا، بە مەرجێ پلە بە پلە بۆی بچێ، هەتا بە قسەو هاوار کردنو هاوار بردن بۆ کەسێ چارەسەری بۆ دەکرا، نابێ پەلاماری لێدان بدا هەتا بەلێدان بە دەست بەرگری بۆ دەکرا نابێ بە قەمچی لێی بدا، هەتا بە قەمچی بۆی دەکرا نابێ بەدار لێی بدا، هەتا بەزامارکردن بەرگری بۆ دەکرا نابێ ئەندامی ببڕێ، هەتا بە ئەندام برین چارەسەری هەڵمەتهێنەرەکەی بۆ دەکرا نابێ بیکوژێ، ئەگەر هەر چاری نەدەکرا مەگەر بە کوشتن نەبێ ئەوە بۆی هەیە کە بیکوژێ. ئیتر کابرای بکوژ نەکوشتنەوەی لەسەرە، نەخوێن، نە کەفارەت، چونکە بەپێی ئەم ئایەتە هیچ بەرپرسیارییەکی لەسەر نیە، کە دەفەرموێ: {وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ، إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ - سورة الشورى - ٤٢/٢٤} واتە: هەر کەسێ کە هەقی خۆی بسێنێ پاش ئەوە ستەمی لێکرا ئەوە جێگەی خۆیەتی، شتی وا لۆمەو سەرزەنشتی لەسەر نیە، رێگەی سەرزەنشت لەسەر ئەوانەیە کە ستەمو ناهەقی لە مەردوم دەکەن... تا کۆتایی ئایەت. لەبەر ئەوەیش هەڵمەتهێنەر ستەمکارە، ستەمکاریش دەسدرێژیکەرە، شەڕکردن لەگەڵ دەسدرێژیکارا راوەیە، کەسێکیش شەڕکردن لە گەڵیدا رەوابێ زیانی سەرو ماڵی بە فیڕۆ دەڕواو دەستەبەر ناکرێ.

## ٣٢٨) بڕیاری بەرگیکردن لە گیانی خۆی:

رای زاناکان لـه بـارەی بـەرگریکردن لـە سـەرو گیـان جیـا جیایـە، ئەگـەر هەڵمەتـدەر (صـائل) موسـوڵمانی ئەرکـدار (مکلـف) بـوو، قێڵێ دەڵێ: پێویستە بەربەرەکانی بکرێ، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ - سورة البقرة ١٩٥/٢} (واتـە: بەڵام بە دەستی خۆتـان خۆتـان مەهاوێنـە نـاو فـەتارەتو فەوتانـەوە) . هەر وەك پێویستە لەسەر ناچار، بەخواردن لە مردار گیانی خۆی رزگار بکا لە مردن، پەلاماردراویش لە سـەریەتی گیـانی خۆی بپارێزێ. بـەڵام فەرمایشتی سەنگین (راجح) ئەوەیـە بەربـەرەکانی فـەرز نییـە، چـونکە خۆشەویـست {درودی خوای لەسەربێ} کاتـێ باسـی ئـەو ئاژاوانـەی کـرد کـەوان بەرێوە، حوذەیفـە {رەزای خوای لێبێ} فـەرمووی: قوربـان! ئەگـەر فریـای ئـەو رۆژگارە کەوتم فەرمانت بە چییە کە بیکـەم؟ فـەرمووی: لـە مـاڵی خۆتـا ئۆقرە بگرەو سەری خـۆت کـز بکـە. حـوذەیفـە فـەرمووی: قوربان! ئـەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر ئاژاوە گێڕ هەڵی کوتایـە سـەرمو خۆی کرد بـە کـونی ژوورا بـۆم، فـەرمانت چییە کـە بیکـەم؟ فـەرمووی: کاتێ بریقەی شمشێری سەرسەرت دڵی راچەنانی رووی خـۆت داپۆشـەو خۆت بدەرە دەست قەدەر با بت کوژێ، چونکە ببی بەو بەندەیەی خـودا کە بە ناهەق دەیکوژن باشترە، نەوەك بەو بەندەیەی خودا کـە بـا نـاڕەوا خوێنی مەردووم دەرێژێ. لە هەندێ گفتـی ئـەم فەرموودەیـەدا ئـاوا بـە: تۆش وەکوو کوڕە باشەکەی ئادەم بکە کـە براکـەی پێـی گـوت: بـە خـودا دەتکوژم، ئـەویش بـەم ئایەتـە وەڵامـی دایـەوە {لَـئِن بَسَطتَ إِلَـيَّ يَـدَكَ

لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ – سورة المائدة – ٢٨/٥} بەخودا من شتی وا ناكەم تۆ برای نی، چۆن برا برا دەكوژێ؟ تویش من بكوژی من دەستم ناچێتە تۆ كە بتكوژم، چونكە من لە خودای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم.

ئەو قسەیە راستو دروستە كە دەفەرمویٚ: كاتیٚ ئیمامی عوسمان گەمارۆ درابوو، چوار سەد بەندەو خولامی هەبوو، لە دەوری بوون ویستیان بە شەڕو بەزەبری چەك بەرگری لە شەهید بوونی عوسمان بكەن، عوسمان نەیهێشتنو رێگەی ئەوەی پیٚ نەدان، بەڵكوو پێی فەرموون: هەر كەسیٚ چەكەكەی فڕیٚ بدا ئازادبیٚ. حەزرەتیش لە فەرموودەیەكا دەفەرمویٚ: ئاژاوە گەلێكی وا سەختو گەورەو تاریك لە پێش سەرهەڵدانی قیامەتدا بەرپادەبن، لەبەر فەرتەنەو ئاشووب جیهان وەك تاریكە شەوی ئەنگوستە چاوی لیٚدیٚ، مرۆڤ واتە: رێگەی راست هەڵە دەكا بە هیچ لایەكا سەر دەرناكا، دەبیٚ بە تێكەو لێكەیەكی وا پیاو سەر لە بەیانی موسوڵمانە، سەر لە ئێواریٚ بەهۆی ئاژاوەوە بێبڕوا دەبیٚ، سەر لە ئێواریٚ موسوڵمانە بۆ سبەینیٚ بەیانی بێبڕوا دەبیٚ، دانیشتوو لە كاتی بەرپابوونی ئەم لێشاوی ئاژاوەدا باشترە لەو كەسە كە لەو كاتەدا بە پێوە راوەستاوە، راوەستاو لە رێبوار باشترە، رێبوار لە هەرا كردوو باشترە، چونكە هەتا ناتەوانتر بی، وەك حاڵی دانیشتوو لەچاو حاڵی راوەستاودا كە ئامادە ترە لە دانیشتوو بۆ پەلاماردان لە ئاژاوەكان دوور تر دەبی، جا لەو كەتەدا شەڕو شۆڕ مەكەن، بەڵكوو كەوانەكانتان بشكێننو ژێی تیرو كەوانەكانتان بپچڕێننو دەمی شمشێرەكانتان بە بەرد وردكەنو چەك فڕی دەن، تەنانەت ئەگەر ئاژاوە بۆتان هاتە

ماڵەوەو ئاژاوە گێڕ لە کونی ژوورەوەتان یەخەی پێ گرتن مەچن بە دەمیەوەو مەچن بە گژیدا، ئێوەیش لەم کاتەدا کا ئاژاوە گێڕ قەستی خوێنی سەسەرتان دەکا خۆتان بدەنە دەست قەدەرو چاو لە کوڕە باشەکەی ئادەم بکەن، کە براکەی هەڕەشەی کوشتنی لێ کرد، وە لە پێش ئەوەدا کە بیکوژێ پێی گوت: بەخودا تۆیش من بکوژی من تۆ ناکوژم، هابیلی شەهید بکەن بە سەرمەشق بۆ خۆتان نەك قابیلی پیاو کوژ! (ماجە/ داوود/ تیرمیذی. تیرمیذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، ئیبنو حەببانیش بە ساغی داناوە) شێخ تەقیەدینی ئیبنو لدەقیقولعید لە (الاقتراح)دا دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەپێی مەرجی شێخی بوخارییە کە بە مەرجی گرتووە بۆ حوکمکردن بە صیحەتی فەرموودەکانی صەحیحی بۆخاری. لەم شوێنەدا بۆیە بڕیاری ئەوە نادەین کە پەلامار دراو فەرزە لە سەری خۆی ڕزگار بکاو بەرگری لە سەرو گیانی خۆی بکا، وەك چۆن ناچار فەرزە لە سەری لەکاتی ناچاریدا بە خواردنی گۆشتی مردار خۆی ڕزگار بکا، چونکە کوشتن شەهید بوونە، بە پێچەوانەی مانگرتن لە خواردنی گۆشتی مردار چونکە شتی وا خۆکوشتنەو خۆ کوشتنیش حەرامە.

ئەگەر کەسێ هەڵمەتی هێنا بۆ سەر سامانی – گەرچی ئەو سامانە کەمیش بێ- ئەوە شەرع ڕێگەی دەدا کە بەرگری لە ماڵەکەی بکا، چونکە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ}: هەر کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە (شەیخان) چۆنێتی بوونی ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە لەسەر ئەم داوایە ئاوایە: بەپێی فەرموودەکە کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە، واتە: هەقی هەیە لەسەر ماڵەکەی شەڕ لەگەڵ پەلامار

دمر بکا، له حالّی وادا زۆر جار یا ئەو پەلامار دمر دەکوژرێ یا پەلامار دمر ئەو دەکوژێ وە ئەو لە سەریەتی کە بەرگری بکا هەتا شەهید بوون، دەی لەکاتی وادا خوێنی هەلّمەت هێنی پێ راوەیە، تەنانەت ئەگەر بیشی کوژێ دەستە بەری لەسەر نیە. بەلاّم بۆی هەیە بەرگری لە سامانی خۆی نەکا، چونکە لە هەموو کاتێکا بۆی هەیە کە مالّی خۆی رەواببینێ بۆ هەر کەسێ دەیەوێ. بەلّی ئەوەندە هەیە ئەگەر مالّەکە گیانلەبەر بوو کابرا دەیویست بیکوژێ ئەوە لە سەریەتی کە بەربەرەکانێی بکا، چونکە گیانو گیاندار رێزی خۆی هەیە، هەروەها ئەگەر پەلاماری نامووسیدا، وەك ئەوە ویستی دەست درێژی لە ژنی، یا کەنیزەکی، یا لە منالّی بکا، خوای بەکوشتن بێ یا بە دەستدرێژی لە نامووس، ئەوە لەم کاتانەدا پێویستە لە سەریکە دەستە ئەژنۆ دانەنیشێ، بەلکوو پێویستە لەسەری کە پەلامار بداو بەرگری بکا. دەگێرنەوە جارێ ژنێ دەچێ بۆ کۆلّە چیلکە، پیاوێکیش دوای دەکەوێو تەماعی تێ دەکا، ژنەکەیش پەلێکی تێ دەگرێو دەیکوژێ، داواکە دەبەنە خزمەت ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێبێ) کە لە حالّەکە حالّی دەبێ دەفەرموێ: ئەمە کوژراوی تیری غەیبی خودایە کە دێ بە هاواری زۆر لێکراوانەوە، بەو خودایە هەرگیز خوێنی ئەم ستەمکارە نادرێ! دەی کەسێ سەرپێچی لەم بڕیارەی عومەر نەکردووە لەبەر ئەوە بووە بە یەکگرتن (لێرەدا مامۆستا عاشوور ئاوا ئەم رووداوە راگوێز دەکا.. **ولما روی ان امراة خرجت تحتطب**.. هتد، بەلاّم لە کفایەکەدا دەفەرموێ: **وقد روی ان امراة**.. تاد. من بەپێی کفایەکە تەرجەمەم کرد، چونکە

ئەمە بەڵگەی دووەم نیە بۆ مەبەستەکە، بەڵکوو سەربەڵگەیەتی فتأمل – وەرگێڕ).

باشە ئایا مرۆڤ بۆی هەیە کە بەرگی لە کەسانی تریش بکا، با بێگانەیش بن و لە کەسوکاری خۆی نەبن؟ لەم شوێنەدا دوو فەرمایشت هەیە، هەرە دروستەکەیان ئەوەیە کە دەفەرموێ: بەرگری لە بیانی حوکمی بەرگری لە خودی خۆی هەیە، لە مێشدا راجیاییەکەی پێشەوە هەیە. ئەمە قەسەمان لەوەیە کە پەلاماردەر موسوڵمان بێ، بەڵام ئەگەر پەلاماردەر بێبڕوا بوو ئەوە بەرگری فەرزە، هەروا ئەگەر پەلاماردەر ولاخ و دڕندەو چارپا بوو، بە مەرجێ گومانی بەهێزی نەبێ لەوەدا کە دەرەقەتی ئەو دەعبایە نایەت و مەترسی لە گیانی خۆی بکا.

## ٣٢٩) دەستەبەربوونی زیانی چوارپێ:

ئەگەر کەسێ ولاخێکی پێ بێ، ئەو ولاخە هەر زیانێکی گیانی یا سامانی بدا، ئەو کەسە دەستەبەرە، خواە بەشەو ئەو زیانە بدا یا بە رۆژ، وە خواە ئەو کەسە لێخوڕی بێ، یا جڵەوکێشی بێ، یا سواری سەرپشتی بێ، چونکە ولاخەکە لە هەموو ئەم کاتانەدا وا لە ژێر دەستی ئەودا، کەواتە لە سەریەتی کە چاودێری بکا، وە خوای ئەو کەسەی کەوا لەگەڵ ولاخەکەدا خاوەنی بێ، یا رەنجبەری بێ، یا بەکرێی گرتبێ، یا خواستبێتی، یا زەوتی کردبێ، بۆ ئەم مەبەستە جیاوازی نیە، لە سەریەتی کە بیبژێرێ، چونکە دەست دەست دەناسێ. بەڵام ئەگەر کەسێ نەقیزەیەکی لەناکاو ژەند لە ولاخەکەوە، ولاخەکەیش لەقەیەکی وەشاند، وەزیانێکی لە شتێدا ئەوە تێوەژەنەکە دەستەبەر.

هەر ئاژەڵو وڵاخێ کە بە جڵەوو رەشمەو لغاو زەوت نـەکرێ نابـێ لەناو بازاڕدا کەس سواری بێ، جا ئەگەر کەسێ سواری بـوو، وە زیـانێکی دا ئـەوە سـوارەکە دەسـتەبەرە، چـونکە کەمتەرخـەمی کـردووە کـە لـە شـوێنی وادا سـواری وڵاخـی وا سـەر کـەش بـووە، چـوار پـای بـەرەڵایش ئەگەر زیان لە کشتوکاڵو شتی تـر بـدا، ئەگـەر شـتەکە لـە رۆژدا روویـدا ئەوە خاوەنەکەی دەستەبەر نیە، بەڵام ئەگەر بەشەو زیانەکـە بـدا ئـەوە دەستەبەرە، چونکە دەستوور وایە کە بە رۆژ پاسو ئاگاداری کشتوکاڵو بێستانو باخ لەسەر خاوەنیەتی، گەرچیش بەردانی وڵاخیش بۆ لەوەڕان کارێکی ئاساییە، بـەڵام دەسـتوور وایـە کـە بەشـەو بـێ چاودێری بـەرەڵا نـــەکرێن، دەنـــا خاوەنیـــان سووچـــدارە، چـــونکە بەرپرســـیارە لـــە چاودێریکردنیان لە شـەودا، کەواتـە هـەر زیانـێ بـدەن لەسـەر ئـەوە، بـە پێچەوانەی رۆژەوە کە چاودێریی شت لەسەر خاوەنیەتی.

وەك روونمان کردەوە لەم نموونەدا خاوەنی چوارپێکە دەستەبەرە، بەڵام بە مەرجێ خاوەن ماڵ کەمتەرخـەمی نـەکردبێ، وەك ئـەوە خـۆی شتەکە بۆ وڵاخەکە دەربخا، یا لەسەر چەقی رێگەو بان دایبنێ، لـە کـاتی وادا دەستـەبەری دانامەزرێ!

ئەگـەر کابرایـێ لـە ماڵـەوە سـەگێکی دڕی هـەبوو، یـا وڵاخێکـی چەمووشی جووتە وەشێنی هەبوو، کەسێ چوو بۆ مـاڵی کە کـابرا خـۆی رێگــەی پــێ دابــوو، وە حاڵەکــەی بــۆ روون نــەکردبۆوە، وە ســەگەکە پەلاماری داوگەستی، یا وڵاخەکە جووتەیەکی لێ دا، ئەوە کابـارای خـاوەن دەستبەرە، با کابرای میوان چلو ساغیش بێ، بـەڵام ئەگـەر کـابرا بـەبێ

ڕێگە پێدانی خاوەن ماڵ چوو بۆ ماڵی، یا خاوەن ماڵ تێی گەیاندبوو ئەوە دەستەبەری لە ئارادا نیە. چونکە خۆی هۆی ڕووداوەکەیە.

**بزانە:**

کە دەستەبەریی گیان لەسەر خوێنڕەسە لەکاتی وادا، کە لە عورفی شەرعا ناودارن بە (عاقلە).

## ٣٤٠) باسی ئەوانەی کە یاخی دەبن لە پێشەوای موسوڵمانان (البغاة - یاخییەکان):

مەبەست لە یاخی بوو کۆمەڵە موسوڵمانێکە گەورەیەکی فەرمانڕەوای دادپەروەریان هەبێ، بە زەبری هێزو توانای خۆیان لێی یاخی ببنو فەرمانی جێبەجێ نەکەنو بیانووە درۆینەیە بدۆزنەوە بۆ ئەم یاخی بوونەیان!

هەیە دەڵێ: مەرج نیە سەرۆکەکە دادپەروەر بێ. لە ڕاستیدا بەگێکردن (طاعەت)ی پێشەوا ئەرکێکی شەرعی سەرشانی گشت موسوڵمانێکە، گەرچی ستەمگەریش بێ، بە مەرجێ ئەو بە گێکردنە بە پێچەوانەی شەرعی خوای گەورەوە نەبێ، چونکە وەك زانراوە: فەرمانی بەندەی خودا بە مەرجێ جێبەجێ دەکرێ کە بە پێچەوانەی فەرمانی خودا نەبێ. بۆیە دەگوترێ یاخیبووان چونکە یاخیو سەرکەشو ستەمکارو ناهەقیکارنو زۆرو خراپییان لە رادە بەدەرە. سەر بەڵگەی ئەم باسە ئەم فەرمایشتەی خودایە: {وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ

اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ - سورة الحجرات - ٩/٤٩}
واتـه: هـەرکاتێ دوو تـاقم لـه موسـوڵمانان لـەناو خۆیانا بـوو بـه شـەڕو هەرایان، ناوبژییان بکەن‌و ڕێکیان بخەنەوە، جا ئەگـەر لایـەکیان بەهـەق ڕازی نـەبوو، ملـی نـەداو بـه برایـی‌و تـەبایی ڕازی نـەبوو، وە لەسـەر دەسدرێژییەکەی بەردەوام بوو، ئەوە بە هـەمووتان بـچن بـه گـژ لایـەنی شەڕ فرۆشا، هەتا مل کەچ دەکا بـۆ فـەرمانی خـواو لەگـەڵ بـرای خۆیـدا ئاشت دەبێتەوە.

## مەرجی جەنگکردن لەگەڵیان:

ئەگەر ئەم چەند مەرجە هاتنەدی لەسـەر پێشەوایە کە بچێ بـه گژیانا، بەپێی فەرمانی خوا کە دەفەرموێ: (فقاتلوا التـی تبغـی: واتـه: لە پێشەوە ڕۆیشت):

**یەکـەم**: دەبـێ کۆمـەڵەیـەکی بـەهێزی وابـن کـه خـاوەن شـەوکەت‌و دەسەڵات بن، بتـوانن بـه رابـەر پێـشەوا بوەسـتن‌و بەربـەرەکانێی لەگـەڵ بکەن، لـەناو خۆیانـدا سـەر گەورەیـەکیان هـەبێ لـه فـەرمانی دەرنـەچن، بەڵام ئەگەر چـەند کەسێکی تـاك‌و تـەرابوون، بـه ئاسـانی زەوت دەکـران ئەوە بەر ئەم جۆرە یاخی بوونە ناکەون!

**دووەم**: ئەوەیـه لـه ژێـر ڕکێفـی پێـشەوادا نـەمابن‌و لـه فـەرمانی دەرچووبن، وەك ئـەوە مـافی شـەرعی سـەریان نـەدەن، خـوای ئـەو مافـه

مافی سامانی بێ وەك زەكات، یا مافی تربێ وەك داری حەددو تۆڵەی پیاو كۆشتن!

**سێیەم:** ئەویە بیانوویەك (واتە: ئەویلێ) بدۆزنەوەو بیكەن بە مەهانەی دەرچوونیان لە فەرمانی پێشەوا، وەك ئەوە رووكاری ئایەتێ، یا حەدیثێ بكەن بە دەسكەلاو بە مەهانەی یاخیبوونەكەیان، وەك بیانووەكەی زەكات نەدەرەكانی كاتی ئەبو بەكری صەدیق (رەزای خوای گەورەی لێبێ) كە دەیانگوت: فەرمانمان پێكراوە كە زەكات بدەین بەكەسێ كە نزاو پاڕانەوەی ئەو بۆ ئێمە دەبێ بە مایەی ئارامو ئاسایش بۆمان، ئەو كەسەیش بەس پێغەمبەر بوو، هەتا لە ژیانا بوو زەكاتمان دەدایە. وە رووكاری ئەم ئایەتەیان دەكرد بە مەهانەی ئەم داوا پووچەڵەیان كە دەفەرموێ: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ - سورة التوبة - ٩/١٠٣} واتە: زەكاتی شەرعی لە ماڵەكانیان وەربگرە، وە بەهۆی ئەو زەكاتەوە دڵو دەروونیان لە گوناهو تاوان پاك دەكەیتەوە، هەروەك زەكاتەكە خۆی دەبێ بە مایەی بەرەكەتو نەشونامی ماڵەكەیان، وە نزای باشیشیان بۆ بكەو بۆیان بپاڕێرەنەوە، چونكە نزاو پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان دەبێ بە مایەی ئارامو ئاسایش بۆیان). وە دەیانگوت: نزاو پاڕانەوەی كەسانی تر جگە لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نابێ بەهۆی ئەم بەهرە گەورەیە بۆمان، كەواتە پێویست ناكا كە زەكاتی پێ بدەین. یا وەك بیانووی خەواریج كە لە فەرمانی سەروەرمان حەزرەتی عەلی دەرچووبوونو دەیانگوت: عەلی دەزانێ كە كێو كێ عوسمانیان كوشتووە، وە دەسەڵاتیشی هەیە بە سەریانا بەڵام بۆیە نایانكوژێتەوە چونكە خۆشی

کوشتنی عوسمانی پێ خۆشەو دەستی تێیدا هەیە. ئەمە لە کاتێکدا کە هەموو کەس دەزانێ هەق لەگەڵ ئیمامی عەلی بووە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} مژدەی شەهید بوونی بە عەممار داو پێی فەرموو: هاوار بۆ عەمار! دەستەی ناهەقیکار دەیکوژن، عەممار ئەوان بانگ دەکا بۆ سەر ڕێگەی هەق کە ڕێگەی بەهەشتە، کەچی ئەوان ئەو بانگ دەکەن بۆ سەر ڕێگەی چەوتی خۆیان کە ڕێگەی دۆزەخە. ئەوە بوو عەمماری کوڕی یاسر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەستەی صەففینی یاخی بانگ دەکرد بۆسەر فەرمانبەریی پێشەوا عەلی، کە ئەو طاعەتو فەرمانبەرییە دەبێ بەهۆی چوونە بەهەشت بۆیان، کەچی ئەوان بە پێچەوانەوە بەویان دەگوت کە لێی یاخی بێو پشتی بەردا، دیارە شتی وایش هۆی مسۆگەر بوونی ئاگری دۆزەخە، سەرەڕای ئەوە بەوەشەوە نەوەستان کوشتیشیان.

جا لەمەوە دەرکەوت کە ئەوان دەستەی ناهەقیکارن، کە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} عەممار دەکوژن، وە حەق لەگەڵ پێشەوا عەلییە، چونکە عەممار لە دەستەی عەلی بوو. گەورەمان موعاوییە کە توانای ئەوەی نەبوو کە ڕەخنەی لە ڕاستو دروستی ئەم فەرموودەیە بگرێ، چونکە فەرموودەیەکی نایابی زۆر ساغ بوو، یەکێ بوو لەو قسە بەرزو نیشانە گەورانە کە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بوون چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} چۆنی فەرموو بوو ڕێك ئاوا دەرچوو، بەڵێ موعاوییە کە توانای ئەوەی نەبوو ویستی بە جۆرێکی بێ هێزو لاواز تەئویلی بکا، ئەوە بوو دەیگوت: کێ هیناویەتی بۆ شەڕ ئەوە داویەتی بە کوشت!! ئیمامی عەلی کە ئەم قسەیەی موعاوییەی پێ گەیشتەوە فەرمووی: دەی ئەگەر وابێ پێغەمبەریش

{درودی خوای لەسەربێ} ئیمامی حەمزەی بە کوشت داوە، کە کافرەکان لە غەزای ئەوحوددا شەهیدیان کرد، چونکە ئەو هێنابووی بۆ ئەو غەزایە!

ئەم وەڵامەی عەلی وەڵامێکی دەمکوتکەرە. بەڵگەیەکی زۆر رۆشنە، رەخنەی لێ ناگیرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا دروست نیە کە تانەو تەشەر لە موعاوییە بدرێ، چونکە هاوڕێی پێغەمبەرو بووە، هاوڕێیانی پێغەمبەر {درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوڕێیانی بێ} هەموویان هەقانیو دادپەروەر بوون، لەبەر ئەوە دروست نیە تانەو توانجیان لێ بدرێ، لەبەر ئەم راو بۆچوونە جوانەیە کە خاوەنی کتێبی (الجوهره) بە شیعر دەفەرمووێ:

وأول التشاجر الذى ورد

ان خضت فيه، واجتنب داء الحسد

**واتە:**

گشت کێشەو بەرەو هەرای ناو یاران

پینەو پەڕۆکە بە تەئویلی جوان!

نەکەی وەک گاجووت، چەشنی لێنەزان

شەنو گێرەکەی بە جەنجەڕو چان

# ٣٤١) چۆنێتیی شەڕکردن لەگەڵ یاخیبوان؟

چۆنێتیی شەڕکردن لەگەڵ یاخیبوان رێك وەك چۆنێتیی شەڕکردن وایە لەگەڵ هەڵمەتهێنەر، کە لە زاراوی شەرعا ناوداره بە (صائل) وەك لە پێشەوە رابورد، چونکە مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کە ئەمانە بگەڕێنەوە بۆ ژێر رکێفی پێشەوای موسوڵمانان، هەتا ئاشتیو ئاسایش بەرقەرار بێ، مەردووم لە وەزەنیان رزگابن، دەنا مەبەست کوشتنو خوێنڕشتنی رووت نیە. جا هەتا بە گرتنو بەدیلکردن چار دەکران نابێ بکوژرێن، هەتا بە زامارکردن چار دەکران نابێ بە تەواوی زامار بکرێن هەتا بکوژرێن، بەڵام کەشەڕ گەرم بوو، وە بوو بە تێکرژانو شەڕی دەستەویەخە ئیتر کارەکە زەوت ناکرێو ئەم یاسایە پەیڕەوی ناکرێ. بەڵام دیلیان لە پاش دیلکردن ناکوژرێ، یا بریندراری پەککەوتوویان ناکوژرێ، ئەبو حەنیفە (رەزای خوای لێبێ) دەفەرموێ: دیلیان دەکوژرێو زامارِیشیان تا گیانی دەردەچێ زامارتر دەکرێ. بەڵگەی مەزهەبی ئێمە کە شافیعین ئەم فەرموودەی خۆشەویستە (دروودی خوای لەسەربێ) کە بە ئیبنو مەسعوودی فەرموو: ئەی کوڕی دایکی عەبد! حوکمی ئەوانەی کە لە نەتەوەی ئیسلامنو لە پێشەوای موسوڵمانان یاخی دەبن چییە؟ فەرمووی: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشی دەزانن. حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: حوکمیان ئەوەیە: ئەوەی پشتی هەڵکرد لەوانو بەرەی شەڕی چۆڵکرد نابێ بنیشنە سەریو بکەونە شوێنی، نە زامارِیشیان بە یەکجاری زامار دەکرێ هەتا دەمرێو نەدیلیان دەکوژرێ.

حوسەینی كوڕی عەلی {ڕەزای خوایان لێبێ} دەچێ بۆ لای مەڕوان، مەڕوان پێی دەڵێ: كەسم نەدیوە وەك باوكی تۆ ئاوا دلێرو مەرد بێ لە ڕۆژی ڕووداوی جەمەلدا هەر ئەوەندە كە زانی وا ئێمە هەڵهاتین‌و بەزین، ئیتر یەكسەر جارچی بە ناوی ئەوەوە جاڕیدا: شوێن هەڵهاتوو مەكەون‌و زامارریش مەكوژن! سەرەڕای ئەم دوو بەڵگەیەیش دەڵێین: چونكە مەبەست بنەبڕكردنی زیانیانە، نەك كوشتنیان لەبەر زاتی خوێنڕشتن!

شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} ئەم ئایەتە دەكا بە دەست كەلا كە دەفەرموێ: {فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ} چونكە شافیعی (فەیأ) لەم ئایەتەدا بە وازهێنان لە شەڕ ڕاڤە دەكا، وە بە گەڕانەوەیش بۆ ژێر فەرمانبەریی پێشەوا. وە دەیش فەرموێ: خودای گەورە فەرمانی بەوە كردووە پێمان كە بچین بە گژیاندا، نەك بیانكوژین، چونكە كوشتار جیایە لە كوشتن، (واتە: مەئمووڕو بیهییەكە قیتالە كە بابەكەی بۆ موشارەكەیەو دەبێ شەڕكردنەكە لە هەردوو سەرەوە بێ – وەرگێڕ) هەروەك دروست نیە دیل‌و زاماریان بكوژێن دروستیش نیە ماڵ‌و سامانیان بە تاڵان ببرێ، چونكە ئەوانیش هەر موسوڵمانن، ماڵی موسوڵمانیش بە موسوڵمان ڕەوا نیە، مەگەر بە ڕەزامەندیی خاوەنەكەی.

دەبێ پێشەوا لە پێش دەستكردن بە شەڕ، كەسێكی ئەمین‌و هۆشیارو زیرەك بنێری بۆ لایان، تا لێیان بپرسێ كە لەسەر چی عاجز بوون‌و بۆچی لە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان دەرچوون. جا ئەگەر

بیانوویەکیان هەبوو بیانوویان ببڕێو ئامۆژگاری باشیان بکا. لەم کارەدا ئیمامی عەلی دەکرێ بەسەر مەشق کە ئیبنو عەبباسی نارد بۆ لای خەڵکی نەهرەوان، کە ئەوە بوو ئاژەوا گێڕەکان قسەکانی ئیبنو عەبباس کاری تێکردن، هەندێکیان پەشیمان بوونەوەو هاتنەوە ریزی موسوڵمانان بەڵام بە داخەوە هەندێکی تریان لەسەر سەرکەشیی خۆیان بەردەوام بوون.

## ٣٤٢) باسی پاشگەزبوونەوە (ردە):

ریددە – یا پاشگەزبوونەوە – برێتییە لە پشتکردنە شتێو رووکردنە شتێ تر، ئەم ئایەتە بەم واتایە کە دەفەرموێ: {وَلاَ تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ – سورة المائدة – ٢١/٥} واتە: پاشەو پاش پاشگەز مەبنەوەو بەرەو دوا مەگەڕێنەوە). لە شەرعیشا ئەوەیە: موسوڵمانێ لە ئیسلام وەرگەڕێو بچێتەوە سەر بێبڕواییو پەیوەندیی موسوڵمانەتی ببچڕێ، پاشگەزبوونەوە چەند جۆرە: جاری وا هەیە، بە قسەو زمانە، جاری وا هەیە بە کردارە، جاری وا هەیە بە بیروبڕوایە. لەهەر یەك لەم سێ جۆرە لەم سێ جۆرە چەند نموونەیێ دەهێنینەوە تا ببن بە نموونە بۆ ئەوانی تریش، وەك گوتراوە: مشتێ نموونەی خەروارێکە.

نموونەی پاشگەزبوونەوە بە گوفتار وەك ئەوە کەسێ بە دوژمنی خۆی بڵێ: ئەگەر خوایشم بێ نایپەرستم، بەم قسەیە کافر دەبێ هەروەها ئەگەر بڵێ: ئەگەر ببێ بە پێغەمبەریش باوەڕی پێ ناهێنم! یا بڵێ: ئەم منداڵەمم لە خودا خۆشتر دەوێ، یا لە پێغەمبەر خۆشتر دەوێ،

یا ئەم ژنەمم لە خودا، یا لە پێغەمبەر خۆشتر دەوێ! یا نەخۆشی لە پاش چاکبوونەوە بڵێ: ئەوەی بەسەر من هات لەم نەخۆشییەدا ئەگەر ئەبوبەکرو عومەریشم بکوشتبایە شایانی ئەوە نەدەبووم چونکە قسەی وا دانەپاڵی زۆرو ستەمە بۆ لای خودای گەورە.

هەروەها ئەگەر لافی ئەوە لێبدا کە سرووشی بۆ دێ، یا لافی پێغەمبەرایەتیش لێ نەدا، یا لافی ئەوە لێ بدا کە دەچێتە ناو بەهەشتو لە میوەکەی دەخوات، یا بڵێ: من بە شەو دەست دەکەمە ملی پەری بەهەشت. قسەی وا بە یەککگرتن کفرە، هەروا ئەگەر جمێن بە پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکان بدا، یا سووکیی پێ بکا، ئەوەیش کفرو بێ بڕواییە، یەکێ لە شێوەکاری لاقرتێو گاڵتەکردن بە ئایین ئەوەیە کە ستەمبارەکان کاتێ زۆردارەکان ئازاریان دەدەن، پەنا دەبنە بەر سەروەری پێشینانو پاشینانو دەڵێن بیکە بە خاتری پێغەمبەر، وە کەسێ تریش باوەڕی پێی کرد هەر دوو لایان کافر دەبن، ئەگەر بەبێ تەئویل بەموسوڵمانێ بڵێ: ئەی کافر! بەو قسەیە کافر دەبێ، ئەگەر بێبڕوایێ ویستی موسوڵمان ببێ، وە داوای لە موسوڵمانێ کرد کە شایەتمانی پێ بڵێ، ئەویش پێی بڵێ لەسەر دینەکەی خۆت بمێنەرەوە، بەوە کافر دەبێ، هەروەها ئەگەر رێگەی کفر نیشانی موسوڵمانێ بدا، ئەگەر کافرێ ویستی موسوڵمان بێ، ئەویش پێی بڵێ جارێ بچۆ خۆت بشۆرە، بەمەش کافر دەبێ، چونکە لە ماوەی خۆشۆردنەکەدا بە کوفری ئەو کابرایە رازی بووە! دیارە کە رەزا بوون بە کفر کفرە. ئەگەر بە کەسێ بڵێن: نینۆکت بکە، یا بەر سمێڵت بقرتێنە چونکە سوننەتە، ئەویش بڵێ: جا با سوننەتیش بێ من شتی وا ناکەم، وە مەبستی لەم قسەیە بێزکردنەوە

بێ لە سوننەت، بەوە کافر دەبێ، ئەگەر خودا بەهۆی ماڵو منداڵەوە بەندەیەکی خۆی تاقی کردەوەو تووشی زیانێکی گیانی یا سامانیکرد، ئەویش بێزاری دەربڕیو بڵێ: خودا هەر بە من دەوێرێ، ماڵەکەمی بردەوە، منداڵەکەمی کوشت، یا بێزاریو رەخنەی تری لەم بابەتە دەرببڕێ، ئەوەیش کفرو بێبڕواییە، ئەگەر کابرایێ لە منداڵی خۆی دەدا، کەسێ پێی بڵێ: خۆ تۆ لای خۆت موسوڵمانی بۆ وا لەم منداڵە دەکەی؟ بڵێ: نەخەیر! من موسوڵمان نیم! کافر دەبێ. هەر لەم بابەتەیە جنێودان بە ئایینو بە گەلی ئیسلامو بە شەریعەتو بە مەزهەبێ لە چوار مەهەبەکان!.

نموونەی پاشگەزبوونەوە بە کردەوە وەك کوڕنووش بردن بۆ بتو رۆژو مانگ، وەك فڕێدانی قورئانی پیرۆز لەناو زبڵدانا وەك قوربانیو کوشتی سەبڕین بۆ بتو لاقرتیکردن بە ناوێ لە ناوەکانی خودای گەورە، یا گاڵتەکردن بە فەرمانو نەییکردنی خودا، یا بە بەڵێنو وادەو هەڕەشەی، یا بە خوێندنی قورئان، یا بە دەف لێدانەوە قورئان بخوێنێ، یا لەگەڵ ئاوازو مۆسیقادا، چونکە خودای مەزن دەفەرموێ: {قُلْ أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ – سورة التوبة – ٦٦/٩}.

هەروەها ئەگەر (زنار) ببەستێتە پشتی وەکوو راهیبی گاورەکان، یا صەلیب بکاتە ملی، یا کڵاوی تایبەتی ئاگر پەرستان لەسەر بکا، یا بە بەرگو نیشانەی گاورو جوولەکەوە هاموشۆی کڵێساو کنیشتەکانیان بکا.

نموونەی پاشگەزبوونەوە بە بیرو باوەڕ وەك ئەوە باوەڕی وابێ خودا نیە، یا باوەڕی بەو شتانەی کە لە ئایینا چەسپاون بۆ خودا نەبێ، یا باوەڕی بە شتێ هەبێ بۆ خودا کە ئایین حاشای لێ بکا، وەك ئەوە بڵێ: خودا بینا نیە، یا رەنگی هەیە، یا تێکەڵیو پەیوەندی ماددی لەگەڵ بوونەوەردا هەیە، یا شتێ بە یەکگرتنی زانایانی شەرع ناڕەوا بێ ئەو بڵێ رەوایە، یا نادروستت بێ ئەو بڵێ: دروستە، یا شتێ بە یەکگرتن دروست بێ ئەو بڵێ نادروستە، یا باوەڕی بە پێویستبوونی شتێ هەبێ کە خۆی لە ئاییندا پێویست نەبێ. ئەم جۆرە بیروباوەڕانە هەموویان بە بێبڕوایی دادەنرێت.

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خوای لێبێ) بڕیاری کافرکردنی گوڕۆی (الجسه)ی داوە، گوڕۆی (المعطله)یش وەك ئەوان وان، موجەسسیمە ئەوانەن کە دەڵێن: خودا ئەندامی هەیە وەك دەستو چاوو پێ، موعەططیلەیش ئەوانەن کە نەفی سیفات لە خودا دەکەنو دەڵێن: خودا بیناو زاناو داناو ژنەواو خاوەن خواست نیە، دەنا تەعەددودی قودەما روو دەدات، واتە: فرەیی دێرینەکان، دیارە تەنیا ئەم ئایەتە پیرۆزە بەسە بۆ پەرچدانەوەی قسەی ئەم دوو گوروهە سەر لێ شێواوانە کە دەفەرموێ: {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – سورة الشورى – ١١/٢٤} واتە:خودایەکی وایە لە وێنەی نیە، خودایەکی بیسەرو بینایە.

بزانە رەزا بە کفر کفرە، نیازکردنی کفر کفرە، هەتا ئەگەر دوو دڵ بوو لەوە کە کافر ببێ یانا دەسبەجێ کافر دەبێ، هەتا ئەگەر بڵێ: هەرکاتێ ئەو شتە رووبدا بێبڕوا دەبم ئەوە دەسبەجێ بێبڕوا دەبێ[*]!

## ٣٤٣) سزای پاشگەز (جزاء المرتد):

هەر کەسێ پاشگەز بوونەوەی ساغ بۆوە خوێنی فیڕۆیە چونکە ناشیرینترین شێوەی بێبڕوایی پەسەند کرووە، کە بڕیارەکەی زۆر سەختە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ - سورة البقرة ٢/٢١٧} واتە: هەرکەسێ لە ئێوە لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕێتەوەو تەوبەی لێ نەکا هەتا بە کافری دەمرێ ئەوە لە هەردوو جیهانا مایە پووچ دەبێ، هەموو چاکەکانی پووچ دەبێتەوە، ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەتدا ئاگر بە بالایان بڕاوە هەتا هەتایە). جا هەرکاتێ پاشگەزبوونەوەی کەسێ چەسپاو ساغ بۆوە، لەسەر قازییە دەس بەجێ داوای پەشیمان بوونەوەی لێبکا. جا ئەگەر کابرا پەشیمان بۆوە ئەوا باشە، دەنا دەکوژرێ، بەپێی ئەوەی کە عائیشە دەیگێڕێتەوە: لە رۆژی ئوحوددا ژنێ لە ئیسلام

---

[*] لە راستیدا عەوامو رەشەخەڵك لەم جۆرە شتانە نازانن، وە زۆر جار لەم جۆرە شتانە بەسەر دەمیانا دێت، بەبێ نیازو مەبەستی راستی خۆیان لەبەر ئەوە ئەم جۆرە شتە لە جۆری هەڕەشەیەو بەس.

- وەرگێڕ -

هەڵگەڕایەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانیدا کە داوای تەوبەی لێ بکرێ، ئەگەر پەشیمان بۆوە باشە دەنا دەکوژرێ. دیسان لەبەر ئەوەیش کە هۆی چاشکەزبوونەوە زۆرتر دەگەڕێتەوە بۆ گومانو دوودڵی، لەبەر ئەوە دروست نیە کە بکوژرێ بەر لەوە ئەو گومانەی روون بکرێتەوەو وەڵامی بدرێتەوەو ئەوجا داوای پەشیمانبوونەوەی لێ بکرێ! دەق وەك دەستەی جەنگ (ئەهلی حەرب) چونکە ئەمانە ناکوژرێن هەتا بانگەوازی ئیسلامیان پێ رادەگەیەنرێو ئیظهاری موعجیزە دەکرێ.

**بزانە:**

که موسوڵمان بە کردنی هیچ تاوانێ، جگە لە هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا، کافر نابێ، با ئەو تاوانە زۆر زۆر گەورەیش بێ، واتە: موسوڵمان بە کردنی گوناهی گەورە لە دائیرەی ئیمانو بازنەو جەغزی باوەڕ دەرناچێ! چونکە خوا دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء - سورة النساء - ٤/١١٦} واتە: لە راستیدا خودا لە یەك تاوان خۆش نابێ کە ئەوەیە کەسێ هاوڕێو هاوبەش بۆ خودا قەرار بدا، وە هەرچی لەوە بترازێ دەکەوێتە دەستی خواستی خودا، ئارەزوو بکا لێی خۆش دەبێ، ئارەزوو بکا تۆڵەی دەسێنێ). دیارە کە مەبەست لە تاوانێ کە لە خواری فرە خواییەوە بێ، هەموو گوناهێکە خواه گەورە بێ یا بچووك. پیاوی بەدکارو فاسیق ئەگەر بەبێ تەوبەیش بمرێ لە دۆزەخا هەتا هەتایە نامێنێتەوە، چونکە خودای گەورە لە حەدیثێکی قودسیدا دەفەرموێ: ئەوەی بە قەد تۆسقاڵێ باوەڕ بە خودا لەناو دڵیابووە لە دۆزەخ دەری بهێنن!.

# ٣٤٤) چۆن چۆنی داوای پەشیمان بوونەوە لە پاشگەز دەکری:

لەسەر فەرمایشتێ پاشگەز تاسێ رۆژ مۆڵەت دەدرێ، ئەگەر لەو ماوەیەدا پەشیمان بۆوە باشە، دەنا دەکوژرێ، چونکە جارێ لە شامەوە پیاوێ هاتە خزمەتی عومەر {رەزای خوای لێبێ} عومەر پێی فەرموو: ئەرێ هەواڵێکی باشت لەلا هەیە؟ گوتی: بەڵێ، پیاوێکی موسوڵمان کافر بوو بوو کوشتمان. عومەر فەرمووی: دەبوو سێ رۆژ لە پێشدا لە ماڵێکا حەپستان بکردایە، خودایە! من نەفەرمانی ئەوەم بەوان کردووەو نەرازیم لە سەری بووە، خودایە! من پاکانە بۆ خۆم لەلای تۆ دەکەم کە ئەو خوێنە دەستی منی تیادا نیە. بەلام فەرمایشتی ساغ ئەوەیە کە مۆڵەت نادرێ، بەڵکوو دەسبەجێ داوای تەوبەی لێ دەکرێ، دەق وەك فەرموودەکەی عائیشە کە لە پێشەوە رابوورد. لەبەر ئەوەیش چونکە ئەم کوشتنە حەددە، حەددیش دواناخرێ. هەر کاتێ پاشگەز تەوبەی کرد، تەوبەکەی لێ وەردەگیرێ، زاتی مەزن دەفەرموێ: {قُل لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ - سورة الأنفال- ٨/٤٨}

واتە: ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی من! بفەرموو بە کافران ئەگەر دەست بەرداری کفرببنو وازی لێ بێننو رێگەی ئیسلام بگرن ئەوە هەرچی رابوردو خودا لێی خۆش دەبێ) حەزرەتیش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خودا فەرمانی پێ کردووم جەنگ لەگەڵ ئەو خەڵکە بکەم هەتا دەڵێن: (لا الە الا الله) ئایەتو فەرموودەی تر لەم بابەتا نەزۆرە.

جا ئەگەر تەوبەی نەکرد دەکوژرێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەهۆی یەکێ لەم سێ شتەوە خوێنی موسوڵمان حەڵاڵ دەبێ... تا دوایی فەرموودەکە کە لوپێشەوە رابورد. کاتێ پاشگەر بە حەددی شەرعی کوژرا نە دەشۆررێ، نە کفن دەکرێ، نە نوێژی لەسەر دەکرێ، نە لە گورستانی موسوڵمانان دەنێژرێ، چونکە کافرەو کافریش ئەوەی رێزی ئایینی بێ نییەتی! چونکە خودایش دەفەرموێ:
{وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا - سورة التوبة - ٩/٨٤}
واتە: هەرگیز نوێژ لەسەر بێبڕوایان مەکەو لەسەر گۆڕەکەیان نزایان بۆ مەکەو شوێن تەرمیان مەکەوە).

## ٣٤٥) بە فیڕۆ چوونی کردەوەی پاشگەز:

پاشگەز بوونەوە کردەوە پووچ دەکاتەوە، چونکە خودا دەفەرموێ
{وَمَن يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ - سورة المائدة - ٥/٥}
واتە: وە هەرکەسێ باوەڕ نەکا بە بەرنامەی ئیسلام، بە ئەرکانی ئیمان ئەوە هەر کردەوەیەکی باش بکا مایە پووچ و بێ بایەخەو لە رۆژی دواییدا پاداشتی باشی نیە) وەڵێ گوتیارێ دەڵێ: بە مەرجێ کردەوەی باشی مایە پووچ دەبێ کە هەتا مردن بەردەوام بێ لەسەر پاشگەزبوونەوە، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ} تا کۆتایی ئایەت کە تۆزێ لەمەوبەر رابورد، دەی کەواتە ئەگەر لە پێش مردنیدا موسوڵمان بۆوە ئەوە بەس پاداشی کردەوەکەی پووچ دەبێتەوە بەڵام کردەوەکەی بە رووتی بەبێ پاداش بۆ حسێب

دەکرێ، واتە: لە سەری نیە کە کردەوەی پێش پاشگەزبوونەوەکە قەزا بکاتەوە، وە لە دوا رۆژدا داوای ئەوەی لێ ناکرێ. هەر کەسێکیش بە زۆری زۆرداریی گوتەی کفر بێ بە دەمیا بەوە کافر نابێ، چونکە خودا دەفەرموێ: {إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ – سورة النحل ١٠٦/١٦} واتە: بەلام کەسێ کە ناچار بکرێ، بە زۆر کفری پێ بکرێ، بە مەرجێ دڵی دامەزرابێ لەسەر ئیمان‌و باوەڕ، ئەوە تاوانی نیە).

## ٣٤٦) بڕیار (حکوم)ی نوێژنەکەر:

ئەگەر موسوڵمانێکی ئەرکدار (مکلف) وازی لە کردنی نوێژە فەرزەکان هێنا، ئەوە لەوێشدا مەهانەیەکی رەوای نەبوو، ئەوە بێبڕوا دەبێ، چونکە بڕوای بە ئەصڵێ لە ئەصوڵی دین نیە، کە پێویستبوونەکەی ئەوەندە روون‌و ئاشکرایە بەڵگە نەویستە، چونکە بڕوا نەبوون بە شتی واتە: وەك بڕوا نەبوون بەخودا وایە، بەدرۆخستنەوەی خواو پێغەمبەرە، دەی هەر کەسێ خوداو پێغەمبەر بە درۆ بخاتەوە کافر دەبێ‌و دەکوژرێ، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ: (هەر کەسێ ئایینی خۆی بگۆڕێ بیکوژن) (بوخاری) بڕیاری ئەم جۆرە نوێژنەکەرە رێك وەك بڕیاری پاشگەز وایە، وەك لە پێشەوە رابورد.

بەلام ئەگەر نەکردنەکەی لەبەر مەهانەی رەوا بوو، وەك نۆ موسوڵمانی، یا وەك پەروەردە بوونی ناو چۆڵەوانی ئەوە کافر نابێ، لەکاتی وادا فێری دەستوورو یاساکانی نوێژ دەکرێ، جا ئەگەر لە پاش ئەوە باوەڕی پێی نەبوو کافر دەبێ‌و حەددی لێ دەدرێ، بەلام ئەگەر

باوەڕی بە پێویستبوونی هەبوو بەڵام لە بەرسستیو کەمتەرخەمی نەیدەکرد، تا نوێژەکە دەچوو، قیلێ دەڵێ:کافر دەبێ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی {دروودی خوای لەسەربێ}: جیاوازی نێوانی بەندەی موسوڵمانو بەندەی بێبڕوا نوێژ نەکردنە (موسلیم) عەشاماتێکی زۆر کار بە رووکاری ئەم فەرموودەیە دەکەنو نوێژ نەکەر بە کافر دادەنێن، ئیمامی عەلیو عەبدوڵلای کوڕی موبارەكو ئیسحاقی کوڕی راهوەیە لەسەر ئەم رایەن، لە گێڕانەوەیەکا لە ئیمامی ئەحمەدەوە هەمان را پەسەند کراوە.

بەڵام فەرمایشتی ساغ ئەوەیە کە لەم حاڵەدا کافر نابێ، ئەمەیش رای جەماوەری زانایانی ئیسلامە، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء} دەی بەبێ گومان کە نوێژ نەکردنیش لەو گوناهانەن کە وان لە خوار فرە خواییەوە، کە بە تەعبیری قورئان پێیان دەگوترێ: (ما دون الشرك) کەواتە نوێژ نەکردن بەر کوفر ناکەوێ، دەنا بەر ئەم ئایەتە نەدەکوت کە دەفەرموێ: {وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء} شیركو کفری لێ دەرچێ، ئەگەر خودا مەیلی لەسەربێ لە هەموو گوناهێکی تر خۆش دەبێ، چونکە پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: خوێنی موسوڵمان هەموو کاتێ نارەوایە مەگەرلە یەکێ لەم سێ حاڵەدا: کافر بوونی پاش موسوڵمان بوونو داوێنپیسی دوا ژنهێنانو شووکردن بۆ مرۆڤی ئازادو کوشتنی کەسێ بە نارەوا.

دەی نوێژ نەکردن بەر هیچ یەکێ لەم سیانە ناکەوێ، کەوابوو نوێژ نەکەر کافر نەبێ، وە هەروا دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ} هەرکەسێ

شایەتی بدا کە بێجگە لە یەزدانی پاك خودای تر نیەو موحەممەد پێغەمبەری خودایەو عیسایش بەندەو پێغەمبەری خودایەو بە فەرموودەی خودا لە مرەیەم بووەو رەحمەتێکەو خودا ناردوویەتی، وە شایەتی بدا کە بەهەشت راستەو دۆزەخ راستە، هەر کەسێ ئەم شایەتییە بدا لەسەر ئەم شێوەیە خودا دەیخاتە بەهەشت، ئیتر کردەوەی هەرچی بێ. دەی ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیە کە شەیخان گێڕاویانەتەوە هەر کەسێ ئەم شایەتییە بدا لە دەستەی بەهەشت دەبێ، با نوێژ نەکەریش بێ، بەڵگەیەکی تریش هەیە لەسەر ئەوە کە نوێژنەکەر کافر نابێ ئەویش ئەمەیە: کفر بیروباوەڕە، بیروباوەڕیش وا لەناو دڵدا نوێژ کردەوەیە بە ئەندام ئەنجام دەدرێ، لە هەمان کاتدا بیروباوەڕی نوێژنەکەر بیروباوەڕێکی دروستی ساغە. ئەو فەرموودەیەیش کە ئەوانەی بڕیاری بێبڕوایی نوێژنەکەر دەدەن بەڵگە سازی پێ دەکەن دەبڕدرێ بەسەر ئەو نوێژنەکەرانەدا کە باوەڕیان بە فەرزبوونی نوێژ نیە. جا بەهەرحاڵ نوێژنەکەر داوای پەشیمان بوونەوەی لێ دەکرێ، چونکە حاڵی ئەم لە حاڵی پاشگەز بەدتر نیە، تەوبەکەیشی ئەوەیە کە نوێژەکەی بکا دەنا دەکوژرێ، چونکە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: فارمانم پێ کراوە کە جەنگ بەکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا تا شایەتمان دەێنن و بە زمان دەڵێن: هەر خودا خودایەو بەس هیچ خودایەکی تر نیە، موحەممەدیش پێغەمبەری خوادیە، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا نوێژ بە رێکوپێکی بکەن و زەکات بدەن، ئیتر ئەو کەسانەی ئاوا شایەتمان بهێنن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن ئەوا سەرو ماڵی خۆیان لەمن قەدەغە دەکەن و خوێن و ماڵ و ناموسیان لەمن و

لەکار بەدەستانی موسوڵمانان حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی بەپێی شەریعەتی ئیسلام، ئیتر حیساب و لێپرسینەوەی نیازی ناو دڵیان لەو دنیا لەسەر خودایە (شەیخان — رەزای خوایان لێبێ) . جا نوێژنەکەر هەر کاتی مرد دەشۆرری و کفن دەکری و نوێژی مردووی لەسەر دەکری لە گۆرستانی موسوڵمانان دەنێژری! چونکە وەك گوتمان: موسوڵمانە. گوتیاری دەبێژی: نە دەشۆرری و نە کفن دەکری و نە نوێژی لەسەر دەکری نە تەرمی بەری دەکری، گۆرەکەیشی کوێر دەکرێتەوە تا ببێ بە ریسوایی بۆی لەسەر ئەم کەمتەرخەمییەی! کە فەرزێکی وای پشت گوێ خستووە کە دروشمێکی دیاری و لەبەر چاوە لە ئایینی ئیسلامدا.

## ٣٤٧) تێکۆشان و غەزاکردن و خەباتگێران:

تێکۆشان لە عەرەبیدا ناوی جیهادە، جیهاد لە زمانی عەرەبدا لە جەهد وەرگیراوە، کە بە واتا زەحمەتکێشان و تێکۆشانە، یا لە جوهد وەرگیراوە کە بە واتا ئەرك و وزەیە، جا لەسەر ئەم بنەمایە موجاهید (واتە: تێکۆشەر) بۆیە پێی دەگوتری موجاهید، وە بە کوردی پێی دەگوتری: تێکۆشەر، چونکە تێکۆشەر بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی ئەوپەری وزەو توانا خەرج دەکا بۆ بەرگری لە شەری دوشمن، جیهاد (یا تێکۆشان، یا غەزاکردن) لە شەرعدا بریتییە لە شەرکردن لەگەڵ ناموسوڵمانان لە پێناوی سەرکەوتنی ئیسلام او بۆ بەرگری لەگەڵ و نیشتمان. ئەم زاراوە بە دوو واتا بەکاردێ: یەکەم غەزاکردن لەگەڵ دوژمن و غەزاکردن لەگەڵ نەفس و شەیتان، مەبەست لە نەفس لەم

جێگەیەدا ئەو هێزە خۆپەرستەیە، کە هەرکاتێ زاڵ بوو بەسەر دڵو دەروونی کەسێکا، دەیکا بە خۆپەرستو خوداو بەندەکانی خودا پشت گوێ دەخا[1]. تێکۆشان بە یەکگرتن دامەزراوە، بەڵگەی دامەزرانی ئەم ئایەتەیە: {كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ – سورة البقرة – ٢١٦/٢} واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەی پەیڕەوانی ئیسلام! جەنگکردن لە پێناوی ئیسلاما فەرز کراوە لە سەرتان، گەرچی شەڕو شۆڕو کوشتار گرانو ناخۆشە لەسەر شان، چونکە دەبێ بەهۆی زەحمەتو نارەحەتی زۆر) هەروەها ئەم ئایەتەیە: {وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً – سورة التوبة – ٣٦/٩} واتە: وەکوو چۆن بێبڕوکان بە شێوەی گشتی هەموویان شەڕ لەگەڵ ئێوە دەکەن ئێوەی موسوڵمانیش ئاوا هەمووتان بەگشتی شەڕ لە گەڵیانا بکەن) هەروەها ئەم ئایەتەی تریشە {وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ – سورة البقرة – ١٩١/٢} (واتە: لە هەرلایەك کافران بەر هەوێڵتان کەوتنو چنگتان لێیان گیربوو بوارەیان مەدەن هەر لەوێدا بیانکوژن) سەر بەڵگەیەکی تری دامەزراوی غەزاو تێکۆشان ئەم فەرموودەیەی حەزرەتە: فەرمانم پێ کراوە کە جەنگ بکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا تا شایەتمان دێننو دەڵێن... تا کۆتایی، کەمێ لەمەوپێش رابورد.

---

[1] وجاهد النفس بهذي الدار
ان كنت لا تطيق مس النار

**باسی گەورەیی خەباتگێڕان:**

خودای گەورە دەفەرموێ: {**لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى** - سورة النساء - ٤-٩٥} واتە: ئەو موسوڵمانانەی کە لە جێگەو رێگەی خۆیان دانیشتوونو بەبێ بەهانەیەکی رەوا تەرکی غەزایان کردووە یەکسان نین لەگەڵ ئەو موسوڵمانە تێکۆشەرانەدا کە لە رێگەی خودادا سەرگەرمی تێکۆشانو خەباتگێڕانن‌و بەسەرو بەماڵ خزمەتی ئایینی خودا دەکەن، خودا بەرەحمەتی خۆی پایەی ئەو خەباتگێڕانەی کە بەسەرو بەماڵ تێدەکۆشن بەرز کردۆتەوە بەسەر پلەی موسوڵمانە دانیشتوەکاندا بەهەردوو لایش خودا مژدەی بەهرەی چاکی لە بەهەشتا پێ بەخشیون).

**بڕیاری غەزاکردن:**

خوای گەورە دەفەرموێ: {**فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ** - سورة التوبة - ١٢٢/٩} واتە: دەبوو لەهەر هۆزێکتان دەستەیێ راپەرینایەو بچوونایە بۆ غەزاو دەستەیەکیشتان لە ماڵەوە بمانایەتەوە. دەی ئەوەتا بەپێی ئەم ئایەتە دەرکەوت کە غەزاکردن فەرزی کیفایەیە، نەك فەرزی عەین، لەبەر ئەوەیش ئەگەر غەزاکردن خود فەرز (فەرزی عەین) بێ ئیش‌و کاری خەڵك هەموو رادەوەستێ‌و وڵات وێران دەبێ).

بەڵام جاری وا دەبێ شتێ روودەدا بە هۆیەوە غەزا دەبێ بەخود فەرز، وەك ئەوە هۆزی کافر لە لایەکەوە سنووری وڵاتێکی ئیسلامی ببەزێنێ، یا لە نزیکیەوە هەوار هەڵ بدەن، لەکاتی وادا غەزا خود فەرزە لە سەرگشت نێرینەیێ کە دەستی چەك بگرێ لە خەڵکی ئەو وڵاتە، وە بەپێی توانای خۆیان فەرزە لە سەریان پێشگیری لە هێرشی بێبڕوایان بکەنو مەترسییان لە وڵات دوور بخەنەوە. تەنانەت ئەگەر یەك پیاو یا یەك ژنیان لە خۆمان دیلکردبوو، وە هێشتا نەیشهاتبوونە ناو وڵاتمانەوە، پێویستە لەسەرمان هەوڵی رزگارکردنی ئەو دیلەمان بدەین، ئەگەر ئومێدی رزگارکردنی هەبوو، چونکە رێزی موسوڵمان لە رێزی ولاتو نیشتمان گەورەترە، کەواتە ئەمیش وەك پێویستە رزگار بکرێ.

## لای کەمی پێویستبوونی غەزاکردن:

بە لایەنی کەمەوە هەموو ساڵێ غەزاکردن یەکجار فەرزە، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوا ئەوە کە فەرمانی پێ کرا بە غەزاکردن، هیچ ساڵێ وازی لە غەزاکردن نەهێناوە هەتا ساڵی لە دنیا دەرچوونی، یەکەم غەزای حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) لە دوای کۆچی بۆ مەدینە غەزای (ودان) بوو، بەدر لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو، ئوحود لە سێیەمدا، زاتوریقاع لە چوارەمدا، خەندەق لە پێنجەمدا، حودەیبییە لە شەشەم دا، فەتحی قەڵای خەیبەر لە حەوتەمدا، فەتحی مەککە لە هەشتەمدا، غەزای تەبووك لە نۆیەمدا. دەی پەیڕەویکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرزە، لەبەر ئەوەیش چونکە خوای پاكو پیرۆز دەفەرموێ: ﴿أَوَلاَ يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ –

سورة التوبة – ١٢٦/٩} واتـه: سـەیرە! ئـەوە بۆچـی ئەمانـه لـه بەسەرهاتی دڵتەزێنی خۆیان پەند وەرناگرن، ئەوەتا بـه بەرچاویانەوە ئەوەتی پێغەمبەری خودا تەشریفی هاتووە بۆ مەدینە هەر ساڵێ جارێ یـا دوو جـار گـیرۆدە دەبـن و تووشـی کارەسـاتی نـاخۆش دەبـن، کەچـی ئەوەندە بێعارن عیبرەت ناگرن – ئیمامی موجدهید {ڕەحمەت و ڕەزای خودای گەورەی لێبێ} دەفەرموێ: سەبارەت بـه غـەزاکردن هاتۆتـه خـوارەوە. لەبەر ئـەوەیش چـونکه غـەزا لـەو فەرزانەیـه کـه دووبـارە دەبنـەوە، دەی لای کەمیش بۆ دووبارە بوونەوەی فەرزیەك ساڵە، وەك ڕۆژوو، وەك زەکات. ئەوەندە هەیە هەرکاتێ دووبارە بوونـەوەی زیاتر لەیـەك جار پێویست بوو له یەك ساڵا، ئـەوە پێویـست دەبێ، چـونکه غـەزا فـەرزی کیفایەیـه، لەبەر ئەوە بەپێی پێداویستی ئەندازەی بۆ دیاری دەکرێ.

## ٣٤٨) مەرجەکانی پێویستبوونی غەزاکردن:

حەوت مەرجی هەیە: ئیسلام و ڕەسدەبوون و هۆشی ساغ و ئـازادی و نێرینەیی و لەشساغی و توانای شەڕکردن. واتـه: هـەر کەسێ ئـەم حـەوت مـەرجەی تیادا هاتەجێ، زاناکان بەیەك دەنگ دەفەرمون: ئەو کەسە لەو دەستەیە کە لەکاتی پێویستدا غەزاکردنی لەسەر فەرزە.

بێبڕوا بۆیە غەزای لەسەر نیە، چونکە خودای گەورە رووی قسەی له موسوڵمانانە، نـەك لـه بێبڕوایـان، کاتـێ دەفـەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ – سورة التوبة ١٢٣/٩} واتـه: ئـەی گـەلی موسـوڵمان! جـەنگ بکـەن لەگـەڵ ئـەو ناموسـوڵمانانەدا کەوان له نـزیکتانـەوەو سنووریان وا بـه سـنوورتانەوە، هـەتا چاوترسێن

ببن‌و سام‌و ترسی ئێوه بچێته ناو دڵیانه‌وه‌و زه‌برو زه‌نگ‌و دلێریتان به چاوی خۆیان ببینن، هه‌تا ته‌مێ خوار ببن‌و چاوی ته‌ماعتان تێ نه‌برن). له‌به‌ر ئه‌وه‌یش چونکه بێبڕوا که سه‌رانه ده‌دا بۆ ئه‌وه‌یه که ئێمه پاسی ئه‌و بکه‌ین نه‌ك ئه‌و پاسی ئێمه بکا. منداڵیش بۆیه غه‌زای له‌سه‌ر نیه چونکه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: {لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ – سورة التوبة – ٩١/٩} (واته: که‌سانی لاوازو بێ هێزو نه‌خۆش‌و هه‌ژاری نه‌دارا که ماڵیان نیه هه‌تا به‌ختی بکه‌ن له ڕێگه‌ی خودادا، نه‌گله‌یی نه تاوان له‌سه‌ر ئه‌مانه نیه له نه‌کردنی غه‌زادا، به مه‌رجێ دڵسۆزیی خۆیان بۆ خواو پێغه‌مبه‌ر ده‌ربڕن له‌کاتی خۆیا) دیاره که منداڵان به‌ر لاوازو بێ هێزان ده‌که‌ون. دیسان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که پێغه‌مبه‌ر {درودی خوای له‌سه‌ربێ} له ڕۆژی غه‌زای به‌دردا ئه‌م زاتانه‌ی به‌بچووك دانا، له‌به‌ر ئه‌وه ڕێگه‌ی چوون بۆ غه‌زای پێ نه‌دان، واته: زه‌یدی کوڕی ثابیت‌و رافیعی کوڕی خه‌دیج‌و به‌رای کوڕی عازیب‌و ئیبنو عومه‌ر {ره‌زای خودا له هه‌موویان بێ} له صه‌حیحه‌یندا ده‌فه‌رموێ: ئیبنو عومه‌ر {ره‌زای خوایان لێبێ} ده‌فه‌رموێ: ڕۆژی غه‌زای ئوحود چوارده ساڵ بووم، ویستم به‌شداری ئه‌و جه‌نگه بکه‌م، پێغه‌مبه‌ر {درودی خوای له‌سه‌ربێ} ته‌ماشای کردوم‌و هه‌ڵی سه‌نگاندم تا بزانێ به‌رگه‌ی شه‌ڕ ده‌گرم یانا، به‌ڵام له‌به‌ر بچووکی ته‌مه‌نم به‌گه‌ندی نه‌کردم، وه‌ڵێ ڕۆژی غه‌زای خه‌نده‌ق پازده ساڵ بووم، پێغه‌مبه‌ر بۆ هه‌مان مه‌به‌ست سه‌رنجی دام، ئه‌مجاره‌یان ڕێگه‌ی غه‌زاکردن پێدام). شێتیش بۆیه غه‌زای له‌سه‌ر نیه چونکه ئه‌رکدار (مکلف) نیه. بۆیه‌یش ئازادی مه‌رجه چونکه کۆیله غه‌زای له‌سه‌ر نیه، چونکه زاتی مه‌زن ده‌فه‌رموێ: {وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ – سورة التوبة –

٤١/٩} واته: بەسەرو بەماڵ، بە سامانو بە گیان خەبات بگێڕن – دەی ئاشکرایە کە کۆیلە ماڵی نیە، لەبەر ئەوە بەر ئەم ئایەتە دەکەوێ: {وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ}.

جابیریش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: جاران کاتێ یەکێ دەهاتە خزمەتی حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} کە پەیمانی بداتێ، ئەگەر نەیناسیبایە دەیپرسی: ئایا ئەمە ئازادە یا بەندەیە؟ ئەگەر عەرزیان بکردایە: ئازادە، لەسەر ئیسلامو خەباتگێڕان پەیمانی لێ وەردەگرت، ئەگەر عەرزیشیان بکردایە: کۆیلەیە، هەر لەسەر ئیسلامەتی پەیمانی لێ وەردەگرت، لەسەر غەزاکردن پەیمانی لێ وەرنەدەگرت لە غەزاشا پێغەمبەر لە تالانی بەشەپشکی بۆ بەندە دانەدەنا، دەی ئەگەر بەندە لەو دەستە بوایە کە غەزا فەرزە لەسەریان لە تالانی جەنگی کافران وەك ئازاد بەشەپشکی بۆ دادەنا گوتمان نێرینەیی مەرجی پێویستبوونی غەزایە چونکە مێیینە غەزا لە سەریان پێویست نیە، چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ – سورة الأنفال – ٦٥/٨} واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! هانی موسوڵمانەکان بدە لەسەر غەزاکردنو جەنگردن – لە عەرەبیدا (صیغە) داڕێژگەی پیاو جیایە لە داڕێژگەی ژن، لێرەدا لەم ئایەتەدا داڕێژگەی نێرینە بەکار هاتووە، کە (لمؤمنین) لەلای ئیمامی شافیعی {ڕەزای خوای لێبێ} ژنان بەر ئەم داڕێژگەیە ناکەون چونکە ئەوان داڕێژگەی تایبەتی خۆیان هەیە کە (المؤمنات)ە، چونکە لەلای شافیعی کاتێ ژنان بەر داڕێژگەی پیاوان دەکەون کە بەڵگەیەك هەبێ لەسەر ئەو بەرکەوتنە.

دارێژگـه واتـه: سـیفه. لـه عائیـشەیش {ڕەزای خوای لێبێ} پرسـیارکرا. غـەزای ژنـان چییه؟ فـەرمووی: غـەزای ژنـان حەجـه. وەکـی تـریش ژن لازەبـوونو بـێ وەچـه لەبـەر ئـەوە بـەر (الـضعفاء) دەکـەوێ، کـه بـەپێی ئایەتەکەی پێشەوە غـەزایان لەسـەر نیـه، هـەروەها نێـرو مێـیش غـەزای لەسەر نیه. توانایش مەرجه، کەواتـه ناتـەوانا غـەزای لەسـەر نیـه، وەك کوێرو نەخۆشو شەل، چونکه توانـای ئـەركو زەحمـەتی غـەزایان نیـه. ئـەوەتا یـەزدانی پـاك لـەم گۆشـه نیگایـەوە دەفـەرموێ: {لَـيْسَ عَلَـى الْـأَعْمَى حَـرَجٌ وَلَـا عَلَـى الْـأَعْرَجِ حَـرَجٌ وَلَـا عَلَـى الْمَـرِيضِ حَـرَجٌ – سورة النـور – ٢٤/٦١} هەروا غـەزا لەسـەر ئـەو هـەژارەیش نیـه کـه نەتوانێ مەسرەفی خۆیو خێزانی دابینبکا، بـه پێـی ئایـەتی {وَلاَ عَلَـى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ} بەڵام ئەگەر دوژمن لەسـەر سـنوور یەخەی پێگرتن بوونی مەسرەفو ژێوار مەرج نیه. هەتا ئێستا قسەمان لەوەیـه کـه کـافران پێیـان نەنابێتـه نـاو وڵاتـی موسـوڵمانانه، وە دەنـا هـەرکاتێ ڕژانـــه نـــاو وڵاتمانـــەوەو دایـــان بەســـەر موســـوڵمانانانه وە موسوڵمانەکان سوور دەیانزانی هەر کاتێ کافران هەر کەسێك لـەوانبگرن دەیکوژن ئەوە لە هەلو مەرجی وادا پێویسته لەسەر هەموو موسوڵمانێ کـه چـەندەی بـۆ دەلـوێ بـەرگری لـه خـۆی بکـا، ئـیتر لـه کـاتی وادا بـۆ بەرگری بـەپێی توانـا ساغو نـەخۆشو ئـازادو کۆیلـەو ژنو کـوێرو شـەل هـەموو یەکـسانن چـونکه ئـەوە شـەڕی مـانو نەمانـه، کوشـتاری وا بەرگرییه لە ئایینو له نیشتمان، برێتیـی نیـه لـه شـەڕ لـه پێنـاوی وڵات گرتندا.

## ٣٤٩) بڕیاری دیلی بێبڕوایان:

**دیلی بێبڕوایان دوو جۆرن:-**

**جۆری یەکەم:** هەر لەگەڵ گیران بە خودی گرتنەکە دەبن بە کۆیلە، ئەمانەیش بریتین لە ژنانو لە منالآن.

**جۆری دووەم:** بە خودی دیلکردنە کە نابن بە کۆیلە، ئەمانەیش پیاوانی رەسیدەن.

**جۆری یەکەم:** کوشتنیان لەپاش دیلکردنیان نادروستە، هەروەها شێتیش، مەگەر شێتێ کە جەنگ بکا، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} رێگەی کوشتنی نەداون، ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: لە غەزایەکا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} تێپەڕی ژنێکی کوژراوی بینی، نارەزایی دەربڕی سەبارەت بە کوشتنی ژنو منالْ لە غەزادا (ش).

جا هەرکاتێ منالێ یا ژنێ بەدیل گیرا یەکسەر دەکرێ بە کۆیلە، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} ژنو منالی دیلیشی رێك وەك مالی تالانی بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش دەکرد، شێتیش لەم بڕیارەدا دەق وەك مندالْ وایە. ژنان بە مەرجێ دەکرێن بە کۆیلە کە خاوەن نامەبن، بەلام ژنی دیلکراو ئەگەر لە خاوەن نامەکان نەبوو، وەك ژنی زەندیقو بتپەرست، ئەوە ئەگەر قەبوولی ئیسلام نەکا لەلا ی شافیعی {رەزای خوای لێبێ} دەکوژرێ.

**جۆری دووەم:** کە بریتین لە پیاوانی رەسیدە ئەوە چارەنووسیان بە دەستی پێشەوایە، خۆی لە بارەیانەوە سەرپشکە لە یەکێ لەم چوار

شـتە: کوشـتن، یـا کـردن بـە کۆیلـە، یـا ئازادکـردنیـان بـە پیـاوەتی، یـا بەرەڵڵاکردنیان بەرامبەر بە تۆڵەیێ، جا ئەو تۆڵەیە سامان بێ یـا دیلی خۆمان بێ کە لەلای ئەوان بێ. پێشەوا لەمانـە کامیـان بـە بـاش دەزانـێ ئەوە دەکا. بەڵگەی دروستبوونی کوشتنیان – ئەگەر پێشەوا بـە باشی بزانێ – ئەم ئایەتەیـە {فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ} پێغەمبـەریش {دروودی خوای لەسەربێ} عقبەی کوڕی ئەبو موعـیطو نـەضـری کوڕی حـاریثـی لـە ڕۆژی بـەدردا دیلکـردو بەنـدیکردن لـە پاشـا کوشـتنی، بەڵگـەی کردنـی بـە کۆیلـەیش ئەوەیەکـە، حـەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} ژن‌و منـاڵی بـەنی قورەیظەو بەنی موطظەلیق‌و هۆزی هەوازینیکرد بە بەنـدی‌و کۆیلە، بەڵگەی ئازادکردنیش بە پیاوەتی ئـەم ئایەتەیـە {فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء} پێغەمبەریش {دروودی خوای لەسەربێ} لە ڕۆژی بەدردا بە پیـاوەتی ئـەبو العاصی کوڕی ربیعی ئازادکرد، هەروا ئەبو عیزەی جەمەحی بە پیاوەتی ئـازادکرد، ئـەوەبوو موسـوڵمانان ثـومامـەی کـوڕی ئـوثـالیـان دیلکـردو بەستیانەوە بە کۆڵەکەی ناو مزگەوتەوە، تـا پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} بەرەڵلای کرد، بەڵگەی تۆڵە وەرگرتنیش ئەم ئایەتەیـە {فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء – سورة محمد – ٤٧/٥} واتـە: جـا پـاش ئـەوە یـا بـە پیاوەتی دیلەکان بەرەڵا بکەن یا بە بەرامبەر بە ئەندازەیێ ماڵ ئازادیـان بکـەن - پێغەمبـەریش {دروودی خوای لەسەربێ} دیلـەکانی غـەزای بـەدری بـە بەرامبـەر بـە مـاڵ ئـازادکرد. ئەوەنـدە هەیـە ئەگـەر دیلکراوەکـە خـۆی بەندە بوو سەرپشکی تیانایەتـەجێ، بـەڵکوو یەکسەر دەکـرێ بـە کۆیلـە. هەر کەسێکیش لە پـێش دیلکـردن‌و بەیدەست کردنیـدا موسـوڵمان ببـێ سـەرو مـاڵی خـۆی دەپـارێزێ، بـەپێی فەرموودەکـەی {دروودی خوای لەسەربێ}:

فەرمانم پێ کراوە کە جەنگ بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا.. تاد. لە باسی بڕیاری نوێژ نەکەردا، لە پێش باسی غەزاوە رابورد. منداڵی بچووکی خۆشی دەپارێزێ، حوکم دەکرێ بە ئیسلامەتی ئەوانیش دەبن بە پاشکۆی خۆی، لەسەر بڕیاری فەرموودەی ساغ هەرکاتێ باپیرە موسوڵمان بوو کوڕەزاکانیشی دەپارێزێ، بە مەرجێ منداڵ بن، لەمەدا شێتیش بڕیاری منداڵی بۆ هەیە. هەروا ژنیش هەرکاتێ موسوڵمان بوو سەرو ماڵو منداڵی خۆی دەپارێزێ. بەڵام منداڵی گەورە بەهۆی موسوڵمانبوونی باوكو دایکەوە ناپارێزرێ چونکە خۆی بۆ موسوڵمان بوون سەربەخۆیە!.

## ٣٥٠) موسوڵمانبوونی منداڵ:

لەکاتی هەبوونی یەکێ لەم سێ هۆیەدا بڕیاری موسوڵمانەتیی منداڵ دەدرێ:

**یەکەم**: باوکی یا دایکی ئیسلام ببی، بۆ ئەم مەبەستە باپیرەو نەنکیش لە پایەی باوكو دایکان، بەپێی ئایەتی {وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ - سورة الطور - ٢١/٥٢} واتە: وە ئەو کەسانە کە باوەڕیان کردووە لەسەر شێوەیەکی تەواوی دامەزراو، وە بوون بەهۆی باوەڕهێنانی نەتەوەکانیشیان، ئەوە لە پاشە ڕۆژا نەوەکانیشیان دەبەینە پایەی بەرزی ئەوان، بۆ چاوو دڵ ڕۆشنکردنی ئەوان. وەکی تریش لە شوێنێ منداڵ بۆ حوکمکردن بە موسوڵمان بوونی ببێ بە پاشکۆی دیلکەری موسوڵمانی، دیارە بۆ ئەوە

باشتر دەبێ بە پاشکۆی باوکی یا دایکی، چونکە باوك‌و منداڵ، یا دایك‌و منداڵ پارچەی یەکترین‌و خوێن تێکەڵن.

**دووەم**: بە تەنیا دیلبکرێ، باوك‌و دایکی لەگەڵدا دیل نەکرابێ، دیلکەرەکەیشی موسوڵمانبێ، لەم کاتەیشا بڕیاری موسوڵمانەتیی دەدرێ‌و دەکرێ بە پاشکۆی دیلکەرەکەی، ئەمەیش بە یەکگرتن وایە، سەرەڕای ئەوەیش دەڵێین: منداڵ سەرەوکاری خۆی پێ ناکرێ، قسەی دەگەرو بڕشتی نیە، دەبێ بە دواکەوتەی دیلکەرەکەی، چونکە بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی لەسەر دیلکەرەکەیەتی رێك وەك لەوەوپێشی باوکی.

**سێیەم**: منداڵێ دۆزراوەی وڵاتی ئیسلام بێ، چونکە مادام زۆر تری خەڵکەکە موسوڵمانن‌و وڵاتیش وڵاتی موسوڵمانە ئەو لایەنانە زاڵ دەبن، لەبەر ئەوەیش ئیسلام هەر سەردەکەوێ، نابێ هیچی تر سەری بکەوێ، وە لەبەر ئەوەیش کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەموو منداڵێ کاتێ لە دایك دەبێ بە سروشت، بە خوداکرد ئەمادەیە بۆ خودا ناسین، بەڵام لەوەدوا باوك‌و دایك‌و پەروەردەکەری‌و نەریت‌و باوی ناو کۆمەڵ دەیگۆڕن‌و لەڕێ دەری دەکەن، جا یا دەیکەن بە جوولەکە یا بە گاور یا بە ئاگر پەرست، یا بە بوت پەرست‌و فرە خواو شتی تری وا، پیاوێ عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشە پێمان بفەرموو ئەگەر ئەو منداڵە بە ساوایی لە پێش ئەو گۆڕین‌و لەڕێ دەرکردنەدا بمرێ چارە نووسی چیە؟ فەرمووی: خودا خۆی باش دەزانێ ئەگەر ئەو منداڵە گەورە ببوایە کارو کردەوەی چی دەبوو (ش = شەیخان: بوخاری‌و موسلیم).

**بزانن:**

جوکمکردن به موسوڵمانەتیی منالی دۆزراوه تایبەت نیه به وڵاتی ئیسلامەوه، بەڵکوو ئەگەر وڵاتەکە وڵاتی کفریش بێ، بڕیاری موسوڵمانەتیی منالە دۆزراوەکە دەدەین، بە مەرجێ ئەو وڵاتە موسوڵمانی تیابێ، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویێ: (ئیسلام زیاد دەکا، کەم ناکا) (ئەبو داوود گێڕاویەتەوه. بڕوانەتاج/ ٣ ل – ٥) بەڵام بەهەرحاڵ ئەگەر پەیماندار (نیمميیە) یەك هات گوتی: منداڵی منەوه بەڵگەی هەبوو، بەڵگەیەکی وا کە بنەچەی پێ بچەسپێ، ئەوه منالەکە دەلکێ بەوەوەو دەبێ بەهی خۆی، لە کفریشدا هەر دەلکێ بەوەوە، چونکە بەڵگە لە وڵات بەهێز ترە. واتە: ساخبوونەوەی بنەچە بە بەڵگە بەهێز ترە هەتا ساخبوونەوەی ئایینی بەهۆی ئەوەوە کە لە وڵاتی ئیسلامدا لە دایك بووە دادەنرێ بە موسوڵمان.

## ٣٥١) باسی کەلوپەلی کوژراو:

باسێ هەیە لەم باسەدا پێی دەگوترێ (سەلەب) سەلەب لە زمانا واتە: شت بە زۆر سەندن، لە شەرعا: بریتییە لەوە موسوڵمانێ لە غەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێو تفاقو کەلوپەلەکەی رووت بکاتەوەو بیبات بۆ خۆی. سەر بەڵگەی ئەمە ئەم فەرموودەیەتی (درودی خوای لەسەربێ): کەسێ لە غەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێو بەڵگەی هەبێ لەسەر ئەوە کە خۆی کوشتوویەتی، ئەوە رووتی بکاتەوه بۆ خۆیو تفاقو کەلوپەلەکەی ببا بۆ خۆی. (ش) ئەبو داوود دەگێڕێتەوه کە ئەبو طەلحە (رەزای خوای لێبێ) لە

**بزانه:**

کە هەر شتێ پیسخۆر بێ خواردنی گۆشتەکەی ناباشە واتە: مەکرووهە، ئیتر خوای مەڕو گاو گۆتاڵ بێ، یا مریشكو مراوی بێ یەکسانە، گیانلەبەری پیسخۆر ئەوەیە زووربەی خواردنی پیسایی بێ، چونکە ئینو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} خواردنی گۆشتو شیری گیانلەبەری پیسخۆری قەدەغە کردووە، لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} قەدەغەی کردووە کە سواری وشتری پیسخۆربن، یا گۆشتو شیری بخۆن. (د/ ت/ ن – س/ ح/ تاج – ٤ ل ١٤).

بەڵام کاتێ دادەنرێ بە ناباش کە بۆگەنی لێپەیدا ببێ، وەك ئەوە ئارەقی بۆنی پیسایی لێبێ، یا گۆشتەکەی تامی بۆگەن بێ، هەر گیانلەبەرێ وابێ بە پیسخۆر حلێبە، دەنا نا. بەپێی ئەوەی کە نەوەوی لە ئەصلی ڕەوضەدا ساخی کردۆتەوە، بەلام بەپێی ئەوەی وا لە (التحریر)دا بایەخ بە زۆری ئالفە، ئەگەر زوربەی ئالفەکەی پیس بوو ئەوە پیسخۆرەو خواردنی گۆشتو شیرەکەی ناباشە، دەنا پیسخۆر نیەو خواردنی گۆشتو شیریو سواربوونی ناباشو مەکرووە نیە. ئەم نەهیەیش بۆ تەنزیهە بۆ تەحریم نیە، چونکە خواردنی پیسی بەس کار لە گۆڕینی بۆنو تامی گۆشتەکەی دەکا، زاتەکەی ناگۆڕێ، دەی شتی وایش هەر ناباشی (کەراهەت) دەخوازێو بەس.

# ٣٦٥) کەی دروستە کە مردار بخوری؟

قورئانی پیرۆز بە دەق دەفەرموێ: مردار نادروستەو حەرامە هەروا بە دەق دەفەرموێ: ئەمانە هەموو نادروستن: خوێنی رژاو، گۆشتی بەراز، هەر سەبڕاوێ ناوی غەیری خودای لێ بهێنرێ، یا هەر شتێ بەهەر شێوەیێ مردار ببێتەوەو بە چەقۆدا نەگاو بەپێی شەرع حەڵاڵ نەبێو حەڵاڵ نەکرابێ، وەك خنکاو، وەك بەلێدان مردوو، وەك بەرەوەبووی مردار، وەك لە شەڕە شۆقا کوژراو، کە فریای سەربڕینی نەکەون، وەك درندە خواردوو، ئەم بڕیارە بۆ کاتی فەرەحیو حاڵی ئاساییە، بەڵام لەکاتی ناچاریدا لەبەر ناچاری، ئوەندەی کە مرۆڤ لە مردن رزگار بکاو بەری دڵی بگرێ خواردن لە مردار دروستە، چونکە بەبێ ئەوە ژیانی ناپارێزرێ، خودای گەورە دەفەرموێ: {فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ - سورة البقرة - ١٧٣/٢} واتە: دەی هەر کەسێ ناچار بوو بۆ خواردنی مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو سەربڕاوێ کە لەکاتی سەبڕینەکەیداناوی غەیری خودای لێ هێنرابێ، ئەوە هیچ تاوانی لەسەر نیە لە خواردنی ئەوانەدا، بە مەرجێ دەسدرێژی لە مافی ناچارێکی تری وەك خۆی نەکاو زیادە خۆری نەکاو لەو ئەندازەیە تێنەپەڕێ کە پێویستە بۆ پاراستنی ژیانو گیانی).
کەواتە: بە هیچ جۆرێ نابێ زیاد خۆری بکا، هەتا تێرخواردنی تەوایش زۆر باش نیەو راجیایی دوورو درێژ لە بارەیەوە هەیە، لە کتێبە گەورەکاندا بە دوورو درێژی باس کراوە.

## ٣٦٦) مردووی ماسیو کولله:

**گیانلەبەر سێ بەشی هەیە:**

**بەشی یەکەم:** گۆشتی ناخۆرێ، ئەمە مرداریو سەربڕاوی یەکسانن و وەك یەك حەرامن.

**بەشی دووەم:** گۆشتی دەخورێ، ئەمە بە مەرجێ گۆشتی دەخورێ کە بەپێی شەرع سەربڕا بێ، یا حەلاڵ کرابێ، وەك لە پێشەوە رابورد، مردارەوەبووی ئەم باشە حەرامە.

**بەشی سێیەم:** گۆشتی دخورێو سەربڕینی لەسەر نیە، واتە: مرداریشی حەلاڵە، وەك ماسیو کوللە، بە گشت جۆرەکانیانەوە، بەپێی ئەم فەرموودەیەی ئیبنو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: دوو مردارو دوو خوێنمان بۆ حەلاڵ کراون، مردارەکان بریتین لە ماسیو لە کوللە، دوو خوێنەکانیش بریتین لە جەرگو لە سپڵ. (ئیبنو ماجەو حاکم گێڕاویانەتەوە، رشتەی ئیبنو ماجە لاوازە، حاکم لە موستەدرەکا بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە). ئەبو هورەیرەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە کاتێ سواری کەشتی دەبین لە دەریادا کەمێ ئاوی شیرین هەڵ دەگرین، ئەگەر دەسنوێژی پێ بگرین بەشی خواردنەوەمان ناکاو توونیمان دەبێ، جا ئایا بە ئاوی دەریا دەسنوێژ بگرین یانا؟ فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: بەڵێ دەسنوێژی پێ بگرن، چونکە دەریا هەم پاکەو هەم پاکەوەکەریشە، وە مرداروەبووشی

حەڵاڵەو گیانلەبەری ئاوی کاتێ دەمرێ هەتا نەگەنێ خواردنی دروستە.

(د/ ت/ ن/ - س/ ص – تاج/ ١ ل – ١٠٢).

**بزانە:**

هە گیانلەبەرێ کە هەر لە ئاوا بژی وەکوو ماسی وایە، گۆشتی حەڵاڵەو سەربڕینی ناوێ، مەگەر گەورەبێو بەزەحمەت گیانی دەرچێ، ئەوە سوننەتە بۆ رزگارکردنی لە ئێشو ئازاری پەلەقاژەی مەرگ سەربڕێ، خوای ئەو گیانلەبەرە ئاوییە لەسەر شێوەی ماسی بێ یانا، ماسیش بە هەموو جۆرەکانیەوە حەڵاڵە، لەبەر هۆی ئاشکرا بمرێ وەك پیاکێشانو لێدانی راوکەر، یا لەبەر هۆی ئاسایی بمرێ، یا لەبەر هەر هۆیێ بمرێ حەڵاڵەو گۆشتی دەخورێ. بەپێی ئایەتی: {أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ – سورة المائدة – ٩٦/٥} (واتە: ئەی موسوڵمانەکان حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە نەچیری دەریا). وە بەپێی فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیش کە لە کۆتایی بەشی سێیەمی گیانلەبەرەکانا رابورد. شافیعی (رەحمەت و رەزای خوای گەورەی لێبێ) بە دەق دەفەرموێ: مشکی ئاویو بەرازی ئاوی دەخورێن، لەبەر ئەوەیش بە گشت گیانداریکی ئاوی دەگوترێ ماسیو ناوی ماسی بۆ بەکار دەهێنرێ. ئەوەندە هەیە تیمساحی لێ چەرت دەکرێ، چونکە بە کەڵبە نەچیرتێك دەشکێنێ، بۆقو قرژانگو کیسەڵیش لەسەر رای فەرمایشتی سەنگین (راجح) حەرامن چونکە پیسن.

## ٣٦٧) باسی قوربانی:

بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی/٥ ل – ١٣٥ ز: ٧٦ + ل – ١٠٠ ز: ٧٤ نامەی حەوتەم.

قوربانی لە شەرعا بریتییە لە سەربڕینی ئاژەڵ لە ڕۆژی جەژنو سێ ڕۆژەی پاش جەژندا کە ناودارن بە (أيام التشريق) بە نیازی نزیکبوونەوە لە ڕەزای خودای مەزن، بە عەرەبی پێی دەگوترێ (أضحيه) و (ضحيه). لەپێش یەکگرتندا سەربەڵگە لە بارەیەوە ئەم فەرمایشتەی زاتی مەزنە: {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ – سورة الكوثر-٢/١٠٨} واتە: ئنجا نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی بۆ سەر ببڕە) وە ئەم فەرمایشتەی تریەتی: {وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُم مِّن شَعَائِرِ اللَّهِ – سورة الحج – ٣٦/٢٢} واتە: ئێمە سەربڕینیو شتری پێنج ساڵ تەواکردووی پێ لەشەش ساڵ ناومان گێڕاوە بە دروشمو نیشانەی ئیسلامەتی بۆ ئێوەو کردوومانە بەو پەرستشانە کە خودای گەورە دایمەزراندوونو کردوونی بە ئادابی حەج).

قوربانی لە مەذهەبی ئێمەدا سوننەتەو سوننەتێکی دامەزراوی گەلێ گەورەیە، دروشمێکی ناوداری لەبەر چاوە لە دروشمە گەورەکانی ئیسلام، پێویستە کە پارێزگاریی بکرێو برەوی پێ بدرێ، چونکە مایەی پاداشی زۆر باشە ئەوەبوو یارانی پێغەمبەر {درودی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لە یارانی} عەرزی خۆشەویستیانکرد: قوربان! قوربانی چییە؟ فەرمووی: {درودی خوای لەسەربێ}: سوننەتو نەریتی ئیبراهیمی بابە گەورەتانە: گوتیان: بۆ ئێمە چی تیادایە؟ فەرمووی: لە باتی گشت

تەڵەموویێ کەوا بەو ئاژەڵانەوە کە دەیانکەن بە قوربانی یەك چاکەی تەواوتان بۆ هەیە. پێشەوا مالیك {رەزای خوای لێبێ} فەرموویەتی: قوربانی واجبە، واتە: فەرزو پێویستە. ئەبو حەنیفەیش {رەزای خوای لێبێ} هەروا دەفەرموێ: بەڵام دەفەرموێ: لەسەر دەوڵەمەندی نیشتەجێی ناو شار پێویستە.

دەوڵەمەند ئەو کەسەیە کە خاوەنی ئەندازەیێ سامان بێ گەیشتبێتە رادەی زەکات (لە فیقه عەلەلمەزاهیبیل ئەربعەدا دەفەرموێ: (ولكن الحنفية قالوا: انها سنة عين مؤكدة لا يعذب تاركها بالنار ولكن يحرم من شفاعة النبي {صلى الله عليه وسلم} ويعبرون عن ذلك بالواجب)، واتە: حەنەفییەکان دەفەرمون: قوربانی خود سوننەتە (واتە: سوونەتی عەینە، سوننەتە بۆ هەموو کەسێ بە خودی خۆی بیکا، بە کردنی کەسێکی تر لە کۆڵ ئەو ناکەوێ) سوننەتێکی دامەزراوە، ئەگەر کەسێ نەیکا بە نەکردنەکەی گوناهبار نابێ، کەواتە بە ئاگری دۆزەخ ئازار نادرێ، بەڵام لە بەهرەیەکی زۆر گەورە ناهومێد دەبێ کە تکاکاریی پێغەمبەری سەروەرە {درودو سڵاوی خودای لەسەربێ} حەنەفییەکان بەم جۆرە سوننەتە دەڵێن: واجب واتە: پێویستی بە مەعنا دامەزراو – وەرگێڕ).

بەڵام لافی پێویستبوونی قوربانی بە بەڵگەی فەرمووەی پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} رەد دەکرێتەوە: لە تیرمیذیدا دەفەرموێ: خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: فەرمان کراوە بەمن کە قوربانی بکەم، قوربانی بۆ ئێوە سوننەتە. فەرموودەیێ تریش هەیە لە مەیش

دەقترو روونترە، دارەقوطنی گێڕاویەتەوە دەفەرموێ: {دروودی خوای لەسەربێ}: قوربانیکردن لەسەر من فەرزە، بەڵام لەسەر ئێوە فەرز نیە. لە صەحیحی موسلیمدا، لە فەرموودەیەکا کە ئوممو سەلەمە {رەزای خوای لێبێ} دەیگێڕێتەوە: خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ دەیەوێ قوربانی بکا، کە مانگی نوێی قوربان هەڵهات ئیتر با نەموو لەخۆی بکاتەوەو نە ناخونی خۆی بکا، تا قوربانیبەکەی دەکات. ئەم فەرموودەیە لەسەر ئەم شێوەیە دەبێ بە بەڵگە بۆ سوننەت بوونی قوربانی: ئەوەتا سەروەر {دروودی خوای لەسەربێ} کردنی قوبانی بەستووە بە خواستو ئارەزووی قوربانیکەرەوە، دەی شتی فەرزو پێویست نابەسترێ بە خواستو ئارەزووی ئەرکدار (موکەللەف)ەوە. ئەو فەرموودەیەی کە قسە لە پێویستبوونی قوربانی دەکا، لە رشتەکەیدا نەناس (مەجهوول)ێ هەیە، گریمان فەرموودەکە ساغیش بێ دەبڕرێ بەسەر سوونەتی دامەزراودا، بەپێی ئەو یاسا دامەزراوەی کە دەڵێ: هەرکاتێ چەند بەڵگەیێ بە رواڵەت یەکیان نەدەگرت، واباشە بەپێی توانا کار بە هەموویان بکرێ، کە بەمە لە زاراوەدا دەگوترێ: جەمع بەینەلئەدیللە (بڕوانە فیقهی ئاسان – الفقه الميسر – بەرگی یەکەم لاپەڕە (٥٤) وەرگێڕ).

**بزانە:**

لەلای ئێمەی شافیعی مەزهەب قوربانی سوننەتی کیفایەیە، کەواتە: ئەگەر کەسێکی خاوەن خێزان خۆی یا یەکێ لە خێزانەکەی قوربانیی کرد، ئیتر داوای قوربانی لە وانی تر ناکرێ، لەگەڵ

رەچاوکردنی ئەوەدا: ئەگەر کەس لەو خێزانە بەو سوننەتە هەڵنەسا، ئەوە ناپەسەندی (کەراهەت) ی بۆ هەموویان هەیە.

**بزانن:**

کەسێ رووی لێ دەنرێ کە ئەم سوننەتە بکا کە موسوڵمان و رەسیدەو خاوەن هۆش و فامیدەو خاوەن روشدو ئازادو ماڵداربێ، ماڵدار یاخود توانا ئەوەیە کە ئەو ئاژەڵی قوربانییە زیادبێ لە خەرجی ژێواری خۆی و ئەوانەی کە ژێواریان لە سەریەتی بۆ شەوو رۆژی جەژن و سێ رۆژەکەی پاش جەژن.

## ٣٦٨) چی بۆ قوربانی دەست دەدا:

**لە قوربانیدا چەند شتێ مەرجە:**

**یەکەم:** سەربڕین، چۆنێتی سەربڕینی رەوا لە پێشەوە رابورد لە ز/٣٦٠.

**دووەم:** سەربڕ، باسی سەربڕ لە پێشەوە رابورد لە زنجیرە/ ٣٦٠دا.

**سێیەم:** کاتی قوربانی کەیە؟ ئێستا لەم باسەدا باسی ئەوە بەروونی دێ.

**چوارەم:** ئەو ئاژەڵانەی بۆ قوربانی دەست دەدەن ئەمانەن: وشترو رەشەوڵاخ و مەڕو بزنن بە هەموو جۆرەکانیانەوە، گامێشیش لە زاراوەی شەرعا بە رەشەوڵاخ دادەنرێ، خودای گەورە دەفەرموێ: {لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن

بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ - سورة الحج - ٢٢/٢٨} واتـه: با موسوڵمانان بێن بۆ لای تۆو بۆ سەردانی خانەی خودا، هەتا بە چاوی خۆیان ئـەو هـەموو سوودو بەهرانە ببینن کـەوان لـەم کۆڕو کۆبوونەوانـەدا، کـە لـەم چـەند ڕۆژە دیاریکراوانـــەدا دەبەســـترێن، بـــۆ ئـــەوەیش لـــەم ڕۆژە پیرۆزانـــەدا خۆشـــیان بەهرەمەنـــدبن لـــە بـــەهرەی جیهـــانیو ئـــایینی) وەك جێبـەجێکردنی حـەجو عـەمرە، وەك ئەنجامـدانی کـاری بازرگـانی، وەك دیتنی شوێنی پیرۆزو شوێنی مێژوویی وڵات، وە با ناوی خودا ببـەن لـەو چەند ڕۆژە دیاریکراوانەدا، بە تایبەت لەکاتی سەربڕینی ئـەو ئاژەڵانـەدا کە خودای گەورە کردوونی بە ڕۆزیی حەڵاڵ بۆ ئێوە. ئەوەتا بەپێی ئـەم ئایەتە ئاژەڵ دیاری کراوە بۆ قوربانی، ئاژەڵیش برێتییە لە وشترو ڕەشـە وڵاخو مەڕو بزن، کەواتە گیانـداری تـر جگـە لـەم چوارە دەسـت نـادا بـۆ قوربانی، یەکگتن لەسەر ئەمە دامەزراوە، کرداری پێغەمبەریش بەڵگەیە لەسەر دروستیی ئەم بڕیارە، چونکە پێغەمبەر {درووددی خوای لەسەربێ} هەر لـەم چوار جـۆرە شـتە قوربـانی کـردووە، نەبیـستراوە لـە شـتی تـر قوربـانی کردبێ.

# ٣٦٩) مەرجـــەکانی دامەزرانـــدنی قوربـــانی ئەمانەن:

١) لە مەڕ شەك یا لە شـەك بـە تەمـەنتر دەسـت دەدا بـۆ قوربـانی، شەك ئەوەیە کە ساڵێکی تـەواو کردبێو پێـی نابێتـە سـاڵی دووەم، قیـل (گوتراوە)ێ دەڵێ: یاخود بـەر لـە تـەواو بـوونی سـاڵێ ددانـە پێشینەکانی

کەوتبێ، گوتراوێ تر دەفەرموێ: ئەوەیە بەرگنەکەی ببێ بە خوری، بەرگن لە سەرپشت قیتو قنجە، خوری شۆڕو سەرەو خوارە. گوتراوێ تریش دەفەرموێ: ئەوەیە شەش مانگی تەواو کردبێ، بەلام فەرموودەی یەکەم دروستترینی ئەم فەرموودانەیە.

٢) لە بزن چتیرێ کە دوو ساڵی تەواو کردبێو کەوتبێتە ساڵی سێیەمەوە، لەسەر فەرموودەی دروستترین دەست دەدا بۆ قوربانی، بۆیەیش لە شەك بە ساڵ جیایە چونکە گۆشتی چتیر لە گۆشتی شەك کەمترە، لەبەر ئەوە بەهۆی زیادەی ساڵەوە هەوڵی ئەوە دەدرێ ئەو کەمییە پڕبکرێتەوە، گوتراوێ دەفەرموێ: بزنێ ساڵێکی تەواو کردبێو پێی لە ساڵی دووەم نابێ بۆ قوربانی دەست دەدا. چتیر لە عەرەبیدا ناوی (ثنیً)یە، بۆیە وای پێدەگوترێ چونکە لەو تەمەنەدا ددانە دوینەکانی دەردەچێ، کە بەعەرەبی ناویان (ثنیَّە)یە[1]

---

[1] ددان لە مرۆڤ دا ئەم چەند جۆرەی هەیە، کە لە پێشەوە لە ناوەڕاستی ریزی سەرەوەو ریزی خوارەوە لەسەر ئەم ریزە دەست پێ دەکەن:

١- ثەنایا (ددانە دوینەکان).

٢- رەباعیات (ددانە چوارینەکان).

٣- ئەنیاب (کەلبە).

٤- ضەواحیك (پێشەخرێ).

٥- ئەرحاء (خرێ). ئەم پێنج جۆرە هەر جۆرەی چوار ددانن، دوویان لە ریزی سەرەوەنو دوویان لە ریزی خوارەوەن، بە رابەری یەکترین، کۆی هەموویان دەکاتە بیست ددان، گشت ددانەکانی تریش پێیان دەگوترێ: ئەضراس، واتە: کاکیلە. گەلێ بابەتو بڕیارو زانیاری پەیوەندییان هەیە بەناوو بە جۆری ئەم ددانانەوە، لەبەر ئەوە بە باشم زانی کە

٣) وشتری قربانی دەبێ پێنج ساڵی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە شەشەوە بە عەرەبی وشتر لەم تەمەنەدا بە نێری دەگوترێ (ثنیّ) بە مێچکەی دەگوترێ (ثنيَّة) گوتراویشە: دەبێ شەشی تەواوکردبێ‌و پێی نابێتە حەوتەوە بەڵام فەرموودەی یەکەم دروستترە.

٤) رەشەوڵاخیش دەبێ دوو ساڵی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە سێوە، گوتراویشە: پێی نابێتە چوارەوە.

(ئەم جۆرە ئاژەڵانە دەست ئەدەن بۆ قوربانی)

خەسێنراو بۆ قوربانی دەست دەدا، چونکە ئاژەڵ بە خەسان قەڵەو دەبێ‌و گۆشتەکەی خۆشتر دەبێ، هەروا کوڵ‌و شاخ شکاویش دەست دەدا، گەرچی بەهۆی شاخ شکاویشەوە خوێنی لێ بێ، چونکە کار لە گۆشتەکەی ناکا، کەواتە: وەك چۆن برینەوەی خوری‌و مووی ئاژەڵ زیانی نیە شاخ شکاویش ئاوا زیانی نیە بۆ قوربانی.

**بزانە :**

جیایی نیە لە ئاژەڵی قوربانیدا نێربێ یا مێ بێ، بە مەرجێ ساڵی رەچاوکراو هاتبێتە دی. بەڵێ لەسەر رای دامەزراو نێر بۆ قوربانی

---

ئەم روونکردنەوەیە بنووسم. تکایە بڕوانە: عمدة القاری شرح صحیح البخاری ج/ ٢١ ص ٢٥٤ لەم شوێنەدا هەڵەی چاپ زۆرە، لە وەرگەڕاوەکەدا هەڵەکانم بەپێی کفایة الاخیارەکە راست کردەوە. لە هەندێ شوێنی دیێ دووان پەڕیوە.

٦- بڕوانە: مختصر صحیح البخاری/ کوردی بەرگی/ ٤ ل – ٢٨٣.

- وەرگێڕ -

باشتره، چونکه گۆشتهکهی خۆشتره (کورد گوتهنی: بهرخی نێر بۆ سهربڕین – وهرگێڕ).

وشترێ بۆ حهوت کهس دهست دهدا، ههروا ڕهشهوڵاخیش، بهپێی ئهو فهرموودهیهی که جابیر دهیگێڕێتهوه دهفهرموێ: ساڵی ڕێکهوتنی حودهیبییه که له خزمهتی حهزرهتدا بووین ئیحرامی عهمرهمان بهستبوو، بهڵام بتپهرستهکان ڕێگهیان نهداین که عهمرهکهمان تهواو بکهین، ئیتر ئیحرامهکهمان شکان‌و بهم شێوهیه فیدیهماندا: به حهوت کهس وشترێ یا گایهکمان سهردهبڕی (موسلیم) ئهبو ئیسحاق دهفهرموێ: وشتر بۆ ده کهس به کاردێ. ئیبنو عهبباس {ڕهزای خوای لێبێ} دهفهرموێ: له سهفهرێکا، له خزمهت حهزرهتدا بووین، بوو به جهژنی قوربان، جا حهوت کهس حهوت کهس له یهك سهر ڕهشهوڵاخا دهبووین به هاوبهش‌و دهمانکرد به قوربانی، وه ده کهس دهکهسیش له یهك سهر وشتردا دهبووین به هاوبهش‌و دهمانکرد به قوربانی (تیرمیذی گێڕاویهتهوه‌و دهفهرموێ: فهرموودهیهکی جوانی نابڵاو (غهریب)ه، ئیبنو لقهططانیش دهفهرموێ: فهرموودهیهکی دروسته. له بوخاری شهریفدا شتێ وا ههیه که شایهتی ئهم فهرمایشتهی ئهبو ئیسحاق بێ (بهزهینم ئهو شته ئهمهیه: له بوخاریدا عائیشه {ڕهزای خوای لێبێ} دهفهرموێ: پێغهمبهر {دروودی خوای لهسهربێ} گایهکی کرد به قوربانی بۆ ژنهکانی، عهللامهی عهینی {ڕهزای خوای لێبێ} دهفهرموێ: یهکێ لهو بڕیارانهی لهم فهرموودهیه وهردهگیرێ ئهمهیه: پێغهمبهر یهك ڕهشهوڵاخی کردووه به قوربانی بۆ ههمو ژنهکانی. دیاره که ئهم حهجه

حەجیماڵئاواییە ئەو کاتەیش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نۆ ژنی بووە، دەی لە شوێنی گا بۆ حەوت کەس زیاتر دەستبدا، وشتر باشتر بۆ زیاتر لە حەوت کەس دەست دەدا، بڕوانە: عومدەتولقاری ب – ٣ ل – ٢٥٧ + تاج – ٢ ز – ١٠٩ ل – ٢١٥ ف – ٢ – وەرگێڕ).

مەڕو بزن بۆ یەك کەس دەست دەدەن، بەڵام ئەگەر خێزانێ، یا چەند خێزانێ، ژێواریان لەسەر یەك کەس بوو، خاوەن خێزانەکان خۆی یا یەکێ لەو خێزانانە، مەڕێ یا بزنێکی کرد بە قوربانی لە جیاتی هەموویان ئەوە دروستەو برێتیی گشتیان دەکەوێ.

## ٣٧٠) چی بۆ قوربانی دەست نادا:

مەرجی ئاژەڵی قوربانی ئەوەیە نەنگی وای پێوە نەبێ کە گۆشتی کەم بکاتەوە، وەك ئەم چوار جۆرە نەنگە کە ئاژەڵی پێ عەیبدار دەبێو بە کەڵکی قوربانی نامێنێ: ئاژەڵی کوێری دیاریو، ئاژەڵی شەلی تەواو لەنگو ئاژەڵی تەواو نەخۆش کە نەخۆشییەکەی پێوە دیاربێو، ئاژەڵی لەڕو لاوازی بێ مۆخ، ئەمانە بە کاری قوربانی نایەن، بەپێی ئەم سەر بەڵگەیە لەم فەرموودەیەیدا (درودی خوای لەسەربێ): ئەم چوارە بە کاری قوربانی نایەن: ئاژەڵی کوێر کە کوێرییەکەی پێوە دیاربێو ئاژەڵی نەخۆش کە نەخۆشییەکەی پێوە دیابێو ئاژەڵی شەلی تەواو لەنگو ئاژەڵی لە ڕكو لاوازی بێ مۆخ (تیرمیذی - ڕەزای خودای لێبێ – دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی دروستە). زاناکان دەفەرموون: هۆی دەست نەدانی کوێر بۆ قوربانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە بەهۆی

کوێرییەکەیەوە، لەلای چاوە کوێرەکەوە لە وەڕانی کەم دەکاو دەبێ بەهۆی لەڕی، یا لەبەر ئەوە بەشێ لە گۆشتە پاکە خۆشەکەی نەماوە، کە گلێنەی چاویەتی. هی شەلیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئاژەڵی ساخ پێشی دەکەوێ‌و زوربەی کات بەهۆی ئەوەوە لەوەڕی باشی بەرناکەوێ‌و ئەوەیش دەبێ بە مایەی لەڕبوونی. هی ئاژەڵی تەواو نەخۆشیش ئەوەیە چونکە نەخۆشی گۆشت بێ کەڵك دەکا، هی ئاژەڵی لەڕك‌و لاوازی بێ مۆخیش ئەوەیە لە ڕێی زۆر گۆشت لەکار دەخا. ئەم جۆرە ئاژەڵانەیش بە کەڵکی قوربانی نایەن: گەڕۆڵ‌و شێت‌و گوێ قرتاوو دووگ بڕاو، یا هەر ئاژەڵی پارچەیێ لە لەشی یا لە ئەندامێکی بڕابێ، گەڕیی کەم‌و زۆری چون یەك لەسەر فەرموودەی دورستتر، دەبێ بەهۆی دەست نەدان، چونکە کەمی‌و زۆری گەڕیی گۆشت بێ کەڵك دەکەن، پێشەوا شافیعی (ڕەزای خوای گەورەی لێبێ) دەفەرموێ: گەڕۆڵی لەو چەشنە دەردانەیە کە گۆشت‌و بەزتێك دەدەن. شێتیش وا لە ئاژەڵ دەکا کە نە لەوەڕێ‌و لەڕببێ‌و گۆشتەکەی خراپ ببێ، جۆرێکی هەیە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: ثەولاء، بە کوردی پێی دەگوترێ: حۆل: گێژوویژ، هەمیشە دەکەوێتە دوا ڕانەوەو زۆر جاریش تووشی سەرەخولێ دەبێ‌و بە دەوری خۆیدا وەك باوە خولی بکا دەخولێتەوە. هۆی دەستنەدانی گوێ بڕاوو دووگ بڕاویش ئەوەیە کە بەشێ لە گۆشتە پاکە حەڵاڵەکەی کە دەست دەدا بۆ خواردن نەماوە.

## ٣٧١) کاتی سەربڕینی قوربانی:

کاتی سەربڕینی قوربانی دەست پێ دەکا بە تێپەڕ بوونی ماوەی دوو رکات نوێژو دوو وتار لە پاش هەتاو کەوتنی رۆژی جەژنی قوربان، وە دەمێنێتەوە هەتا رۆژ ئاوابوونی رۆژی سێیەمی پاش رۆژی جەژن، کە تێکڕا دەکاتە چوار رۆژ: رۆژی جەژنو سێ رۆژەی پاش جەژن. بەڵگەی دیاریکردنی ئەم کاتە بۆ قوربانی ئەم فرمایشتەیەتی {دروودی خوای لەسەربێ} لەم رۆژەمانا یەکەم شت کە دەستی پێ بکەین ئەوەیە کە نوێژی جەژن دەکەین، ئینجا دەگەڕێینەوەو قوربانی سەر دەبڕین، جا ئەوەی ئاوا بکا ئەوە یاساو رێبازو سوننەتی ئێمەی پێکاوە، وەڵێ ئەوەی لەپێش نوێژی جەژندا قوربانی سەر ببڕی ئەوە دانانرێ بە قوربانی (ش/ د/ ت/ تاج/ ٤ ز — ١٣ ل — ٣٩ فەرمووده: - ٧) بە یەکدەنگ (اتفاق)ی زاناکان کردنی نوێژی جەژن مەرجی داهاتنی کاتی قوربانی نیە، بەڵکوو تێپەڕ بوونی ماوەی دوورکات نوێژو دوو وتار مەرجەو بەس، کاتی قوربانیکردن بەسەر دەچێ بە تێپەڕ بوونی سێ رۆژەی پاش جەژن چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: رۆژەکانی مینا — کە رۆژی جەژنو سێ رۆژەکانی پاش جەژنن — هەموویان رۆژی قوربانیکردنن (بڕوانە: تاج/ ٢ ز- ١٠١ ل ٢٠٠ فە- ٢ - وەرگێڕ).

قوربانیکردن لە شەوا ناباشە، واتە: دروستە بەڵام ناپەسەندە، چونکە مەترسی ئەوەی هەیە کە گۆشتەکەی بە تەڕو تازەیی دابەش نەکرێ.

## ٣٧٢) چی له کاتی سەربڕیندا پەسەندە:

**ئەم چەند کارە لەکاتی سەربڕینی قوربانیدا سوننەتە:**

١) ناوی خواهێنان چونکە زاتی پاك دەفەرموێ: {فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ – سورة الأنعام – ١١٨/٦} واتە: دەی لە گۆشتی ئەو گیانلەبەرانە بخۆن کە ناوی خودایان لەسەر دەبرێ، لەکاتی سەربڕینیاندا. لە صەحیحەینا هەیە: کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} قوربانییەکەی خۆی سەربڕی فەرمووی: (بسم الله: بە پیرۆزی ناوی خودا).

بەڵام ئەگەر لەکاتی سەربڕیندا قوربانیکەر ناوی خودایش نەبا هەر دروستە، چونکە خاوەن نامەکان زۆرتر کە گیانلەبەر سەر دەبڕن ناوی خودا یاد ناکەن، لەگەڵ ئەوەیشا خودا سەربڕاوەکانیانی بە حەڵاڵ داناوە. دیسان لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: عائیشە {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێ دەکەوێ هەندێ کەسی نۆ موسوڵمان کە هێشتا بە جوانی فێری یاساکانی ئیسلامەتی نەبوون، ڕێ دەکەوێ ئەو جۆرە موسوڵمانانە گۆشتمان بۆ دەهێنن، نازانین کە ناوی خودایان لێ هێناوە یانا، جا ئایا لێی بخۆین یانا؟ فەرمووی: خۆتان ناوی خودا بهێنن و بیخۆن (د/ ب/ ن – تاج/ ٤ ل – ٢٨ ز – ٩) دەی ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بیسمیللاکردن سوننەتە نەك پێویست، چونکە ئەگەر لەکاتی سەربڕیندا ناوی خواهێنان پێویست بوایە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ڕێگەی خواردنی ئەو گۆشتەی نەدەدان.

٢) سەڵاواتدان لە دیداری خۆشەویست {درودی خودای گەورەی لەسەربێ} شافیعی {رەزای خودای گەورەی لێبێ} لەم بارەیەوە هۆشیاری راگەیاندووە کە درود لە دیاری پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} لەم کاتەدا سوننەتە بە قیاس لەسەر شوێنەکانی تر، لەبەر ئەوەیش کە خودای گەورە ناوو شۆرەتو پایەو شانی بەرزەوە کردووە، لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ – سورة الشرح – ٩٤/٤} (واتە: وە ناوو شۆرەتو پایەو شانی تۆمان بەرز کردۆتەوە، لە شایەتماندا، لە بانگدا، لە قامەتدا، لە تەحیاتا، لە وتاری خوازبێنیدا، لە زۆر بۆنەکانی تردا، ناوت کەوتە پاڵ ناوی خودا). لە راستیدا لە سایەی خواداوە لەهەرکوێ بە جوانی ناوی خودا دەبرێ ناوی جوانی پێغەمبەریش دەبرێ کەواتە لەم شوێنەیشا هەروا.

٣) رووکردنە رووگەو رووی سەربڕاوەکە بەرەو رووگە بێ لەکاتی سەربڕینیدا، چونکە ئەوێ باشترین لایە کە رووی تێ بکرێ، لەبەر ئەوەیش کە پێغەمبەریش {درودی خوای لەسەربێ} هەر سەربڕاوێ بە دەستی خۆی سەری دەبڕی رووی دەکردە رووگە.

٤) ئەڵڵاهو ئەکبەرکردن. چونکە ئەنەس {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: خۆشەویست {درودی خوای لەسەربێ} دوو بەرانی تەوی شاخداری کرد بە قوربانی بە دەستی خۆی سەری بڕین، وە ناوی خودای هێناو ئەڵڵاهو ئەکبەری کردو فەرمووی: بسم الله والله أكبر، وە قاچی دانا لەسەر لاملیان، وە لەسەر لای چەپ بەرەو قیبلە پاڵی خستن‌و بە دەستی چەپی سەری گرتن‌و بە دەستی راستی چەقۆکەی گرت، ئنجا سەری بڕین (ش/ د/ ت/ ن – تاج – ٤ ل – ٤٠ ف – ١ ز – ١٤).

٥) نزای گیرابوون، جابیر {ڕەزای خوای لێبێ} فەرموویی: ڕۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دوو بەرانی شاخداری تەوی خەساوی سەربڕیو کردنی بە قوربانی، لەو کاتەدا کە رووی دەکردنە قیبلە دەیفەرموو: (انی وجهت وجهی للذی فطر السموات والارض – علی ملة ابراهیم – حنیفا وما انا من المشرکین. ان صلاتی ونسکی ومحیای ومماتی لله رب العالمین. لا شریك له وبذلك ارموت وأنا من المسلمین. اللهم منك ولك عن محمد وأمته باسم الله والله اکبر). واتە: وا من بە دڵێکی پاکەوە رووی خۆم دەکەمە ئەو کەسە کە ئەم ئاسمانانەو ئەم زەوییەی لە نەبوون دروست کردووە، من لەسەر ئایینە بێ گەردەکەی ئیبراهیمم و لە هەموو ئایینێکی پووچ و لە گشت بیرو باوەڕێکی بەتاڵ لام داوە، وە من بە هیچ جۆرێ لەو کەسانە نیم کە فرەخوان و هاوڕێ بۆ خودا بڕیار دەدەن، بێگومان نوێژو خواپەرستیم و ئاواو یاسای حەجکردنم و ژیانم و مردنم هەر بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیانەو بە دەستی ئەوەو پاداشم لای خۆیەتی، هیچ هاوبەشێکی نیەو من بەمە فەرمانم پێکراوە کەوا بە دڵێکی ساف و بێگەردەوە بڵێم من یەکێکم لە موسوڵمانان، پەروەردگارم! ئەمە هی خۆتەو بۆ خۆتەو لە تۆوە خەڵات کراوە بە من، وا منیش پێشکەشی دەکەمەوە بە خۆت!

دەیکەم بە قوربانی لە باتی موحەممەدو لە باتی گەلەکەی، بە ناوی خودا، خودا لە هەموو کەس گەورە ترە. ئنجا حەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} سەری بڕی. (د - بە رشتەیەکی باشکە لە: سند صالح – تاج/ ٤ ز

– ١٥ ل – ٤٣ ف – ١) ئەمەش نزایەکی کورتە لەم بارەیەوە (**اللهم هذا منك واليك فتقبل مني**: خودا گیان! ئەمە خەڵاتی تۆیە، تۆ ئەمەت خەڵات کردووە بەمن، وا منیش پێشکەشی دەکەمەوە بە خۆت، ئەی خودایە! قەبووڵی بکە لێم) بەڵگەی ئەمەیش ئەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەکاتی قوربانی کردندا فەرموویەتی: (**باسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد ومن أمة محمد**: بەناوی خودا، خوایە گیان! ئەم قوربانییە قەبووڵ کە لە موحەممەد خۆیو لە کەسوکاریو لە نەتەوەی) (م/ د/ ت/ ن – تاج/ ٤ ل – ٤١) نەتەوە: واتە: ئوممەت.

٦) سوننەتە خۆی ئاژەڵەکە سەر ببڕێ، ئەگەر بزانێو بتوانێ، لەمەدا حەزرەت دەکا بە سەرمەشق بۆ خۆی بەڵام ئەگەر خۆی نەیدەزانی با ئاژەڵەکە بداتە دەست جێکار (وەکیل)و خۆی ئامادەبێ لەسەری، لەکاتی سەربڕینیدا چونکە فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): ئەی فاطیمە! هەستە لەسەر قوربانییەکەت حازربە بە یەکەم دڵۆپی خوێنەکەی خودا لە هەموو گوناهێ کە لەوەوپێش کردووتە لێت خۆش دەبێ وە بڵێ: (**ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لا شريك له وبذلك أمرت وأنا اول المسلمين**).

## ٣٧٣) چی لە قوربانی دەکرێ؟

قوربانی دوو جۆری هەیە: قوربانی سوننەتو قوربانی پێویست، یا نەزرکراو، جا قوربانی پێویست هەر کە ناوی قوربانی لێهێناو نەزری کرد ئیتر لە ملکی قوربانیکەر دەردەچێ، تەنانەت ئەگەر بیفەوتێنێ

دەبێ بیبـزێرێ، کاتێکیش سـەری بـڕی دەبـێ گشت گۆشـتەکەی بکا بـە خێرو بیبەخـشێتەوە بەسـەر هـەژارانا، نابـێ نـەخۆی نـە کەسـێ ژێـواری لەسەری بێ لێی بخۆن، نابێ بەشـی دەوڵەمەنـدیـشی لێ بـدات، بـە قیـاس لەسـەر تۆڵـەی نەچـیرو خوێنـە پێویـستەکان، کـە کـەمو کـوڕی حـەج و عەمرە پڕ دەکەنەوە (دماء الجبرانات) (بڕوانە: فیقهی ئاسان ب – ١ ل – ٣٧٤ هەتا ل – ٣٨٧ – وەرگێـڕ) مەبەسـت لـە هـەژار کەسێکە زەکاتی پـێ بشێ.

تەنانەت ئەگەر نەزرکەرەکە لێی خوارد، یا هەنـدێکی لێ هێـشتەوە هەتا فەوتا دەبێ بیبژێرێ، چونکە لە دەستەبەریی ئەودایە، لەبەر ئـەوە دەبـێ، بـە هاکـەی ببـژێرێ، گوتراویـشە: دەبـێ وێنـەی ئـەو گۆشـتە کـە خواردوویەتی یا فەوتاوە پەیدا بکاو بیبەخـشێ بـە هـەژاران، بەهـەرحاڵ لە سەری نیـە کـە لـە باتـی ئـەو فـەوتاوە ئـاژەڵێکی تـر بکـا بـە قوربـانی، چـونکە قوربانییەکـەی کـردووە. ئەمـەیش چـۆنێتیی بـەکارهێنان (تەصەرووف)ی قوربانی سونەتە:

هەر قوربانییەك کە سونـنەت بـێ، سـونـنەتە کـە خاوەنەکەی لێـی بخوا، بەڵکوو گوتراویشە: پێویـستە کـە لێـی بخـوا، چـونکە لەسـەر قـسەی ئـەم گوتیـاری فـەرمان لـەم ئایەتـەدا بـۆ پێویـستبوونە کـە دەفـەرموێ: {فَكُلُواْ مِنْهَا} بـەڵام ڕای دروسـت ئەوەیـە: کـە خـواردن لێـی سـوننەتە، بەپێی ئایەتی {وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُم مِّن شَعَائِرِ اللَّهِ – سورة الحج – ٣٦/٢٢} ئەوەتا بـەپێی ئـەم ئایەتـە قوربـانی دانـراوە بـە بـەهرە بـۆ مرۆڤ نەوەك بە ئەرکی سەرشانی!

به پێوەر (قیاس)ی حەوتمیش بیٚ خواردن لە گۆشتی قوربانی سوننەتە نەك پێویست. ئەیسە باشتر ئەوەیە کە گشتی بکا بەخێر، چەند پارووییەکی نەبێ بۆ پیرۆزی بیخوا. بەڵام ئەگەر نەیویست هەمووی بکا بەخێر چی بکا باشە؟ گوتراوێ دەفەرموێ: نیوەی بخواو نیوەی بکا بە خێر، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ – سورة الحج – ٢٨/٢٢} (واتە: جا خۆیشتان لێی بخۆنو دەرخواردی گیرۆدەی نەدارایشی لێ بدەن). ئەوەتا ئایەتەکە کردوویەتی بە دوو نیوە، بەڵام لەکاتی وادا دروستترین ئەوەیە: بیکا بەسێ بەشی یەکسانەوە، سێیەکی بخوا، سێیەکی بکا بە دیاری، سێیەکی بکا بە خێر، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ – سورة الحج – ٣٦/٢٢} واتە: جا خۆیشتان لێی بخۆنو بەشی هەژاری خاوەن قنیاتو بەشی سواڵکەریشی لێ بدن).

ئەوەتا ئەم ئایەتە گۆشتی قوربانی دەکا بە سێ بەشەوە، بەشێ بۆ خۆیان، بەشێ بۆ هەژاری قنیاتکەر، کە هەر چەندەی پێ بدەی پێی رازی دەبێ، بەشی بۆ دەردووزەکەرو ئەو گەدایانە کە بەر دەرگا بە مەردووم دەگرنو ورکی پشکی قەوی دەگرن[1].

---

[1] هەژاری خەڵاتی خوایە، بەهرەیەکی گەورەیە بۆ کەسێ نرخی بزانێ، بەڵام مەبەست لە هەژاری تەمبەڵیو تەوەزەلیو دەستسپێتیو بێ کارەیی نیە. کاسبکار خۆشەویستی خودایە. مەبەست لە هەژاری کەم دەستیو بێ وەییو رازیبوونو قنیات کردنە بە بەشی خودا، هەژاری بەم واتایە کەلەپووری پێغەمبەرانو پیاو چاکانو زانا گەورەکانە، ئەمانە

بەس بە دڵو دەروون دەوڵەمەند بوون، سامان پەرست نەبوون، بوونو نەبوونیان پێوە دیار نەبووە. جارێ برکەیێ میوان چووینە ماڵی مەلاییێ، شەوو رۆژێ لەوێ ماینەوە، خزمەتێکی شاهانەیان کردین، دوایی زانیمان کە مامۆستا بۆ خزمەتی میوانەکان کتێبی دەورو دەرسەکەی خۆی فرۆشتووە!

ئەم مامۆستا بەڕێزە مامۆستا مەلا رەسووڵی سەرگەڵوویی بوو، رەحمەت لە خۆیو لە کاك موحەممەدی جوانە مەرگی کوڕی بێ، جاوا بە یادی رەحمەت نادرن بۆ گیانی پاکی ئەوو کاوەی کوڕەو حەزروتی وەیسی قەرەنیو ئیمامی نەوەویو ئەهلی صوففەو گشت سۆفیو دەروێشێکی بێوەیی کە نارگری ناو تەکیەو خانەقاکان، بە تایبەتی بە یادی سۆفییە بێوەییەکانی خانەقای بیارەوە کە خۆم بە چاوی خۆم زوهدو تەقواو بەرەکەتیانم لەسەردەمی شێخی عەلائەددینا دیوە {رەزاو رەحمەتی خودای گەورەو مەزن لە هەموویان بێ} را لێرەدا بەو یادەوە ئەم چامەیەتان پێشکەش دەکەم. بە تایبەتی پێشکەشی دەکەم بە هاوڕێو هاودەمو هاودەردو هاوخەمم، هاوسەری بێوەیو سۆفی مەشرەبم، کە ئومێد دەکەم لە کەرەمی خودا، کە بیکا بە نموونەیێ بۆ ئەو ژنە رووسووورە خوا ناسە دەرویش مەشرەبانە، کە ئەم چامەیە رەنگ دەداتەوە لەناو دڵو دەروونیاندا. رەحمەت لەو کەسەی بەهرە لەم کتێبە وەردەگرێ رەحمەت دەنێرێ بۆ دایکی سەڵاحو کەسوکاری، چونکە بەراستی زۆر خزمەتی ئەم کتێبانەی کردووە خودا پاداشی باشی بداتەوە. ئەی دایکی سەڵاح! ئەی حاجی زەکیەی مەلا کەریم عەلی! {رەحمەتی خودا لە خۆت و کەس و کارو مردوو زیندووت بێ}. بفەرموون لەگەڵ چامەکەدا:

هەزاری ساچاو بە بەشی خودا
پادشا لە چاویا مانەندی گەدا
رەنگە زەردەکەی کە پرشنگ دەدا
زەردە پەڕنییە، خۆر گزنگ دەدا
خۆشە بێوەیی چەتری سەرت بێ
کاڵای هەزاری بەرگی بەرت بێ!

نەخـەمی مـەزراو رانـە مـەڕت بـێ

نە ترسی گورگی دەشتو دەرت بێ

ئاسمـان لێفـەو زەوی بـەڕت بـێ

نە لەگەڵ کەسێ هەراو شەڕت بێ!

ئـالآی دەرویـشی لـە کەمـەرت بـێ

وەیسەکەی خۆمان بە رەهبەرت بێ!

ترسی روو زەردی لای سەروەرت بێ

کردەوەی باشی خۆت سوپەرت بێ!

دڵـی روونـاکی خـۆت خەفـەرت بـێ

چـرای رۆشـنی دەورو بـەرت بـێ!

تـا لـە ریسوایی سواڵ قوتـەرت بـێ

حـاڵو مـاڵێکی سـەرو بـەرت بـێ!

مزگـەوتێ نزیـک بـە رابـەرت بـێ

خـەڵوەگای گیـانی بـە خەبـەرت بـێ!

هـەڤاڵێ هـاوبیر قەلەنـدەرت بـێ

کـاتی پێویـستی هاوسـەنگەرت بـێ!

نـەک لەسـەر سینی بـرادەرت بـێ

کـە پشتی هـەڵکرد لـە زەرەرت بـێ!

نەفسێ چون دەبان پڕ جەوهەرت بێ

ژنێکی وەک خۆت بە هاوسەرت بێ!

**وەرگێڕ**

**نووری فارس حەمە خان**

**سلێمانی ١٨/٨/١٩٩٦**

هەیشە دەفەرموێ: قوربانیکەر لە قوربانی سوننەت بۆی هەیە هەم لێی بخوا هەم لێی دەرخواردی خەڵك بدا، هەم قایمەی لێ بکا، بەپێی ئەم فەرموودەیە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع {ڕەزای خوای لێبێ} فەرمووی: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئەو کەسەی لە ئێوە قوربانی دەکا نابێ لە پاش سێ شەو لە گۆشتی ئەو قوربانییە لە ماڵیدا بمێنێ، جا لە ساڵی ئاییندەدا عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمساڵیش وەك پاربکەینەوە؟ فەرمووی {درودی خوای لەسەربێ}: نەء، هەم خۆشتان لێی بخۆنو هەم بەشی خەڵکی تریشی لێ بدەنو هەم قایمە (ادخار)یشی لێبکەن، پار بۆیە وام گوت چونکە پار ساڵەکەی گرانەو نەهاتی بوو... (ش/ د/ ت/ ن/ تاج/ ٤ ل – ٤٥).

راجیایی هەیە لەو کەسانەدا کە لە قوربانی، دیارییان پێ دەدرێ، گوتراوە: ئەو هەژارانەن کە لەبەر دەروون بەرزی خۆیان، هەژاری لێیان بووە بە نەخشو وەك خشڵ دەیانڕازێنێتەوە، گوتراویشە: دەوڵەمەندانن. پێشەوا غەزالی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: سێیەکی قوربانی سوننەت بە دیاری دروستە بدرێ بە دەوڵەمەندو بە هەژاری دەروون بەرز!

## بزانە:

دروست نیە گۆشتو پێستو هیچ شتێکی تری قوربانی بفرۆشرێ، هەتا دروست نیە پێستەکەی لە جیاتی کرێ بدرێ بە قەسابەکە یا بە سەربڕەکە، بەڵکوو دەبێ کەوڵەکەیشی ببەخشێ، یا خۆی سوودی لێ وەربگرێ، وەك ئەوە بیکا بە مەشکەو کوندەو سۆڵو کاڵە، بەڵام لەم کاتەدا نابێ بیاندا بەکرێ.

شوێنی دابەشکردنی قوربانی شوێن‌و شاری قوربانیکەرە، لە بارەی گواستنەوەیەوە بۆ شوێنێکی تر دوو بۆچوون هەیە، دروست ئەوەیە کە ئەمیش وەك زەکات گواستنەوەی دروستە، وەك لە باسی زەکاتدا ئەمە رابوورد (بڕوانە: فیقهی ئاسان ب – ١ ل – ٣١٢ – وەرگێڕ).

## ٣٧٤) باسی حەوتم (عەقیقە):

(بڕوانە: مختصری صحیحی بوخاری – بە کوردی، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە/ ١٠٠ هەتا ١١٣).

حەوتم بە عەرەبی ناوی (عەقیقە)یە، کە ئەو مووەیە لەکاتی لە دایکبوونا وا بە سەری ساواوە، لە شەرعا ئەو ئاژەڵەیە کە لە رۆژی حەوتەما دەکرێ بە حەوتم بۆی، کە لە هەمان رۆژا سوننەتە مووی سەری بتاشرێ‌و بکێشرێ بە زێڕ یا بە زیوو بدرێ بە هەژاران. حەوتم سوننەتە، سەر بەڵگەی سوننەتبوونی ئەم فەرموودەیەتی {دروودی خوای لەسەربێ}: هەموو کوڕێ رێگەی پێ نادرێ کە تکاو شەفاعەت لە قیامەتدا بۆ باوك‌و دایکی بکا، ئەگەر بە منداڵی بمرێ، هەتا حەوتمی بۆ نەکرێ، هەق وایە لە رۆژی حەوتەیدا حەوتمی بۆ سەربڕن‌و سەری بتاشن‌و ناوی بنێن (ئەحمەد/ تیرمیذی. حاکم بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە). هەق وایە بۆ کوڕ دوو مەڕ یا دوو بزن یا مەڕو بزنێ بکرێ بە حەوتم، وە بۆ کچ مەڕێ یان بزنێ بکرێ.

بەپێی ئەم فەرموودەیە: ئوم کورزی ئەل(کعبیە) {رەزای خوای لێبێ} فەرمووی: حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: دوو مەڕ یا دوو بزن، کە

بۆ قوربانی دەست بدەن، بۆ کوڕ دەکرێن بە حەوتم، وە بۆ کچیش یەك مەڕ یا یەك بزن (د/ ت/ ن – ڕشتەی دروست) عائیشەیش {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێمان کردووە کە بۆ کوڕ دوو مەڕ یا دوو بزن بکەین بە حەوتم بۆ کچیش مەڕی یا بزنێ (تیرمیذی/ ئیبنو ماجە/ ئیبنو حەبان لە صەحیحی خۆیدا).

**بزانە:**

ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بە حەوتم دەبێ دەست بدا بۆ قوربانی، دەبێ لە تەمەن و بێ نەنگی و ساغیدا دەق وەك ئاژەڵی قوربانی وابێ بە پێوەرو قیاس لەسەر قوربانی. گەرچی حەوتم بە هەموو ئاژەڵێ کە دەست بدا بۆ قوربانی دروستە، وەك وشترو گاو مەڕو بزن و گامێش، وەرای دروسترین ئەوەیە کە وشترێ یا گایێ بۆ حەوتم لە مەڕێ یا لە بزنێ باشترە، کەچی هەیە دەفەرموێ: مەڕو بزن بۆ حەوتم لە وشترو گا خێرترە، گوایە ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە دەکا بە بەڵگەی بۆ چوونەکەی کە دەفەرموێ: دوو شات بۆ کوڕو یەك شات بۆ کچ – دانەر {ڕەزای خوای لێبێ} – شاتی بڕیوە بەسەر مەڕدا، وەقسەی ئەم قیلەیشی بەلاوە پەسەندە، گوایە ئەمە ڕەفت بە سوننەتە، چونکە لە سوننەتدا بۆ حەوتم دەق لەسەر (شاة) هەیە بەلام بەزەینم لەم شوێنەدا فیقهول مویەسەرو کیفایەتول ئەخیار زۆریان فەرقە، ئەمەی من نوسیومە هی کیفایەکەیە. دانەریش لە باتی ئەمە ئاوا دەفەرموێ: گەرچی حەوتم بەگشت ئاژەڵی، با مەڕیش نەبێ دادەمەزرێ، بەلام مەڕ بۆ حەوتم باشترە لە ئاژەڵی تر چونکە رووکاری سوننەت فەرمان بە مەڕ دەکا). وەکی تریش کەی

رووکاری سوننەت فەرمان بە مەڕ دەکا؟ سوننەت لەم شوێنەدا فەرمان بە (شاة) دەکا، دانەر بەبێ بەڵگە (شاة)ی بڕیوە بەسەر (شاة الضأن)دا، (شاة) لە زمانو لە شەرعو لە حەدیثا ئەمەیە کە نەوەوی لە مینهاجا لە باسی زەکاتدا دەفەرموێ: (والشاة جذعة ضأن لها سنة... أو ثنيّه معز لها سنتان – وەرگێڕ).

## ٣٧٥) سوننەتەکانی حەوتم:

١) سوننەتە لەکاتی سەر بڕینی حەوتمدا حەوتمکەر بڵێ: بسم الله اللهم هذا منك واليك، ئەوجا بڵێ ئەمە حەوتمە بۆ فیسارەکەس، ناوی حەوتم بۆ کراوەکە دیاری بکا.

٢) سوننەتە لەکاتی گزنگدانی خۆردا حەوتم سەر ببڕری.

٣) سوننەتە لە پێش سەربڕینی حەوتمدا مری منالەکە بتاشرێو بکێشرێ بە زێڕ یا بە زیودا، وە ئەو زێڕە یا ئەو زیوە بدرێ بە هەژارێ، یا بە کەسێ کە زەکاتی پێ بشێ. گوتراویشە: سەر تاشین بخرێتە پاش سەربڕینی حەوتم، چونکە بەدیمەن فەرموودەکە وا نیشان دەدا، کە سەرتاشین لە پاش سەربڕینە.

٤) هەروا سوننەتە ئەم ئاژەڵی حەوتمە بە کوڵاوی پێشکەش بکرێ بە مەردومو لەکاتی کوڵاندنەکەیا شیرینیی تێکەڵ بکرێ، بە نیازی نوقڵانەی باش، کە خوایاربێ منداڵەکەیش ئاوا رەفتاری شیرین دەبێ، سوننەتە کە ئێسقانەکانی نەشکێنن، باشتر ئەوەیە کە حەوتم بە کوڵاوی

ببەخشرێتەوە بەسەر هەژاناو بۆیان ببرێ بۆ جێگەو رێگەی خۆیان، شافیعی دەقی هەیە لەسەر بەخشینەوە بەسەر هەژاراندا، بەلام ئەگەر خوڵکیشیان بکا بۆ سەری قەیدی نیە.

٥) سوننەتە بە خورما یا بە شیرینی تر مەلاشووی شیرین بکرێ، بەلام بە خورما باشترە، چونکە پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} بە خورما مەلاشووی منالەکانی یاریدەرەکانی شیرین دەکرد.

٦) منال کە لەدایك بوو، سوننەتە پاش ئەوەی کە پێچرایەوە بانگ بدرێ بە گوێی راستیداو قامەت بخوێنرێ بە گوێی چەپیدا. حەسەنی کوڕی عەلی {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەر کەسێ خودا مندالێکی پێ بەخشی بانگ بە گوێی راستیدا بداو قامەت بخوێنێ بە گوێی چەپیدا شەوە (ئوم صوبیان) زیانی پێ ناگەیەنێ، واتە: شەوە نایگرێ (ئیبنو سوننی) ئوم صوبیان بە کوردی پێی دەگوترێ: هاڵ: شەوە، جنۆکەیەکە، شوێن منالی چلەو حەوتە دەکەوێو دەستی لێ دەوەشێنێ. گوتراویشە: ئەوەی کەوا مەشهوورە لەسەر چلەو حەوتە منال شەوە دەیگرێ، یا هال دەیباتەوە ئەوە جۆرە نەخۆشییەکە تووشی منالی تازە لە دایك بوو دەبێ، جنوکەو پەری نیە. داناگەری (حیکمەت)ی ئەوە کە بانگ دەدرێ بە گوێی منالا ئەمەیە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەموو ئادەمیزادێ _لەکاتی لە دایك بوونیدا - شەیتان بەسەرە پەنجەی دەژەنێ بە هەردوو تەنشتیدا. (ب) جا وا باشو لەبارە کە بە خوێندنی بانگ راوبنرێو دەربکرێ، وەك لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژی) شەیتان هەڵ دەتۆرێنێو جرت لێ دەدا، تا گوێی لە بانگەکە

نەبێ، جا کە بانگ تەواو بوو، دیسان دێتەوە تا قامەت دەکرێ بۆ نوێژ دووبارە هەڵ دەتۆرپێنێتەوە (ش/ د/ ت/ تاج/ ١ ل — ٢٢٢) ئەبو رافیع {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: کاتێ فاطیمە حەسەنی کوڕی عەلی بوو {رەزای خوایان لێبێ} پێغەمبەرم دی خۆی بانگی نوێژی هەڵدا بە گوێچکەیدا (ئەبو داوود/ تیرمیذی/ ئەحمەد، تیرمیذی بە دروستی داناوە) عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش {رەزای خوایان لێبێ} بانگی دەدا بە گوێی راستی منالەکانیداو قامەتی دەخوێند بە گوێی چەپیاندا. (ئیبنو لمونذیر).

## ٣٧٦) باسی پێشبڕکە (مسابقة)و تیرئەندازی (مناضلة)

پێشبڕکە ئەوەیە کە دوو کەس یا زیاتر ولاّخ غاربدەن لە ماوە (مسافە)یەکی دیاریدا بۆ ئەوەی دەربکەوێ کە کامیان زووتر دەگەنە ئەوپەڕی ئەو ماوەیە، بە کوردی پێی دەگوترێ: تەراتێن: قۆشمە: قۆچ: غارغارێن. ئەم جۆرەیان دروستە لەسەر گرەو بکرێ، واتە: هەر کەسێ بیباتەوە دروستە ماڵی لەسەر وەربگرێ.

تیرئەندازیش ئەوەیە دوو کەس یا زیاتر تیر یا تفنگ، یا شتێ وا، بتەقێنن تا دەربکەوێ کامیان نیشانەکە دەپێکن. سەر بەڵگە وا لە نامەو سوننەتدا، نامەی خوا دەفەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ ➡} (راڤەکەی لە باسی سەرانەدا رابورد) سوننەتیش دەفەرموێ: عوقبەی کوڕی عامیر {رەزای خوای لێبێ} فەمووی: گوێم لێبوو حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} لەسەر دوانگە دەیفەرموو:

مەبەست لە (قوة) بۆ ئەمڕۆی ئێمە، لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن – قُوَّةٍ} تیرئەندازیو تیرهاویشتنە، وە سێ جار ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە(*) (موسلیم/ د) ئیبنو عومەریش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} پێشبڕکەیەکی بەولاخی بەرزە سازدا، ئەومایەنو ئەسپانەی کە قاڵ بوونو پەروەردە کرابوون، بۆ قۆشمەپێکردن لە حەفیائەوە بەری دان، ئەوسەریان تەنییە تول وەداع بوو، ئەبوئیسحاق دەفەرموێ: گوتم بە مووسا: ئەو ماوەیە مەودای چەند دەبێ؟ فەرمووی: شەش حەوت میل دەبێ، وە ئەومایەنو ئەسپانەیش کە تەڕاڵ بوونو قاڵ نەکرابوون بۆ قۆشمە لە ئەنییەتول وەداعەوە پێشی بەردەدان، ئەو سەریان مزگەوتەکەی بەنی زورەیق بوو، گوتم: ئەو ماوەیە چەند دەبێ؟ فەرمووی: میلێ، یا شتێکی وا دەبێ، ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} خۆی یەکێ بووە کە لەم قۆچو قۆشمەوتەڕاتو تەراتینەدا بەشداری کردووە. (شەیخان/ تاج – ٨ ل – ١٠٢ ز – ٣٣) ئەنەسیش {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} وشترەمێنگەیەکی هەبوو، ناوی عەضباء بوو، بەرایی بە هیچ

---

(*) مەبەستی پێغەمبەر {درودی خودای لەسەربێ} ئەوە بووە کە هانی موسوڵمانانی سەردەمی خۆی بدا، لەسەر فێربوونی تیر ئەندازی، چونکە تیرئەندازی لەسەردەمی ئەودا لە جێگەی تەقەمەنیو چەکی دوورهاوێژی ئەمڕۆی ئێمە بووە، بەڵام قەت مەبەستی پێغەمبەر ئەوە نەبووە، کە هەتا هەتا هێزی سەرەکی لە شەڕو نەبەددا هەر شیروتیر دەبێ.

– وەرگێڕ –

٢٠٠٦/٩/٨

ولاخێ نەدەداو ولاخ نەبوو کە پێشی بکەوێ، ڕۆژێ عەرەبێکی دەشتەکی بە سواری وشترێکی تۆڕی بەربار لەولاوە هات پێشی عەضباء کەوت، موسوڵمانانیش ئەمەیان لەبەر گران بوو، کاتێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} هەستی بەوە کرد فەرمووی: ڕەوایەو بەڵێنە لەسەر خودا کە هەرشتێ لەم دنیابێ بەقایە، لووتی بەرزەوە بوو، سەری بەرزەوەکرد، خودا بدا لە لووتیو لە ئەنجامدا سەری ئەوی بکاتەوە! (بوخاری/ نەسائی/ تاج – ٨ ل – ١٠٤) لە سوننەتدا لە بارەی تیرئەندازییەوە فەرموودەی گەلێ زۆر هەیە وەك ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} لەلای دەستەیەکی ئەسلەمییەوە رابورد، نیشانیان نابۆوە، فەرمووی: ئەی نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەر! تیربهاوێژنو مەشق بە تیرو ڕمو چەك بکەن، چونکە لەکاتی خۆیدا با بەگەورەیشتان تیرئەنداز بووە!. (ب/ تاج – ٨ ل – ١٠٦).

دیسان دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەوەی فێری ڕمبازیو تیرئەندازی ببێ بەڵام لە پاشا وازی لێ بهێنێ ئەوە لە ئێمە نیە. یا فەرمووی: ئەوە لە خودا یاخی بووە. (موسلیم/ تاج – ٨ ل – ١٠٥).

## ٣٧٧) دروستە گرەویان لەسەر بکرێ:

ئەم پێشبڕکێو تیر ئەندازییە سوننەتنو دروستیشە کە برێتی (عیوەض: وەجەڵ) یان لەسەر وەربگیرێ، بەو شێوەیە کە باس دەکرێ. چونکە دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: گرەو لەسەر قۆشمەی ولاخی بەرزە دروستە (ئەبو نەعیم لە – أسماء الصحابە –دا گێڕاویەتەوە).

عەرزی حەزرەتی عوسمانیش کرا: ئەرێ ئێوە لەسەردەمی ژیانی حەزرەت خۆیدا بە ئاگاداری ئەو زاتە {درودی خوای لەسەربێ} گرەوتان دەکرد؟ فەرمووی: بەڵێ. (پێشەوا ئەحمەدو دارەقوطنیو بەیهەقی) لەبەر ئەوەیش کە ئەم دوو بابەتە وەرزشە سەرەڕای بەهرەی تریان دەبن بەهۆی خۆ ئامادەکردنی جەنگاوەران لەسەر خەباتو تێکۆشان.

پێشبڕکە دروستە بەم جۆرە ولاخانە بکرێ: بە ئەسپو بەماینو وشترو فیلو ئیسترو گوێرێژ. مەرجی پێشبڕکە ئەوەیە شوێنی راوەستانو خاڵی سەرەتای غاردان لەم پەڕی مەیدانەوە دیاری بکرێو نوختەی ئەوپەڕی ماوەکەیش دیاری بێ، وە مەودای مەیدانی هەردوو سوارەکە وەکوو یەك وابنو ئەسپی هەردوولایان دیاری بکرێ وە هەرکام لەو ئەسپانە لەوانەبێ پێش بکەوێ لەوی تریان، وە ئەندازەی پارە دیاری کراوەکەیش دیاری بێ.

چونکە ئەگەر ئەوپەڕی مەودا دیاری نەکرێ دەگونجێ کە ولاخەکان بپڕووکێن، چونکە پێشبڕکێ کەرەکان لەبەر ئەم دوو هۆیە تابتوانن ولاخەکانیان دەڕەتێنن:

**یەکەم**: تا سامانەکە مسۆگەر بکەن بۆ خۆیان.

**دووەم**: هەتا تانەی دۆڕان شوێنیان نەکەوێ! دیسان لەبەر ئەوەیش ئەگەر مەوداکە زۆر دووربێو ئەوپەڕی دیاری نەکرێ ئەستەمە بزانرێ کە کێ گرەوەکەی بردۆتەوە.

لە تیرئەندازیشدا مەرجە کە مەوداکە دیاری بکرێ دەبێ ماوە (مسافە)یەکی وابێ کە تیر بیگاتێ. هەروەها بە مەرج گێراوەکە ژمارەی

تیرهاویشتن دیاری بکریٚ، هەروا ژمارەی ئەو تیرانەیش کە نیشانەکە دەپێکن، وەك ئەوە بڵێن: هەرەیەکی بیست تیر تیٚ دەگرین، کاممان پێنج تیرمان لەو بیستە لە نیشاندا ئەوە دیباتەوە بە مەرجیٚ ئەوی ترمان لە پێنج تیر کەمتر لە نیشانەکە بدا، بەمە دەگوتریٚ (مبادرە) یا وەك ئەوە بڵێن: یەکی سەرو چل تیر تیٚ دەگرین، پێکانو لە نیشاندانی هەردوولا دەبژێرین، کاممان دوو پێکان (اصابە)ی زیاتر بوو، ئەوەمان گرەوەکە دەباتەوە، پێویستە ئەندازەی پارەکە یا برێتییە کە دیاری بکریٚ، هەروەها ئەندازەی درێژیو پانی نیشانەکە چەندەو چەند نیە، گەرەکە چۆنێتی پێکانی نیشانەکەیش دیاری بکەن ئاخۆ بەکام شێوە لەم شێوەکارانە بووە:

١) لێدانی رووت، کە ئەوەیە تیرەکە تەنیا لە نیشانەکە بدا بەڵام برینداری نەکا. بەمە بە عەرەبی دەگوتریٚ (قرع) واتە: کوتانۆ بەرکەوتن.

٢) سمین، کە ئەوەیە بیسمیٚ، بەڵام پێوەی گیر نەبیٚو دەمە تیرەکە بگەڕێتە دواوەو بکەوێتە خوارەوە، بەمە دەگوتریٚ: (خزق)[1].

٣) تێهەڵچەقین: پێوە گیربوون، کە ئەوەیە بچەقیٚ بە نیشانەکەداو پێوەی بگیرسێتەوە، بەمەیش دەگوتریٚ: (خسق)[1]. واتە تێهەڵچەقێنو پێوە شەتڵ بوون.

---

[1] خزق بخاء وزاء معجمتين (مغنی المحتاج - ج/ ٤ ص ٣١٦) کەچی لە کفایة الاخیارو الفقه الميسرو شەریعەتی ئیسلاما بە (خرق) بەخیٚو ڕێی بیٚ نوختە نووسراوە.

٤) کرتاندن، وەك ئەوە تیرەکە لە نووکی نیشانەکە بداو بیپەڕێنێ (خرم).

٥) دەرپەڕین، کە ئەوەیە تیرەکە لە نیشان بداو بیسمێو لەو دیوەوە دەرپەڕێ، بەمەیش دەگوترێ (مرق).

جا هەرکاتێ گرێدانی تیر ئەندازی بەرەهایی، واتە: بە موتڵەقی سازدرا دەبڕرێ بەسەر (قەرع)دا چونکە لە هەموویان ناسراوترە.

## بزانە:

## پێشبڕکە دروستە بە دوو جۆربێ:

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە ئەو کەسەکەماڵەکە بڕیار دەدا بۆ پێشکەوتوو غەیری ئەو دوو کەسەبێ، کە پێشبڕکەکە دەکەن، وەك پێشەوای موسوڵمانان، یا نوێنەری، یا یەکێ لە گەلی ئیسلام بڵێ پێیان هەرکامتان پێش بکەوێ ئەوەندە پارەی پێ دەدەم.

**جۆری دووەم:** ئەوەیە کە یەکێ لەم دوو کەسە، بە هاوڕێکەی بڵێ ئەگەر تۆ پێشکەوتی من ئەوەندە ماڵت دەدەمێ، وە ئەگەر من پێشکەوتم هیچم ناوێ. ئەم دوو جۆرە دروستە چونکە جارێ پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} چوو بۆ لای دوو تیپ لە ئەنصار تیرئەندازییان سازدا بوو، تیپێکیان بردبوویەوە لەوی تریان، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ}

---

(١) لە شەریعەتی ئیسلاما بە هەڵەی چاپ بە (فسق) نووسراوە.

- وەرگێڕ -

کارەکەیانی بەڕەوا دانا، وەکی تریش مەبەست بەوە پێك دێ، لە هەمان کاتدا ناشبێ بە قورمار، چونکە ماڵ دانەرەکە سوور دەبێ لەسەر پێشکەوتن هەتا ماڵەکەی نەدۆڕێنێ، ئەوی تریش سوور دەبێ لەسەر پێشکەوتن هەتا ماڵەکە بباتەوە. بەڵام ئەگەر هەردوو پێشبڕکێکەرەکان ماڵیان بڕیارداو بڕیاریاندا هەرکەسێ پێشکەوت هەمووی بۆ ئەوبێ ئەوە دروست نیە، چونکە دەفەرموێ (درووده خوای لەسەربێ): هەرکەسێ بە ئەسپێ پێشبڕکە بکا لەگەڵ دوو خاوەن ئەسپی تردا، وە دڵنیابێ لەوە کە خۆی پێش ئەو دوانەکەی تر دەکەوێ، چونکە ئەسپەکانی ئەوان هاوتای ئەسپەکەی ئەم ناکەن، ئەوە پێشبڕکەی وا قورمارەو نادروستە، بەڵام ئەگەردڵنیا نەبوو لەوە ئەوە دروستەو قورمار نیە لەبەر ئەوەیش چونکە مەعنای قوماری تیایە، چونکە قومار ئەوەیە یان بیبەیتەوە یان بیدۆڕێنی!

پێشبڕکە لەسەر راکردنو مەلەکردنو پاڵەوانبازی دروستە، بە مەرجێ لەسەر وەجەڵ نەبێ، بەپێی ئەم فەرموودەیەی کە عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەیگێڕێتەوە: دەفەرموێ: لە سەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا (درووده خوای لەسەربێ) بووم، بەراکردن بەپێ نەك بەغار بەسواریی پێشبڕکێم لەکەڵیدا کرد، من پێشی ئەو کەوتم! بەڵام لەوە دوا کە گۆشتن بووم پێشبڕکێم لە گەڵیدا کردەوە ئەمجارەیان ئەو لەمنی بردەوە، فەرمووی (درووده خوای لەسەربێ) ئەمە لەباتی بردنەوەکەی ئەو جارە!. (د/ ن/ ماجە. ئیبنو حیببانیش لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە).

پێشبڕکێ بە ولاخێ دەست نەدا بۆ جەنگ دروست نیە، وەك گاو شتی وا، هەروا لەسەر شەڕەبەرانو شەڕە کەڵەشێر دروست نیە، چ بە

خۆڕایی بن چ لەسەر پارە بن، هەروا لەسەر یاری شەترەنجو کاڵەمستێو گشت جۆرە یارییەکی تر دروست نیە. بڕیاری وەجەڵ لە تیرئەندازیدا وەکوو لە پێشبڕکەدا وایە بە هەموو درێژە پێدانیەکیەوە.

## ٣٧٨) باسی سوێند خواردنو نەزرکردن:

سوێند لە زمانا بە عەرەبی پێی دەگوترێ. یەمین، واتە: دەستی ڕاست، جا ئەم ناوە کرا بەناو بۆ سوێند، چونکە سوێند خۆرەکان لەکاتی سوێند خواردندا دەستی ڕاستیان دەنایە ناو دەستی ڕاستی برادەرەکەیان، گوتراویشە: بۆیە وا ناونراوە چونکە سوێندیش وەك دەستی ڕاست شت دەپارێزێ. سوێند بە عەرەبی ئەم ناوانەی هەیە (یەمینو حیلفو ئیلاءو قەسەم). لە شەرعا دووپات کردنەوەی کارێکە بە سوێند خواردن لە سەری بە زاتی خوای گەورە یا بە نیشانێ لە نیشانەکانی، سەر بەڵگە لەسەر سوێند لە ئایەتو فەرموودەدا زۆرە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ - سورة المائدة - ٨٩/٥} واتە: خودا لەسەر ئەو جۆرە سوێندانە موحاسەبەتان ناکا کە دێن بە سەردەمتاندا، بەبێ مەبەستو بەبێ ئەوە کە نیازی دڵی لەگەڵدا بێ بەڵام لەسەر ئەو سوێندانە موحاسەبەتان دەکا کە بە نیازی دڵ دایان دەمەزرێنن) وە دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً - سورة آل عمران - ٧٧/٣} وە دەفەرموێ: {وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ - سورة المائدة - ٨٩/٥} واتە: پارێزگاری سوێندەکانتان

بکەنو ڕێزیان بگرن، لەسەر شتی بە نرخو بێ نرخ وەك یەك سوێند مەخۆن). هەروا دەفەرموێ: {وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ – سورة المجادلة – ١٤/٥٨} وە دەفەرموێ: {لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ} لە سەرەتای باسی ئیلائەوە رابورد. وە دەفەرموێ: {وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ – سورة الأنعام – ١٠٩/٦} لە سوننەتیشدا فەرموودەی زۆر هەیە لەسەر باسی سوێند، وەك ئەوە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} سوێندی خواردو فەرموی: (سوێندم بە خودا هێرش دەبەمە سەر هۆزی قورەیش) یا وەك ئەوە فەرمووی: (هەرکەسێ سوێند دەخوا با یا بەخودا سوێند بخوا یا بە غەیری خودا سوێند نەخوا) یا وەك ئەوە کە ئیبنو عومەر {ڕەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: گەلێ جار پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئاوا سوێندی دەخوارد: لا ومقلب القلوب: نا، بەهەڵسووڕەێنەری دڵان).

## ٣٧٩) سوێند بەچی دادەمەزرێ:

سوێند دانامەزرێ تەنها بە زاتی خودا یا بە ناوێ لە ناوەکانی، یا بە نیشانەیێ لە نیشانەکانی نەبێ. بزانە ناوەکان سێ جۆرن:

**یەکەم:** ناوێکە تایبەتە بە خودای گەورەوە بۆ جگە لە خودا بەکار نایەت، وەك ئەڵلاو خوداو پەروەردگاری جیهانیانو خاوەنی ڕۆژی پاداشو دروستکەری جیهانو کردگارو ئەو زیندووەی کە هەرگیز نامرێ، یاهەر ناوێکی تر کە تایبەتی بێ بەزاتی خوداوە، وەك سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بە دەستە، ئەم جۆرە سوێندی پێ دادەمەزرێ،

ئیتر خوای سوێند خۆر بە رەها بیانڵی یا هەق مەبەستی خوای گەورەبێ، تەنانەت ئەگەر بڵێ: مەبەستم ناوی خودا نەبووە لێی وەرناگیرێ.

**دووەم**: ناوێکە تایبەت بە خودای گەورەوە، بەڵام زۆرتر بەبێ قەید بۆ زاتی خودا بەکار دەهێنرێ وەك: جەببارو حەقو رەببو موتەکەببیرو قادرو قاهیرو رەحیمو کەریمو رەززاقو وێنەی ئەمانە. ئەم جۆرە ناوانەیش سوێندیان پێ دادەمەزرێ مەگەر کابرا مەبەستی لێیان ناوی خودا نەبێ ئەوە دانامەزرێ.

**سێیەم**: ئەو ناوانەیە کە بۆ خوداو بۆ غەیری خوایش وەکوو یەك بەکار دەهێنرێن، وەك: زیندووو، مەوجوود، دارا، کەریم، بەخشندە، یا وێنەی ئەمانە. ئەوە نابێ بە سوێند مەگەر نیازی سوێندی پێ هەبێ، بەڵام فەرمایشتی هەرە دروست دەفەرموێ: بە هیچ جۆرێ سوێند بەم جۆرە ناوە دانامەزرێ، چونکە سوێند تەنیا بە ناوە مەزنە شکۆمەندەکان دادەمەزرێ، ئەم جۆرە ناوانەیش ئەو مەزناهیو شۆکۆمەندییەیانە نیەو خاوەنی قەدرو رێزنین هەتا سوێندیان پێ بخورێ. ئەوەوی دەفەرموێ: سوێند بەمانەیش دەخورێ، چونکە بۆ خوداو بۆ غەیری خودایش بەکار دەهێنرێن، کەواتە هەرکاتێ نیازی پێی سوێند بە خودا بوو دادەمەزرێ، وە ئەوەی کە دەڵێن: ئەم ناوانە رێزیان نیە ئەو قسەیە قەبووڵ نیە، بە غەویش ئەم فەرمایشتەی ئەوەوی بە راستی تەواو دادەنێ، هەروەها خاوەنی کتێبی (التقریب)و ئەبو یەعقووبیش.

**بزانه:**

سەمیع‌و بەصیرو عەلیم‌و حەكیم (واتە: بیسەرو بیناو زاناو دانا) لە ناوەكانی بەشی سێیەمن.

## ٣٨٠) بەستنی سوێند بەخێركردنەوە:

وەك ئەوە كەسێ بڵێ: ئەگەر خودا نەخۆشەكەمی چاك كردەوە سوێندبێ مەڕێ بكەم بەخێر. ئەم مەسەلەیە لە لایەكەوە لە سوێند دەچێ‌و لە لایەكەوە لە نەزر دەچێ، چونكە وەك سوێند هاندان‌و قەدغە بوونی تیادایەو وەك نەزریش لە ئەستۆگرتنی تیادایە.

زاناكان لە بارەیەوە راجیاییەكی بەخشەوەبوویان هەیە، سێ فەرمایشتی لێ دروست دەبێ.

**یەكەم:** لە سەریەتی ئەوەی لە ئەستۆی كرتووە جێبەجێی بكا، لەم نموونەی بەردەستماندا دەبێ مەڕەكە بكا بە خێر، ئەگەر نەخۆشەكەی چاك بۆوە، چونكە پەرستنێكی رەوای لە ئەستۆی گرتووە بە رابەر بە مەرجێكی رەوا.

**دووەم:** كفارەتی سوێندی دەكەوێتە سەر، بەپێی فەرموودەكەی {دروودی خوای لەسەربێ}: كەفارەتی نەزر كەفارەتی سوێندە (موسلیم) (بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج ١١ ص ١٠٤ وەرگێڕ) سەعیدی كوڕی موسەییب {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: دوو برا كەلەپوورێكیان لە نێواندا هەبوو، یەكێكیان بەوی تریانی گوت: با بەشی

بکەین، ئەویش گوتی: ئەگەر جارێکی تر داوای ماڵ بەشکردنم لێبکەی هەرچی ماڵم هەیە نەزری کا بەبێ! عومەریش {رەزای خوای لێبێ} پێی فەرموو: کەعبە هەوەجێی بە ماڵی تۆ نیە، کەففارەتی سوێندەکەت بدەو قسە لەگەڵ براکەتا بکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: سوێندت ناکەوێ، وە نەزکردنی گوناهو نەزرکردنی بڕینی ڕشتەی خزمایەتیو نەزرکردنی شتێ کەهی تۆ نەبێ دانامەزرێن (تاج/٣ ل — ٣٤٠) شتێ وا لە عائیشەو ئومم‌و سەلەمەو صەفیەو ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە وەگێڕراوەتەوە {رەزای خودا لە هەموویان بێ} وە کەسیش ڕاجیایی لەگەڵیاندا دەرنەبڕیوە، ڕافیعی {رەحمەتی خوای لێبێ} ئەمەی بە دروست داناوە، وە کۆمەڵێکیش بە ئێجگاری سەلماندوویانە، چونکە ئەم جۆرە گوتەیە لە مەبەستا سوێندە.

**سێیەم**: کابرا خۆی سەرپشکە دەتوانێ ئەوە جێبەجێ بکا کە لە ئەستۆی گرتووە، دەتوانێ تەنیا کەفارەتی سوێند بداو بەس، چونکە ئەم مەسەلەیە لە لایەکەوە لە نەزر دەچێ‌و لە لایەکەوە لە سوێند دەچێ، وەك لە سەرەتای ئەم زنجیرەیەوە ڕوون کرایەوە، هەندێ لە شێوەکاری ئەم مەسەلەیە پێی دەگوترێ: نەزری ڕقەبەری، واتە: نەزری (لجاج) وەك ئەوە کە بڵێ: ئەگەر قسەم لەگەڵ فیسارە کەسکرد، یا چوومە ماڵی، یا بڵێ: ئەگەر نەڕۆیشتم بۆ سەفەر یا ئەگەر چووم بۆ سەفەر، یا شتێ ئاوا بڵێ، نەزربێ لە سەرم دوو مانگ بەڕۆژووبم، یا دوو ڕکات نوێژ بۆ خودا بکەم، یا خێرێ بکەم، یا حەجێ بکەم، یا شتێ ئاوا لە ئەستۆ بگرێ‌و لە پاشا نەزر پێوە بەستراوەکە بکات. بەڵام ئەگەر کەسێ بڵێ: ئەگەر خودا نەخۆشەکەمی چاك کردەوە مەڕێ بکەم بەخێر ئەوە

لەبەشی نـەزری (تبـرُر)ە، واتـە نـەزری چاکە کاری، یـا نـەزری دڵخـواز: ئەگـەر کەسـێ بڵـێ: ئەگـەر ئـەو شـتە بکـەم نـەزربێ لەسـەرم کـەفارەتی سوێندێ بدەم، ئەوە بەبێ راجیایی دەبێ کـەفارەتی سـوێند بـدا، چـونکە نەزر لەسەر کراوەکەو کەفارەتی سوێند یەك شتن.

## ٣٨١) سوێندی بێبایەخ (لغو الیمین):

سـوێندی بێبایـەخ هیـچی لێدروسـت نابێـت، خـودایش لەسـەری موحاسەبەی سوێند خۆرەکە ناکا. شێوەی ئەم سوێندە وەك ئـەوە کەسـێ بـەبێ نیـازی دڵ بەسـەردەمیدادێو دەڵـێ: نـە بـەخودا وانییـە، بـەرێ بـەخودا وایـە، بەتایبـەتی لـەکاتی تـوڕەیی‌و پەلەپـەل‌و گـەرمبوونی گوفتوگـۆدا، کە زۆرتـر مـرۆڤ لـەم کاتانـەدا ئاگـای لەسـەرو بـەری قسەی خۆی نییە. ئەم جۆرە سوێندە نە سوێندی پێ دادەمـەزرێ نـە کـەفارەتی هەیە.بەپێی ئەم بەڵگەیە: عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) فەرمووی: ئـەم ئایەتـە: {لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ} لە شانی ئـەو کەسـانەدا هاتۆتـە خـوارەوە کـە لـەکاتی گوفتوگـۆدا بەسـەر دەمیانـادێو بەسـەر زارەکی دەڵـێن: نـە بەخودا وانییە، بەرێ بـەخودا وایـە. (بوخـاری) ئیبنـو عەبباسـیش (ڕەزای خوایـان لێبـێ) فەرموودەیـەکی وەك ئەمـەی عائیـشەی هەیـە. لەپایـەی ئەمەدایە ئەوەیش کە بیـەوێ بڵـێ: بـەخوا نـەریمان ئـەوەی کـردووە، لـە باتی ئەوە زمانی تەتەڵە بکاو بڵێ بەخوا کامەران ئەوەی کردووە.

ئەگەر کەسێ گووتی: ئەگـەر ئـەو شـتەم کردبـە جوولەکـەبم یابـە گـاوربم، یالـە خـوا یالـە پێغەمبـەر یالـە ئـاینی ئیـسلام بـێ بـەریبم، یـا

بێبەش بم، یا بەشم بە ئیسلامەوە نەبێت ئەوە نابێ بە سوێند، نە کەفارەتی هەیەو نە سوێندی دەکەوێ. چونکە ناوی خوداو نیشانەی خودای تیادا نییە. سوێند بە نیشانەیێ لە نیشانەکانی خودا وەك ئەوە بڵێ: بە گەورەیی خودا، بە فەرمایشتی خوا، بە توانایی خودا، بە زانستی خوا، بە خواستو ویستی خوا. وەکی تریش ئەم جۆرە ئاخاوتنە کە بڵێ لە جێی ئاگر پەرستبم ئەگەر ئەوە بکەم حەرامە، جا ئەگەر مەبەستی دوورخستنەوەی خۆی بێ لەکردنی ئەو کارە ئەوە پێی کافر نابێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی رازی بوون بەو میللەتە یا بەو کفرە بێ لەکاتی کردنیدا ئەوە دەستبەجێ بە گوتنی ئەم جۆرە قسەیە بێ بڕوا دەبێو فڕی بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ، لەبەرئەوە دەبێ یەکسەر بڵێ: (لا الـه الا الله و محمـد رسـول الله)و داوای لێبووردن لە خودا بکا، هەروەك پێویستە تەوبەشی لێ بکا، چونکە پەشیمان بوونەوەو تەوبە کردن لە هەموو قسەیەکی نادرووست پێویستە.

**بزانە:**

سوورگە (مەدار)ی سوێند کەوتنو سوێند نەکەوتن دەگەڕێتەوە بۆ خوازەی ئەو گفتەی کە سوێندەکە پەیوەندی پێوەی هەیە. جا ئەگەر سوێندی خوارد لە فیسارنادا، یا شتی پێ نافرۆشێ، یا ئەو شتەی لێ ناکڕێ، دەتوانێ جێدار (وەکیل) بگرێ هەتا ئەو ئیشانە بکا، وە بەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە خوازە (موقتەزا)ی قسەکەی ئەوەیە کە خودی خۆی ئەو ئیشە نەکا، وە لە ڕاستیدا خۆیشی نەیکردووە جێدارەکەی کردوویەتی. بەڵێ ئەگەر مەبەستی واتای مەجازی بێو سوێند لەسەر

ئەوە بخوا کە ئەو شتە نابێ ببێ بە ملکی ئەو ئەوە سوێندی دەکەوێ ، خوای خۆی بیکڕێ یان کەسێکی تر بۆی بکڕی، چونکە خۆی کارەکەی لە خۆی گران کردووە. ئەگەر سوێندی لەسەر وو شت خوارد، وە یەکێکیانی کرد، بەوە سوێندی ناکەوێ، چونکە سوێند لەسەر خوراوەکە بەتەواوی نەکراوە، هەروەك چۆن سوێند بخوا کە ئەو دوو کولێرەیە ناخوا، ئەگەر یەکێکیان بخوا سوێندی ناکەوێ. لەسەر ئەم پێوەرە مەسەلەی تری لەم بابەتە زۆر حەل دەکرێ.

## ٣٨٢) کەفارەتی سوێند:

کەفارەت وشەیەکی عەرەبییە لە زمانا واتە: داپۆشینو پەردە، بۆیە بە کەفارەتی گوناهیش دەگوترێ کەفارەت چونکە گوناهەکە دادەپۆشێ، بەهەمان واتا بە کافریش دەگوترێ کافر، چونکە نیعمەتی خودای خۆی حەشاردەداو لە ژێر پەردەی بێباوەڕیدا دەیشارێتەوە، کە ئەو نیعمەتە حەشاردراوە بریتییە لە باوەڕ بەخودا، کە سەرچەشمەی گشت خۆشیو نازو نیعمەتو بەهرەیەکە.

جا هەرکاتێ کەسێ سوێندی کەوت پێویستە لەسەری کەفارەت بدا چونکە زاتی مەزن دەفەرمووێ: {ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ – سورة المائدة – ٨٩/٥} . کەفارەتی سوێند لە سەرەتاوە سوێند کەوتوو سەرپشکە لە کردنی یەکێ لەم سێ شتەی کەلەم ئایەتەدا باس کراون: {فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ

أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ -سورة المائدة - ٨٩/٥}

(واته: کەفارەتی سوێندی دامەزراو کاتێ کە شکانتان ئەوەیە خۆراکی دە مسکێن بدەن لە میانەی ئەو خواردەمەنییەی کە دەیدەن بە خێزانی خۆتان، یا بەرگی دە مسکێن بدەن لە میانەی ئەو جلو بەرگەی کە دەیکەن بۆ خێزانی خۆتان یا بەندەیێ ئازاد بکەن) جا ئەگەر سوێند کەوتوو توانای یەکێ لەم سێ شتەی نەبوو پێویستە سێ رۆژ بەرۆژوو بێت، وە مەرج نییە ئەو رۆژانەیش لەسەر یەك بن، بەلام سوننەتە، ئەمەیە کە دەڵێن: کەفارەت لەسەرەتاوە سەرپشکییەو لە کۆتاوە ریزلێگرتنە، بەلام دروست نییە نانی پێنج کەس بدا لەگەڵ بەرگی پێنج کەسدا یان نیوبەندە ئازاد بکا لەگەڵ کردنی بەرگی پێنج کەسا،چونکە خودا کردووینی بە سەرپشك لە نێوانی سێ شتدا، دەی ئەگەر شتی وا بریار بدەین شتەکان دەبن بە چوار، واتە: کەفارەتەکە نابێ لە دوو جۆر لەم سێ جۆرە بێ، چونکە شتی وا بە پێچەوانەی دەقی ئایەتەکەیە. مەرجی ئەو بەندەیە کە بۆ کەفارەتی سوێند ئازاد دەکرێ وەك مەرجی بەندەی کەفارەتی ظیهار وایە. مەرجی خۆراك دانیش ئەوەیە هەر هەژارەی موددێ لە دانەوێڵەی شتێ کەلە زیاتری پێبژیوی شوێنی کابرابێ، هەرچیش ناوی جلو بەرگ بێ دەست دەدا بۆ کەفارەتی سوێند، وەك کراسو کەواو دەرپێو پشتێنو مێزەرو جبەو سەرپۆش، چونکە خودای یاسادانەر ناوی جلو بەرگی بە رەهایی هێناوە، لەبەرئەوە ئەوەی پێی بگوترێ پۆشاك بۆ کەفارەتی سوێند دەست دەدات، دەی ئەمانەیش هەموویان بەر پۆشاك دەکەون.

ئەگەر کەسێ سوێندی خوارد شتێ نەکا لە پاشا لەبیری نەبوو کە سوێندی خواردووەو ئەوشتەی کرد ئەوە رای دروست ئەوەیە کە سوێندی ناکەوێ، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ - سورة الأحزاب - ٥/٣٣} هەروا بەپێی ئەم فەرموودەیەی (درووده خوای لەسەربێ): خودا لەبەر خاتری من لەسێ کاری نەتەوەکەم چاو پۆشی دەکا: لە هەڵەو لەبیرچوونو لە شتێ بە زۆر پێیان بکرێ. دەی سوێندیش بەر ئەم گشتایەتیە دەکەوێ.

## ٣٨٣) بڕیاری نەزر (فووتوو):

نەزر لە زمانی عەرەبا واتە: بەڵێن یا هەڕەشە، لە شەرعا بەڵێنی باشە نەك خراپ، ماوەردی دەفەرموێ: بریتییە لە ئەستۆ گرتنی کردنی چاکەیێ کە لە خۆیدا بە پێی بنەمای شەرع پێویست نەبێ. سەر بەڵگەی ئەم باسە ئەم ئایەتەیە: {يُوفُونَ بِالنَّذْرِ - سورة الإنسان /٧} (واتە: وەفا بە نەزر دەکەن) وە ئەم فەرموودەیشە کە دەفەرمووێ (درووده خوای لەسەربێ): کەسێ نەزری کرد کە فەرمانبەری خودا بکا ئەوە با نەزرەکەی بەجێبێنێ، وە کەسێ نەزری کرد کە بێ گوێی خودا بکا ئەوە با نافەرمانی خودا نەکاو نەزرەکەی نەباتە سەر (بوخاریو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە).

راجیایی هەیە لە بڕیاری نەزردا، گوتراوە: ناباشە، گوتراویشە: خێرێکی چاکەو حەڵاڵە.

## ٣٨٤) نەزر دوو بەشی هەیە:

١) نەزری رقەبەری، یا نەزری کەللەرەقی (لجاج) ئەمە لە پێشەوە رابورد.

٢) نەزری دڵخواز، یا نەزری چاکەکاری (تبرُر) ئەم بەشە دوو جۆری هەیە:

**یەکەم:** پێی دەگوترێ نەزری بەرابەری پاداش، کە بریتییە لەوە نەزرکەر خێرێك بگرێتە ئەستۆی خۆی‌و بیبەستێ بە دەستکەوتنی دەستکەوتێکەوە، یا بیبەستێ بە رزگاربوونەوە لە مەینەتێ، وەك ئەوە بڵێ: ئەگەر خودا نەخۆشەکەمی چاککردەوە، یا منداڵێکی پێبەخشیم، یا رزگارم بوو لەم مەینەتە نەزربێ لەسەرم رۆژوو بگرم، یا نوێژێ بکەم، یا خێرێ بکەم لەبەر رەزای خودا، جا هەرکاتێ کە نەزر پێوە بەستراوەکە هاتە جێ دەبێ نەزر کراوەکە بکا، هەر ئەوەندە بەسە کە بڵێ ئەگەر ئەو شتەم بۆ بوو، یا لەو مەینەتە رزگارم بوو خێرێکم لەسەربێ، مەرج نییە کەبڵێ بۆ خودا، یا لەبەر رەزای خودا. چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: {وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ - سورة النحل - ٩١/١٦} (واتە: ئەی موسوڵمانەکان! هەر پەیمان‌و بەڵێن‌و نەزرێ دەکەن، بەمەرجێ ئەوەی بڕیاری کردنی یا نەکردنی دەدەن‌و لەسەر خۆتانی بڕیار دەدەن بەپێی یاسای خوابێ‌و لە ئاینی ئیسلاما دروست بێ بەجێی بهێنن) هەروا دەفەرمووێ: (ومنهم من عاهد الله لئن آتانا من فضله لنصدقن ولنكونن من الصالحين- تەوبە - ٧٥/٩) جارێ ژنێ لە پاپۆڕێکا لە دەریادا نەزری ئەوە دەکا: ئەگەر

خـودای گـەورە رزگـاری بکـا مانگـێ بـەرۆژووبێ، کاتـێ رزگـاری بـوو رۆژووەکـە نـاگرێ هـەتا دەمـرێ، جـا کـچەکەی یـا خوشـکەکەی دێتـە خزمـەتی حـەزرەتو حاڵەکـەی عـەرز دەکـا، پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} فەرمانی پێکرد کە خۆی رۆژووە نەزر کراوەکەی بۆ بگرێ. (ئـەبو داود/ نەسائی).

**دووەم:** ئەوەیە کە نەزر کـەر خێـرێ بگرێتـە ئەسـتۆی خـۆی بـەبێ بەسـتنی بـە هـیچ مەرجێکـەوە، وەك کەسـێ بڵـێ: نـەزربێ لەسـەرم دوو رکات نوێژ بۆخدا بکەم، یا سێ رۆژ بەرۆژووبم، یا بەنـدەیێ ئـازاد بکـەم، یـا دوو جـزم قورئـان بخـوێنم، لـەم جـۆرەدا دوو فەرمایـشت هەیـە رای دامـەزراو (راجـح) ئەوەیـە کەئـەم جـۆرەیش وەك جـۆری یەکـەم دەبـێ جێبەجێ بکرێ چونکە ئەم فەرموودەیـە بـە رەهـای فـەرمانی دەکـا بـە جێبـەجێکردنی گـشت نـەزرێکی دروسـت: (کەسـێ نـەزری کـرد کـە فەرمانبەری خـودا بکـا....تـاد) گوتراویـشە: مـەرج نییـە کـە ئـەم جـۆری دووەمە جێبەجێبکرێ، چونکە بە خـۆڕاییو بـێ بەرانبـەرە، وەك چـۆن گرێدانە بێ بەرابەرەکان وەك بەخشینو دیاری هـەتا وەرنـەگیرێن مـەرج نیە جێبەجێ بکرێن. هەرکاتێ بە رەهایی گوتی نەزر بێ ئـەوە بکـەم وە ئەندازەی نەزر کراوەکەی دیاری نەکرد، وەك ئەوە بڵـێ نـەزربێ لەسـەرم خێرێبکەم یان رۆژوو بگرم، ئەوە بەوەی پێی بگوترێ خێرکردن بـا زۆر کـەمیش بـێ، یـا رۆژوو گـرتن بایـەك رۆژێـش بـێ نەزرەکـەی جێبـەجێ دەبێ، کەفارەتیشی لەسەر نییە.

## ٣٨٥) نەزرکردنی گوناه دانامەزرێ:

نەزرکردنی نافەرمانی خودا، وەك ئەوە بڵێ نەزربێ لەسەرم بادە بنۆشم، دروست نیە، چونکە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): (هەرکەسێ نەزری کرد کە بێ فەرمانی خودا بکا با نەزرەکەی جێبەجێنەکا). (موسلیم/ بوخاری) دەی ئەگەر کە نەزر بکا کەسێ مەی بخواتەوە یا داوێنپیسی بکا یا کەسێ بکوژێ، یا بەبێ دەست نوێژ نوێژبکا ئەوە نابێ نەزرەکەی جێبەجێ بکا، بەڵکوو جێبەجێکردنی نادروستەو تاوانە، وە لەسەر رای بێگومانی جەماوەری زانایان کەفارەتیشی لەسەر نییە.

## ٣٨٦) نەزرکردن کردنی یا نەکردنی شتی رەوا دانامەزرێ:

مەبەست لە رەوا موباحە، کەسێ کارێکە کردنو نەکردنی چونیەك بێ، وەك خواردنو خواردنەوەو خەوتنو راوەستانو دانیشتن، ئەم جۆرە کارانە لەبەر چاو شیرین نەکراون، جا خوای نەکردنیان نەزر بکا، وەك ئەوە بڵێ: نەزر بێ هەنار نەخۆم، یا کردنیان نەزر بکا وەك ئەوە بڵێ: نەزر بێ قاوە بخۆم، نەزرەکەیان دانامەزرێ، چونکە ئەم جۆرە شتانە پەرستن نینو نابن بە مایەی نزیکبوونەوە لە خوا، لەبەر ئەوەیش جارێ خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) وتاری دەدا، پیاوێکی دی لەبەر هەتاوەکە راوەستابوو، پرسی: بۆچی ئەو پیاوەوا رەق راوەستاوە؟ عەرزیان کرد: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، ئاه (نەزر)ی کردووە کە بەپێوە لەبەر خۆر رەق راوەستێو دانەنیشێو نەچێتە بەر سێبەرو قسەنەکاو

لە هەمانکاتدا بەرۆژووش بێت. فەرمووی {دروودی خوای لەسەربێ}: فەرمانی پێبکەو لەزمانی منەوە پێی بڵێ: کە قسەبکاو بچێتە بن سێبەرو دابنیشێ بەڵام رۆژووەکەی تەواو بکا (ش/ تاج/ ٣ل - ٣٣٩).

ئەگەر کەسێ ئاه (نەزر) بکا کە لەگەڵ مرۆڤدا قسە نەکا، نەزرەکەی دانامەزرێ، چونکە شتی وا ناڕەوایە، لەبەر ئەوە کافارەتیشی نیە. لە بوخاری شەریفدا دەفەرموێ: ژنێ بە خامۆشی خەریکی حەج بوو، ئەبو بەکری صەدیق {رەزای خوای لێبێ} پێی فەرموو: قسە بکە شتی وا ناڕەوایە. هەروەها ئەگەر کەسێ مۆمێ یا چرایێ نەزر بکا کە لەسەر گۆڕێ بگرێ دانامەزرێ، چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} نەیی لە شتی واتە: دەکاو دەفەرموێ: نەفرینو لەعنەتی خودا لەو ژنانەبێ کە دەچن بۆ سەردانی سەر قەبرانو لەوێ دەیکەن بە بێ شەرعیو شینو شەپۆرو ناشوکری، وە نەفرەتو لەعنەتی خودا لەو کەسانەیش بێ کە مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست دەکەن، وە لەو کەسانەیش بێ کە چرای لەسەر دادەنێن!. (د/ ت/ ن/ بەرشتەیەکی دروست) لەعنەت واتە: بێ بەشبوون لە رەحمەتو میهرەبانی خودا (تکایە بۆ باسی سوێندو نەزر بڕوانە تاح بەرگی سێ لاپەڕە ٣٢٢ هەتا لاپەڕە ٣٥٠ – وەرگێڕ).

## ٣٨٧) باسی دادوەری (القضاء):

دادوەری بە عەرەبی پێی دەگوترێ: قضاء، ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بە زۆر واتا هاتووە دادوەری نیمچە نزیکییەکی لەگەڵ زوربەی ئەم واتایانەدا هەیە. وەك:

١) بـه واتـا دروسـتكردنی شـت بـهقایمیو تونـدوتۆڵیو لێبوونـهوه لێی.

٢) به واتا پێویستكردن، بهم واتایهیه كه یهزدانی پاك دهفـهرموێ: {وَقَـضَى رَبُّـكَ أَلاَّ تَعْبُـدُواْ إِلاَّ إِيَّـاهُ – سـورة الإسـراء – ٢٣/١٧} چـونكه دادوهر بڕیارهكـه پێویـست دهكـاو بڕیـاری پێویـست دهسـهپێنێ بهسـهر لایـهنی دۆڕاودا. سـهر بهڵگـهی ڕهوایـی دادوهری نامـهی خـوداو ڕێگـهی ڕهھبـهرو یـهككرتنی نهتـهوه. قورئـان دهفـهرموێ: {وَأَنِ احْكُم بَيْـنَهُم بِمَـآ أَنـزَلَ اللّـهُ – سـورة المائـدة – ٤٩/٥} واتـه: ئـهی پێغهمبهری خۆشهویست! له نێوانی خهڵكا بهپێی ئهم دستووره جوانـه كـه خـودا ناردوویـهتی بـۆ تـۆ بـه سـرووش حـوكمو دادوهری بكـه) وه دهفهرموێ: {وَإِذَا حَكَمْـتُم بَيْنَ النَّـاسِ أَن تَحْكُمُـواْ بِالْعَدْلِ – سـورة النساء – ٥٨/٤} واته: ھهركاتێ دادوهریتان كرد له نێـوانی مهردومـدا بهھهق به عهدالهت دادوهری بكـهن. لـه سوننهتیـشدا خۆشهویـست (دروودی خوای لهسهربێ) دهفـهرموێ: دادپـرس ئهگـهر تێكۆشـێو بـاش وردببێتـهوه بـۆ گهیـشتن بـه ھـهق لـه مهسـهلهكهداو ئینجـا بڕیارهكـه دهركـا ئـهوه لـهم بارودۆخـهدا ئهگـهر بڕیارهكـهی دهری دهكـا ڕاسـتو دروسـت بـوو ڕووی ڕاستی پێكا ئهوه دوو پاداشی باشـی بـۆ ھهیـه، بـهڵام ئهگـهر بڕیارهكـهی ھهڵه بوو ئهوه یهك پاداشی باشی بۆ ھهیه، چونكه لـه گـهڕان بـه شـوێن ڕووی ڕاستی مهسهلهكهدا درێغی نهكردووه) (شهیخان) دیسان دهفهرموێ (دروودی خوای لهسهربێ): كاتـێ دادوهر لـه دادگـا دهدهنیـشێ دوو فریـشته دێنـه خوارهوه بۆ لایو ڕێگهی ڕاستی نیـشان دهدهنو ھۆكاری سـهركهوتنی بـۆ دهسازێنن، به مهرجێ ناھـهقی نـهكا، دهنـا ھـهر كـه دهسـتی كـرد بـه بـێ دادی گورج سهردهكهونهوهو بهجێی دهھێڵن! (بهیههقی).

ئەمە گشتی دەرهەق بەو دادوەرە وایە کە شارەزای دادوەری بێ و زانا بێ بە بڕیارەکان، بەڵام دادوەری نەزان و بەدکارو بەرتیلخۆرو ناهەقیکار ئەوە وەك پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بڕیاری داوە دەستە چیلەی ئاگری دۆزەخە. بەپێی ئەم فەرموودەیەی {دروودی خوای لەسەربێ}: دادوەرەکان سێ دەستەن: دەستەیەکیان وان لە بەهەشتداو دوو دەستەیان وان لە دۆزەخدا، دەستەی بەهەشتی ئەو داوەرانەن کە دوو نیشانەی باشیان تیادا هەیە:

**یەکەم**: هەقناسن و شارەزای بابەتی دادوەرین.

**دووەم**: وەك هەقەکە دەزانن رەفتاریشی پێ دەکەن!

**دەستەی دۆزەخیش دوو تاقمن.**

**یەکەم تاقم**: دادوەرێکە هەقناسە بەڵام بەهەق کار ناکا.

**دووەم تاقم**: داوەرێکی نەزانی نەشارەزایە بە نەزانی لە نێوانی خەڵکا دەڕانێ، ئەم دوو تاقمە جێگەیان دۆزەخە (د/ ت/ تاج/ ٣ل– ٣٠٣) دیسان دەفەرموێ {دروودی خوای لەسەربێ}: هەرکەسێ بوو بە قازی، بە نەزانی بڕیاری دەدا دەستەی دۆزەخە، هەرکەسێ بوو بە قازی بە ناڕەوا بڕیاری دەدا لە دەستەی دۆزەخە، هەرکەسێ بوو بە قازی، لە هەمان کاتا قازییەکی زانا بوو، هاوکات لەگەڵ ئەوەیشدا هەقپەروەرو دادپەروەر بوو، ئەو جا لە قیامەتدا خواخوایەتی دادوەرییەکەی سەروبەدەرچێ و ئەسوودی هەبێ بۆی و نە زیان، سا بەڵکوو بەبێ وەیی رزگاری بێ لە ئۆباڵی. (ئیبنو حەببان لە صەحیحی خۆیدا گێڕاویەتەوە).

زاناکان دەفەرموون: هەرکەسێ داوەری لە شانی دانەبێ دروست نیە ببێ بە دادوەر، تەنانەت ئەگەر بیشبێ بە دادوەر تاوانبارە، هەر بڕیارێ دەرکا دانامەزرێ، خوای بڕیارەکەی ڕاست بێ یا ناڕاست بێ، چونکە پێکانی ڕووی ڕاستی بە ڕێکەوتو بە تەقڵەی مامە حەمە، دەگەرو بایەخی نیە، چونکە لە بنەمایەکی ڕەوای یاساییەوە سەرچەشمە هەڵ ناگرێ! لەبەر ئەوە هەر بڕیارێ دەرکا پێی تاوانبار دەبێ، وە بڕیارەکانی هیچی دانامەزرێو گشتیان هەڵوەشاو دەبن، بەپێی فەرمایشتی زاتی مەزن: {فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ – سورة النحل – ١٦/٤٣} واتە: هەر شتێ کە خۆتان سەرتان لێی دەرناچێو لێی نازانن لە پسپۆڕانی زانای شارەزای ئەو بابەتە بپرسن.

## ٣٨٨) نیشانەکانی دادوەر (قازی):

وەك ڕابورد لە پێشەوە کەسێ دادوەری لە باردا نەبێ ناڕەوایە بکرێ بە دادوەر، بۆ خۆشی ناڕەوایە کە کاری وا قەبووڵ بکا، دروست نیە کە داوای بکا، بەپێی ئەو بەڵگەو فەرموودانەی کە تۆزێ لەمەوپێش ڕابوردن.

**هەرکەسێ ئەم مەرجانەی تیادابێ دەست دەدا بۆ دادوەری.**

**یەکەم:** موسوڵمان بێ، لەبەر ئەوە دروست نیە بێبڕوا بکرێ بە دادوەر (قازی) خوای لەسەر موسوڵمانان، خوای لەسەر ناموسوڵمانان. چونکە دادوەری سەروەرییە، سەروەریش لە بێبڕوا ناوەشێتەوە.

جارێ ئەبو مووسا نوسەرێکی نەصرانی (گاور)ی دانابوو، عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) پیادا هەڵشاخاو ئەوجا فەرمووی: ئەوان خودا دووری خستوونەتەوە، دەی ئێوە نزیکیان مەخەنەوە، ئەوان خودا تڕۆی کردوون دەی ئێوە ڕێزیان لێ مەگرن، ئەوان خودا بە گزیکارو ناپاکی داناون، نابێ ئێوە بە ئەمێنداریان دابنێن، هۆی ئەوەی کە من ڕێگەتان پێ نادەم کە خاوەن نامەکان بکەن بە کاربەدەستو کاری گرنگی دەوڵەتیان پێ بسپێرن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەمانە بەرتیل بە حەڵاڵ دادەنێنو بەرتیلخۆرن.

**دووەم:** ڕەسیدەو هۆشیاربێ، چونکە منداڵو شێت قسەیان بۆ خۆیان کارناکا، بڕیاریان بۆ خۆیانو لەسەر خۆیان بایەخی نیە. ئیتر بۆ کەسێکی تر چۆن بایەخی دەبێ؟!

**بزانن:**

لەگەڵ هۆشیاریدا ئەم شتانەی تریش ڕەچاو دەکرێن: دەبێ ژیرو زرنگو زەین ڕۆشنو وریابی، حەپۆلەو ساویلکەو گێلۆکە نەبێ، هەتا بەزیرەکی خۆی بتوانێ بچێتە بنجو بنەوانی کارەکەو پەی بە بڕیارەکان بباو چارەسەری کێشەو بەرەکان بدۆزێتەوە.

**سێیەم:** ئازادی، چونکە بەندە خۆی ناتەواوە، دەسڵاتی بەسەر خوودی خۆیدا نیەو خۆی سەروەری خۆی نیە، دیارە دەسەڵاتی بەسەر کەسێکی تردا باشتر ناشکێ.

**چوارەم:** دادپەروەربێ، چونکە بەدکار - واتە: فاسق – ڕێگەی پێ نادرێ کە سەرپەرشتیو سەرەوکاری ماڵی کوڕی خۆی بکا، لەگەڵ ئەو گشتە دڵسۆزیەی بۆی، ئیتر چۆن ڕێگەی پێ دەدرێ کە سەرەوکاری سەروماڵو نامووسی کەسانی بیانی بکا!؟

**پێنجەم:** نێرینەبێ، بەپێی ئایەتی: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى – سورة النساء – ٣٤/٤} واتە: پیاوان سەرگەورەی ژنانن‌و سەرپەرشتن بە سەریانەوە).

بەپێی ئەم فەموودەیەیش کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: گەلێ کەسەر گەورەییو سەروەریی خۆیان بسپێرن بە ژنێ قەت سەر ناکەون. (د/ ب/ ت/ تاج/ ٣ ل – ٣٠١ حاکمیش گێڕاویەتەوەو دەفەرموێ: بەپێی مەرجی هەردوو پیرە).

**شەشەم:** دەبێ شارەزای بڕیارەکانی شەرع بێو شەرعزانێکی باشبێو بە لایەنی کەمەوە ئاگای لەو ئایەتو حەدیثانە هەبێ کە پەیوەندییان بە بڕیارەکانەوە هەیە، کەسێ کە شارەزاییەکی باشی لەوە نەبێ ناکرێ بە داوەر بەپێی ئایەتی: {وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ – سورة الإسراء – ٣٦/١٧} واتە: مەکەوەرە شوێنی شتێ کە لێی نازانیو عیلمت پێی نیەو لە پسپۆڕیی تۆ نیە) هەروا بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەریش (درووودی خوای لەسەربێ): دادوەرەکان سێ دەستەن.. کە لە سەرەتای باسی دادوەریدا ڕابورد. لەبەر ئەوەیش چونکە نەزان بە کەڵکی ئەوە نایەت، کە فەتوابدا، ئیتر چۆن بەکەڵکی دادوەری دێ، کە ئیشی سەرەکی ئەوەیە بڕیار دەربکا.

**حەوتەم**: دەبێ لە گفتوگۆی عەرەبیداو لە زمانی عەرەبیداو لە ڕێزمانو زمانەوانی عەرەبیدا شارەزاو پسپۆڕبێ، چونکە ئەگەر وا نەبێ شارەزایی تەواوی لە قورئانو سوننەتدا نابێ کە سەرچاوەی شەریعەتنو هەردوو لاشیان بە عەرەبین.

**هەشتەم**: دەبێ چاوساغو بیسەرو بینابێ، چونکە کەڕ گوێی لە قسە نیە، نازانێ کابرا پێ لە کارەکە دەنێ یا حاشای لێ دەکا، کوێریش نازانێ کێ داواکارەو کێ داوا لێکراوە.

**نۆیەم**: دەبێ ڕۆشنبیرو وریاو هۆشیاربێ، دادوەری پیاوی حۆڵو گێل دانامەزرێ، ئیتر خوای گێلیو حۆلێییەکەی زکماك بێ، بەهۆی نەخۆشیو پیریو خورپەو شتی واوە تووشی بیتێکچوون بووبێ.

**دەیەم**: دەبێ گۆیاو قسەکەربێ، چونکە لاڵ توانای جێبەجێکردنی بڕیارەکانی نیە.

## ٣٨٩) باسی دەستوورو یاساو نەریتی دادوەری (آداب القضاء):

**بزانە:**

دادوەری کۆمەڵێ دەستووری جوانی هەیە، وەك: ئەوە جێگەی دانیشتنی داوەر لە ناوەراستی شارابێ، چونکە ئەوە بۆ هەموان چونیەکەو نیشانەی دادپەروەرییەو یەکسانی دەگەیەنێ، وەك ئەوە کاتێ کە قازی دامەزرا مەجلیسەکەی لە جێگەیەکی گوشادو بەریندابێ، نەبادا

ئامادەبوانی کۆڕەکە تووشی ئازارو سەخڵەتی ببن، وەك ئەوە بە پێی کاتو شوێن مەجلیسەکەی بە دەرەوە بێو ئاشکراو لەبەر چاوبێو بۆ ئەو ڕۆژو سەردەمە دەست بدا، هەتا بەپێی کاتو سات ئاشناو نائاشنا جێگەو ڕێگەی بزانێو لەکاتی پێویستدا بۆ دادوەری بڕۆن بۆ خزمەتی لەبەر ئەم فەرموودەیەیش کە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: هەرکەسێ خودا فرمانێکی لە کاروباری موسوڵمانان پێسپارد وە دەرگای خۆی لە هەژارانو داماوانو خاوەن ئیشو کار دابخا، بێ گومان کە خودایش دەرگاکانی خۆی لە رووی هەژاریو ئیشو کاری ئەودا دادەخا. (د/ ت/ تاج/ ٣ ل/ ٢٨٨) وەك ئەوە جێگەکە فێنك بێ، نە ساردبێ نە گەرم، دوو کەلو تۆزی نەبێ، باش نیە دادوەر ددەرگەوانو پەردەداری هەبێ، مەگەر لەبەر پێویستی، ئەگەر دەرکەوان، یا پەردەدار (حاجب)ی هەبوو پێویستە پیاوێکی دەمو دەستو دامەن پاکبێو دادپەروەربێو ئەمینداربێو قەڵەمێکی ڕێکی هەبێ، گەورەو بچووك بزانێو ئارەزوو پەرست دەبێ، ڕەفتاری میانەبێ، نە زۆر هارو هاج بێو نە زۆر نەرمو شلیشبێ، مامناوەندی بێ. ناباشە قازی (واتە: دادوەر) کۆڕی دادوەریی لە مزگەوتا ببەستێ، چونکە سکاڵاو دادگاییکردن قرەو بڕەی تیادا دەبێ، وا دەبێ ئافرەتی بێنوێژو بێبڕواو شێتو ئەم جۆرە کەسانە ئامادەی کۆڕی دەبن، مزگەوتیش جێگەی شتی واو شوێنی ئەم جۆرە کەسانە نیە. گوتراویشە: دادوەریکردن لەناو مزگەوتدا ناباشی (کەراهەت)ی نیە، هەروەك چۆن قورئانخوێندنو دەورکردنەوەی زانستە ئیسلامییەکانو فەتوادان لەناو مزگەوتا ناباشییان نیە.

**پێویسته هەردوو هاوداوا :**

بەیەك چاو تەماشا بكرێن لە راستیدا پایەی دادوەریی بۆ ئەوە دانراوە كە عەدالەت پایەدار بێ، دەی هەر كاتێ دادوەر لاری لەوە هەبوو ئەوە بێ دداوەری‌و ناهەقی دەكا، لەبەر ئەوە دەبێ دادوەر جیاوازی نەخا لە نێوانی ئەو كەسانەدا كە بۆ دادگاكردن دێن بۆلای، دەبێ لە جێگەدا یەكسان بن، نابێ یەكێكیان زیاتر لەوی تریان نزیك بكاتەوە، نابێ لەگەڵ یەكێكیان رووخۆشبێ‌و لەگەڵ ئەوی تریان مۆن‌و گرژبێ، نابێ بە ئاماژە یەكێكیان تێ بگەیەنێ، یا چپەو سرتەی لەگەڵدا بكا، نابێ مامۆستایی بۆ داواكار یا بۆ داوالێكراو بكاو فێریان بكا كەچی باشە بۆیان، بە كوردی پەتی كورت‌و پوخت: لە هیچ شتێكا باوی كەسیان نەدا بەسەر كەسیاندا. یەزدانی پاك دەفەرموێ: {كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ – سورة النساء – ٤/١٣٥} واتە: ئەی كەسانێ كە پڕوادارن! هەمیشە عەدالەت پەروەربن‌و كەمەر بۆ خزمەتی عەدالەت ببەستن).

## ٣٩٠) بڕیاری دیاری‌و بەرتیل:

بەبێ گومان بەرتیل نادروستە، چونكە لە چەشنی خواردنی سامانی مەردومە بە ناڕەوا، بەرتیل خواردن پیشەی هۆزی جووە. حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: نەفرینی خودا لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆر، بە تایبەتی لەوانەیان كە لە دادگاو دادوەریدا بەرتیل بەكار دەهێنن. (پێشەوا ئەحمەدو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە، تیرمیذی بە دروستی داناوە) گفتەی ئیبنو ماجە: لەعنەتی خودا لەسەر بەرتیلدەرو

بەرتیلخۆر. وا باشە قازی واتە: دادوەر، دەرگای دیاریو دەسەنە لە خۆی داخا، دیاریو دەسەنە لە کەس وەرنەگریٚ مەگەر لە کەسیٚ لە پێش وەرگرتنی پایەی دادوەریدا دیاریو دەسەنە لە نێوانیاندا هەبوویێ، لەبەر دۆستایەتیو خزمایەتی، چونکە پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرمویٚ: دیاری کاربەدەست دزیو گزییە. لە گێڕانەوەیەکدا: حەرامە. (ئیمام ئەحمەد)، لە صەحیحەیندا دەفەرمویٚ: پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} پیاوێکی ئەسەدی کرد بەسەر کاری سەر زەکات، ناوی ئیبنو للوتبییە بوو، کابرا کە هاتەوە گوتی: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی خۆمە بە دیاری بۆم هاتووە!

جا پێغەمبەر {درودی خوای لەسەربێ} سەرکەوتە سەر دوانگەو راوەستاو ستایشو سوپاسی خودای کردو فەرمووی: ئەمە چی پیٚ دەڵێن! هەندیٚ سەرکار هەن کە دەینێرم بۆ شوێنی کە دێتەوە دەڵیٚ: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بە دیاری بۆم هاتووە، جا ئەگەر وایە ئەدی بۆچی لەماڵی بابی یا لە ماڵی دایکی دانانیشێت هەتا بزانیٚ کە دیاری بۆ دیٚ یانا؟ بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە ئەوەی لە ئێوە ناخونەك لەم ماڵە بدا، کە ماڵی دەوڵەتە، وە وەچەپو گووپی لیٚ بکا، ئەوە لە رۆژی دوایی دا، ئەو ناخونەکە دەنیٚ بەنەرەی شانیەوەو دەیهێنیٚ بۆ دیوانی خودا، جا هەیە کە وشترێکی دزیوە دەیدا بە قەڵاندۆشکانیدا، وشترەکە بەسەرشانیەوە دەبۆڕێنیٚ! وە هەیە رەشە وڵاخی دزیوە، رەشە وڵاخەکە بە کۆڵیەوە دەقۆڕێنیٚ، وە هەیە مەڕ یا بزنی دزیوە، جا مەڕەکە یا بزنەکە بە کۆڵیەوە دەباڕێنیٚو بە تەواوی دەیکەن بەپەندا!

ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هەردوو دەستی خۆی بەرزەوەکرد بە رادەیێ وا، کە بۆ رایی (خاڵ)ی هەر دوو بنباڵی وەردەکەوت وە دوو جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەی خودایە! ئەوا تۆ ئاگاداری، تۆ بە شایەت بە ئەوا من پێم راگەیاندن. (تاج/ ٣ ل – ٢٩٦) لە شوێنێ ئەمە بۆ کار بە دەست وابێ بۆ دادوەر زیاتر وایەو ناڕەوا ترە. دادگەری و فەلسەفەی ئەم رێ پێ نەدانەیش ئەوەیە وەرگرتنی دیاری سەر وەکێشێ بۆ بێ دادی و حەرامخۆری، نەخوازەلا لە رۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا کە رۆژگار تەواو خراپ بووە.

**بزانە:**

دیاری بۆ غەیری کاربەدەستان، وەك دیاری هاووڵاتیان لەناو خۆیانا ئەگەر بۆ مەبەستێکی نادروست بوو، وەك لە باربردنی مافێ، یا یاریدەی ستەمکارێ، ئەوە وەرگرتنی نادروستەو تکاکردنیش بۆ شتی وا ناڕەوایە، ناوەندیار (وسیت) لە نێوانی بەرتیلدەرو بەرتیلخۆردا، خوای قازی بێ یا کەسێکی تربێ، هەروا لە نێوانی دیاری دەرود یاری وەرگردا، بڕیارەکەی رێك وەك بڕیاری وەکیل، یا جێدار وایە، جا رەنگە هەندێ بەرتیلدەر یا دیاری بەر مەهانەی رەوایان هەبێ، چونکە ناچارن کە بەهەرشێوەیێ بتوانن مافی رەوای خۆیان دەست بخەن، بەلام ناوەندیار بە هیچ جۆرێ مافی ئەوەی نیە، چونکە ئەگەر بە وەکالەتی بەرتیلدەریش لە هەندێ کاتا تاوانبار نەبێ، بە وەکالەتی بەرتیل وەگر لە گشت بارودۆخێکا تاوانبار دەبێ، چونکە ناوەندیار وەك جێداری هەردوو لاوایە. وەکی تر ئەگەر دیاری بۆ پەخشی خۆشەویستی بوو، یا بۆ وەرگرتنەوەی مافێکی رەوا بوو، یا بۆ پێشگیری لە زوڵمو زۆرو ستەم

بوو، ئەوە لە جۆری یەکەما کە بۆ پەخشی خۆشەویستی بێ سوننەتە، لە جۆری دووەم‌و سێیەمدا بۆ دیاریبەر حەرام نیە بەڵام بۆ دیاریوەرگر حەرامە.

## ٣٩١) لەم دەکاتەدا نابێ دادوەر بڕیاربدا:

لە دەشوێندا بڕیاردان لە لایەن داوەرەوە باش نیە: لەکاتی تووڕەییداو لەکاتی برسێتی‌و توونێتیداو لەکاتی خەو لێ زڕان‌و شەوارەگرتنداو، لەکاتی خەم‌و خەفەتداو، لەکاتی کەیفخۆشی زۆرداو، لەکاتی نەخۆشیداو، لەکاتی تەنگە تاوبوونی سەراوداو، لەکاتی زۆر بۆ هێنانی خەوداو، لە قرچەی گەرماو سەرمای سەختدا. سەر بەڵگەی ئەمانە هەموو ئەم فەرموودەیەتی (درودی خوای لەسەربێ): دادپرس لەکاتی تووڕەییدا دادگایی کەس نەکا (شەیخان) چونکە دیارە کە مەبەستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زاتی تووڕە بوون نەبووە، بەڵکوو مەبەستی ئەو شەڵەژانەیە کە بەهۆی تووڕەبوونەوە پەیدا دەبێ، کە مرۆڤ شپرزە دەکاو هۆش‌و رەفنتاری بۆ ماوەیەکی دیاری تێك دەداو سەری لێ دەشێوێنێ. دەی ئەوانی تریش بە پێوەری تووڕەیی دەپێورێن، چونکە ئەوانیش وەك تووڕەیی ژیریی دەگۆڕن‌و سەر ە هۆش دەشێوێنن.

**بزانن:**

دادوەر بۆی نیە یەکێ لە دوو هاوداوا کە فێری شتێ وا بکا کە زیانی بۆ ئەوی تریان هەبێ، مەگەر لە حودووددا، چونکە حەددی شەرعی بەهۆی شوبهەو بۆرە گومانەوە لەکۆڵ دەکەوێ. هەروا دروست

نیە بۆی ڕێ لە شایەت بگرێ بە نیازی ئەوە واز لە شایەتییەکەی بهێنێ، چونکە شتی وا لایەنگریی شایەتی بۆ دراوە، هەروا دروست نیە لە شایەت بخوڕێو پیاهەڵشاخێ، نابێ شایەتیی کەسیش قەبووڵ بکا مەگەر بەپێی گشت مەرجەکانی شایەتی کە ئەمانەن:

**یەکەم**: چەسپبوونی دادپەروەری (ثبون العدالة) کە بەوە دەبێ:- ڕەسیدەو ژیرو ئازادو خاوەن پیاوەتیو فامیدەی کاروباری دنیاو دینی خۆی بێ. جا هەرکاتێ لەلای دادوەر شایەتێکی بەدکار (فاسق) شایەتیدا، وە دادوەر بە حاڵی ئاگادار بوو، نابێ شایەتییەکەی وەربگرێ، چونکە دروست نیە بڕیاردان بەهۆی شایەتی بەدکارەوە. تەنیا دەبێ شایەتی بە دادو هەقانی قەبووڵ بکاو بەس، هەتا ئەگەر هاوداواکانیش بە شایەتیی بەدکار ڕازیبن نابێ قازی بڕیاری پێ بدا چونکە خودای مەزن دەفەرموێ: {وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ – سورة الطلاق – ٢/٦٥} واتە: شایەتانی حەققانی دادپەروەری موسوڵمان قەبووڵ بکەن بە شایەت).

**دووەم**: گومانی لایەنگیری نەکرێ، ئەوەیش هۆی زۆرە:

١) دوژمنایەتی، شایەتیی دوژمن لەسەر دوژمن وەرناگیرێ، ئەگەر بۆ ئیشێکی دنیایی بێ، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَأَدْنَى أَن لاَّ تَرْتَابُواْ – سورة البقرة – ٢٨٢/٢} واتە: بە جێهێنانی ئەم فەرمانو ئامۆژگاریو دستوورانە کە لەم ئایەتەدا باس دەکرێن زیاتر دڵنیاتان دەکا لەوە کە تووشی گومانو سەرلێشێوان نەبن. دەی دیارە کە دوژمنایەتی بەهێزترین هۆیە بۆ گومان لێکردن، چونکە پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: شایەتیی پیاوی ناپاكو ژنی ناپاكو کەسێ

کە داری حەددی لێ درابێ‌و، شایەتی کەسێ کۆنە قینی لە دلابێ‌و، شایەتیی شێت‌و، شایەتیی کەسێ کە لەبەر ئاغایەتی‌و خفمەتکاری‌و خزمایەتی جێگەی گومان بێ، شایەتیی ئەمانە دروست نیە. (ئەبو داوود/ تاج – ٣ ل – ٣٠٩).

٢) سەرو فنگی یەکتری بن، واتە: بنەچەو وەچەی یەکتربن، کەواتە شایەتی باوك بۆ منالی خۆی‌و بەرەو خوارتریش، یا شایەتیی منال بۆ باوك‌و دایکی خۆی‌و ژوور تریش وەرناگیرێ، چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ – سورة البقرة – ٢٨٢/٢} دیارە کە بەهۆی خزمایەتیشەوە گومان کردن پەیدا دەبێ، چونکە خۆشەویستی هۆی مەیلی زۆرە. وەکی تریش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: فاطیمەی کچم پارچەیەکە لە من، دەی ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیە منال بەشێکە لە باوك‌و دایکی، کەواتە شایەتیی منال بۆ باوك‌و دایکی، وەك شایەتی بۆ خۆی بدا وایە.

## ٣٩٢) بڕیاردان لەسەر نادیار:

بزانە داوا تۆمارکردن لەسەر مردوویێ کەلەپوور گری دیاری نەبێ دروستە، هەروا لەسەر منالێ سەرپەرشتیاری نەبێ، هەروا لەسەر نادیاری بێ وەکیل چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ – سورة ص – ٣٦/٣٨} ئەوەتا بەپێی ئەم ئایەتە خودا فەرمان دەکا بە داوود پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە دروستی بەپێی

شـەریعەتی حـەق دادوەری بکـا لـەنێوان مەردومـداو لـە حـەق لانـەدا، ئەمەیش واتای وایـە هەرچـی بـە شایەتو بەڵگە ساخ ببێتـەوە حەقەو رەوایە، کەواتە کارپێکردنی پێویستە بەپێی ئـەم فەرموودەیەیشی {درودی خوای لەسەربێ} کـە بەهێنـدی ژنـی ئـەبو سـوفیانی فـەرموو: لـەماڵی ئـەبو سوفیان ئەوەنـدە ببـە کـە بەشـی خۆتو منداڵەکانت بکا (بڕوانـە باسـی ژێوار، زنجیرە/ ٢٩٠- وەرگێڕ) چونکە لەوکاتـەدا کـە پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} ئەم بڕیارەی دەرکرد، هاو داوای هیند کە ئەبو سوفیان بوو لـەوێ نەبوو، بەڵام پێغەمبـەر {درودی خوای لەسەربێ} هینـدی دەناسـیو دەیزانـی کـە ژنی ئەبو سوفیانە، ئەوە برێتیی ئەوە کەوت کە هیند بە بەڵگەو شایەت بیسەلمێنێ کـە هاوسـەری ئـەوە، ئـەو رستـەیەی کـە حـەزرەت {درودی خوای لەسەربێ} پێی دەفەرموێ: (ببە) بەڵگەی ئەوەیـە کـە ئەمـە دادوەری کردنـە نەوەك فەتوا دەرکردن، چونکە ئەگەر فەتوادان بوایە نەیدەفەرموو: (لـە ماڵەکەی ببە) دەیفەرموو: (قەیـدی نیـە ئەگـەر بیبـەی) بەڵگەیـەکی تـر لەسـەر دروسـتبوونی بڕیـاردان لەسـەر نادیـارو دادگـاییکردنی ئـەم ئەثەرەیە: لە مەسەلەکەی (الاسیفع)دا عومـەر {رەزای خوای لێبێ} جاڕی داو فەرمووی: هەرکەسێ قەرزی لەسەر (أسیفعە) با سبەینێ بێت بۆ لامان، چونکە ئێمە ماڵەکەی دەفرۆشینو دابەشی دەکەین بەسەر ئەو کەسانەدا کە قەرزیان لە سەریەتی. اسیفع خۆی لەو کاتـەدا لـەوێ نـەبوو. (مالیك لـە – الموطـأ – دا گێڕاویەتـەوە) لـە کۆتـایی ئـەثـەرەکـەدا دەفـەرموێ: دووربـن لـە قـەرز سـەرەتاکەی خەمـە، سـەرەنجامەکەی شـەڕو هەرایـە. وەکی تریش دادوەری نەکردن لەسەر نادیـار دەبێ بـەهۆی فـەوتانی زۆر لـە مافـەکان. جاهـەرکاتێ دادپـرس بڕیـاری لەسـەر نادیـار دەرکـرد،

بڕیارەکەی جێبەجێ دەکرێ، وە ئەوەی بڕیار دراوە دەبێ بە مافێکی چەسپاوی دامەزراو لە ئەستۆیدا، لە ڕێگەی شەرعەوە لێی وەردەگیرێ.

## ٣٩٣) باسی دابەشکردنی ماڵی تێکەڵ:

دابەشکردنی ماڵی هاوبەش بە نامەو ڕێگەی ڕەهبەرو یەکگرتنی ئەتەوە چەسپاوەو ساخ بۆتەوە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُوا الْقُرْبَى - سورة النساء - ٤/٨} واتە: کاتێ کە خزمەکانی حازری بەشکردنی کەلەپوور بوون. خۆشەویستیش {درودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: شوفعە (واتە: بەشی هابەش‌و هاوسا هەڵگرتنەوە) لە هەموو شتێکا هەیە، بە مەرجێ کە هێشتا دابەشنەکرابێ. (ش/ د/ ت/ ن/ تاج/ ٢ ل - ٣٣٢) پێغەمبەر خوای {درودی خوای لەسەربێ} ماڵی تالانی جەنگی دابەشدەکرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا، لەپاش خۆشی جێنشینە هەقناسەکان {ڕەزای خودایان لێبێ} هەمان شتیان دەکرد.

جا ماڵێ کە تێکەڵ بێ‌و هی چەند هاوبەشێ بێ، یا هاوبەشەکان خۆیان دابەشی دەکەن، یاخود پێشەوای موسوڵمانان، یا جێنشینی پێشەوا دابەشی دەکا بۆیان، مەبەست لە جێنشینی پێشەوا کەسێکە دانراوی پێشەوابێ‌و ئەو دایانابێ بۆ دادوەری، وەك قازی‌و دانراوی قازی، مەرجی دانراوی قازی (منصوب القاضی) ئەوەیە: موسوڵمان‌و باڵق‌و خاوەن هۆش‌و ئازادو نێرینەو بەدادبێ، بۆیە ئەمانە مەرجن چونکە دابەشکردن سەرداری‌و سەروەرییە، ئەمانەیش مەرجن بۆ هەبوونی سەروەری. لە هەمان کاتدا ئەگەر دابەشکردنەکە پێویستی بە ژمارەو

پێوانە (حیساب‌و مەساحە) هەبوو، دەبێ ئەو کەسە ژمارەو پێوانەو رووپێویی بزانێ، چونکە ئەم دووە ئامێری دابەشکردنن، بەڵام ئایا مەرجەکە دابەشەکەرەکە نرخ‌و بەهای شتەکان بزانێ یانا، لەمەدا راجیایی هەیە.

## ٣٩٤) جۆرەکانی دابەشکردن:

**دابەشکردن سێ جۆرە:** لە زاراوی شەرعی شەریفدا ناودارن: بە (قسمة الرد) و (تقسيم التعديل) و (تقسيم الاجزاء) بە کوردی واتە:

١- دابەشکردنی بەش گەڕانەوە.

٢- دابەشکردنی رێکخستن.

٣- دابەشکردنی شتی بەشبەش. تقسيم الاجزاء بەعەرەبی پێشی دەڵێن. (قسمة الإفراز) و (تقسيم المتشابهات) واتە: دابەشکردنی مولکی هاورەنگ، وەکوو دابەشکردنی دانەوێڵەو پارەو رۆن‌و هەموو شتە وێنەدارەکان (المثليات) یان وەکوو خانوویەك کە هۆدەکانی وەکوو یەك وابن، یان زەوییەکە پارچەکانی لە باشی‌و خراپیدا وەك یەك وابن، یان هەر شتێکی تری لەم بابەتە، وەکوو دابەشکردنی تۆپێ بلووری، یا کیلۆیێ زێڕ، یا زیو. جا ئەوەی بە پێوان دەپێورێ پشکی هاوبەشەکان بە پێوان جیا دەکرێتەوە، وەك دە ربە گەنم بۆ دووکەس، یەکی پێنج ربەیان دەکەوێ، وە ئەوەی بە کێشان دەکێشرێ پشکەکانیان بە کێشانە بۆ جیا دەکرێتەوە، وەك کیلۆیێ زێڕ بۆ دە هاوبەش، یەکی سەد

غەرامیان بەر دەکەوێ. واتە: بۆ بەشکردن پێویستە بەشەکان هەموو بەگەز یا بە پێوانە یا بەکێشانە بە قەد ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان جیاجیابکرێنەوە، جا ئەگەر پێویست بە تیرو پشك نەبوو ئەوە بەبێ دەوو تیرو پشك ملکەکە دابەشدەکرێ، وەك سەد دینار بۆ پێنج کەس. خۆ ئەگەر پێویستی بە تیرو پشك بوو ئەوە تیرو پشکیان لێ دەکرێ. وەك زەوی‌و خانوویێ کە پارچەکانیان وەك یەك بێ، لەسەر ئەم شێوەیە: ملکەکە دەکرێ بە چەند بەشی یەکسانەوە بە قەد ژمارەی سەری خاوەن پشکەکان، ئەوجار ئەوندەی بەشەکان پارچە کاغەز دەبڕرێ‌و لەهەر پارچە کاغەزێ ناوی پارچەیێ لەو مولکە دەنووسرێ. هەروەها ئەوەندەی خاوەن بەشەکانیش پارچە کاغەز دەبڕرێ‌و لەهەر پارچەیەکیان ناوی خاوەن بەشێ دەنووسرێ، جا پارچە کاغەزی بەشەکان بە جیا یەکە یەکە لوولە دەکرێن‌و دەدرێن بە دەستی کەسێکەوە کە پێشان لەوێ ئامادە نەبووبێ، تا هەر لوولەیێ بخاتە سەر ناوی یەکێ لە هاوبەشەکان.

جا هەرکەسێ هەر بەشێکی بۆ دەرچوو دەیبا بۆ خۆی، ئەگەر قایل نەبوو پێی ناچار دەکرێ کە وەری بگرێ!

**جۆری دووەم:** (تقسیم التعدیل)ە کە برێتییە لە دابەشکردنی شتێ کە نرخی بەشەکانی جیاجیا بێ، وەکوو زەوییەك کە هەندێکی نەرمە زەوی‌و هەندێکی شۆرەکات بێ، یاخود هەندێکی نزیکە ئاوو هەندێکی دوورە ئاوبێ. جا ئەم جۆرە ملکە تێکەڵ‌و هاوبەشە جاری وا دەبێ یەك شت دەبێ، جاری وایش دەبێ دوو شت یا پتر دەبێ. وەك ئەوە پارچەیێ

زەوی ناو کۆیی بێ لە نێوانی دوو کەسدا، سێیەکێکی بەراو بێو بایی ئەو دوو سێیەکەکەی تری بێ لە نرخا، ئەوە سێیەکە بەراوەکە دادەنرێ بە پشکێو دوو سێیەکەکەی تریشی دەکرێ بە پشکێو هەریەکەیان پشکێ هەڵ دەگرنو تەواو. یا وەك ئەوە ماڵەکە دوو خانوو یا دوو دووکان بێ، کە نرخەکانیان وەك یەك بێ، لەم حاڵەدا ئەگەر هاوبەشەکان یەکێکیان داوای بەشکردنی کردو ئەوی تریان نەیویستو بەوە رازی نەبوو کە هەریەکی خانوویێ، یا دووکانێ هەڵبگرێ بۆ خۆی ئەوە ناچار ناکرێ لەسەر قەبووڵی دابەشکردن، چونکە بەپێی جێگەو شوێنی خانوو دووکانەکان مەبەست دەگۆڕێ، بەڵام ئەگەر ملکەکە چەن دووکانێکی بچووك بوو، بە تەنیشت یەکەوەبوون، بە یەکەیەکە بە کەڵکی دابەشکردن نەدەهاتن، یەکێکیان ویستی دابەشی بکەن، ئەوە داواکەی قەبووڵ دەکرێو لەسەر قسەی رای دروست ملنەدەر (ممتنع) ناچار دەکرێ، چونکە پێویستی ئەوە دەخوازێ، ئەگەر ملکەکە زەویو زار نەبوو، وەك ئەوە دوو کەس لە چەند بەندەیەکا، یا لەچەند سەر ئاژەڵا، یا لە چەند بنکە درەختێکا، یا لەچەند پارچەیێ جلو بەرگدا هاوبەش بن، ئەوە سەیر دەکەین ئەگەر لە یەك چەشن بوونو دەتوانرا لەنگەری یەکسانی لە نێوانی هاوبەشەکاندا رابگیرێ، ئەوە ملنەدەر ناچار دەکرێ لەسەر دابەشکردن، بەڵام ئەگەر یەکسانی لە نێوانیاندا دابین نەدەکرا، وەك سێبەندە بۆ دوو کەس، ئەوە راجیایی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر یەکێ لەسێ بەندەکە هاوتای ئەو دوانەکەی تریانی دەکرد لە بەهاو نرخدا، ئەوە لەسەر رای فەتوا پێدراو (المذهب) ناچار دەکرێن لەسەر دابەشکردنو بەندە گرانەکە دەکرێ بە پشکێو دوو بەندە

هەرزانەکەیش دەکرێن بە پشکێ، دەق وەك دابەشکردنی پارچەیێ زەوی کە نرخی بەشەکانی جیاجیابن.

**جـۆری سـێیەم:** (قـسمة الـرد)ە، کـە برێتییـە لـە دابەشـکردنی پارچەیێ زەوی، لایەکی بیرێ یا باخێکی تیادا بێ، وە ئەم لایەی بە تەنها بۆ دابەشکردن نەشێ، ئەوە نـرخی تەواو بۆ بیرەکە یا بـۆ باخەکـە بـەبێ زەوییەکە دادەنرێ، ئەوجا زەوییەکە دەکرێ بە دوو بەشـەوە، وە بـەتیرو پـشك دابـەش دەکرێ، ئـەوە لـەم شێوەکارەدا ئـەو هاوبەشـەیان کـە ئـەو پارچەیە هەڵ دەگرێ کە بیرەکە یا باخەکـە وا لـە ناویـدا، نیـوەی نرخـی بیرەکە یا باخەکە دەگێرێتەوە بۆ هاوبەشەکەی تر. کەواتە ئەگەر نرخی بیرەکە هەزار دینار بوو، یا نـرخی باخەکە دوو سەد دینار بوو، پێویـستە ئەو کەسەیان کە ئەو پارچەیەیان هەڵدەگرێ کە بیرەکـەی تیادایـە پێـنج سەد دینار بدا بەوی تریان، یا کە باخەکەی تیادایە سەد دینار بدا بـەوی تریان و هەروەها... یاخود برێتییە لـە دابەشـکردنی چـەند شـتێ بەسـەر چـەند کەسـێکا کـە ژمـارەی شـتەکان و ژمـارەی هاوبەشـەکان قـەبووڵی دابەشـکردن نەکـەن بەسـەریەکا، وەك سـێ بەنـدە بـۆ دوو کـەس، یـاخود برێتییە لە دابەشکردنی چەن شتێ لـە نێـوانی چـەند هاوبەشێکا، بـەڵام شتەکان هەندێکیان گران بەهابن و هەندێکیان هەرزان بـەهابن، وەك دوو بەندە بە یەکسانی دابەشبکرێت بۆ دوو کەس، بـەڵام بەندەیـەکیان بـایی هەزار دینار بێ، ئەوی تریـان بـایی شـەش سـەد دینـار بـێ، دەبـێ ئـەوەی بەنـدە گرانبەهاکـە هـەڵ دەگـرێ دوو سـەد دینـار بگێڕێتـەوە بـۆ ئـەوی تریان کە بەندە هەرزانبەهاکە هەڵدەگرێ! هەتا هەردوولا هاوسان ببن[1].

**بزانن:**

هەر دابەشکردنێ کە نرخ دانانی تێدا نەبێ، وەك دابەشکردنی کیلۆیێ زێڕ بۆ دەکەس ئەوە یەك دابەشکەر (قاسم) بۆ جێبەجێکردنی بەسە، بەڵام ئەگەر دابەشکردنەکە نرخ دانانی تیادا بوو، وەك پارچەیێ زەوی بیرێ لە لایەکێدا بێ، ئەوە بەلایەنی کەمەوە دەبێ دوو دابەشکەربن، چونکە نرخبڕین بۆ شت بە دوو کەس ساخ دەبێتەوە.

## ٣٩٥) دابەشکردنی ماڵی هاوبەش:

هەرکاتێ یەکێ لە هاوبەشەکان داوای دابەشکردنی ماڵێکی هاوبەشی کردو یەکێکیان قایل نەبوو کە دابەش بکرێ ئەوە تەماشا دەکەین: ئەگەر دابەشکردن زیانی نەبوو بۆ شتەکە ئەوە ملنەدەر (ممتنع) ناچار دەکرێ، لەسەر دابەشکردن ئەم جۆرە ماڵەیش وەك زەوی‌و زارو خانوو بەرەو دانەوێڵەو شتی تری لەم بابەتانە، چونکە بە دابەشکردن زیان پەیدا نابێ، بەڵام ئەگەر بە دابەشکردنەکە زیان لە شتەکە دەکەوت، وەك گەوهەرێ یا جلێکی گرانبەها، کە بەهۆی پارچە پارچەکردنەوە نرخەکەی کەم بکا، یا وەك بیرێ، یا دووکانێکی بچووك کە بۆ ئەوە نەشێن برێن بە دوو بیر، یا بە دوو دووکان، ئەوە ملنەدەر ناچار ناکرێ لەسەر دابەشکردن، چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: (نەزیان نە وەڵامی زیان بە زیان!). لەبەر ئەوەیش چونکە خۆشەویست نەیی کردووە لە بە فیڕۆدانی سامان، تەنانەت ئەگەر لە دادپرسیش داوای دابەشکردنیان کرد وەڵامیان ناداتەوە، بەڵکوو ناهێڵێ کە دابەشی بکەن چونکە شتی وا گەوجییە، ئەگەر دنیا بوو بۆ

یەکێکیان زیان بوو، بۆ ئەوی تریان زیانی نەبوو، وەك ئەوە یەکێ لە دوو هاوبەشەکە دەیەکی پارچە زەوییەکی هەبوو وە ئەوی تری هی هاوبەشەکەی بوو، وە ئەگەر زەوییەکە دابەشبکرێ خاوەنی نۆ دە یەکەکە بتوانێ سوودی لێ وەربگرێ بە پێچەوانەی خاوەنی دە یەکەکەوە، ئەوە ئەگەر خاوەنی یەك دە یەکەکە داوای بەشکردنی کرد خاوەنی یەك نۆ بەشەکە ناچار ناکرێ بۆ دابەشکردنی، بەلام ئەگەر خاوەنی نۆ بەشەکە داوای کرد خاوەنی یەك بەشەکە ناچار دەکرێ!

بۆیە خاوەنی یەك بەشەکە ناچار دەکرێو خاوەنی نۆ بەشەکە ناچار ناکرێ چونکە خاوەنی تاقە دە یەکەکە لە داواکەیدا زیان لە خۆی دەداو داواکەی رقەبەریو کەللە رەقییە، بە پێچەوانەی خاوەنی نۆ بەشەکەوە کە داوا کەی بۆ خۆی سوودی هەیە. بەڵێ ئەگەر خاوەنی یەك بەشەکە ملکێکی تری هەبوو، بە تەنیشت تاقە دە یەکەکەیەوە بوو، لەبەر ئەوە بە دابەشکردنەکە زیانی لێ نەدەکەوت ئەوە هاوبەشەکەی ناچار دەکرێ، هەتا هاوبەشیی نەبێ بە مایەی ناخۆشی، لە هەمان کاتدا بە دابەشکردن زیان لە کەس ناکەوێو هەر دوولا سوود لە بەشی خۆیان وەردەگرن.

## ٣٩٦) بەڵگە لەسەر داواکارە، داوالێکراویش ئەگەر نەچووە ژێر داواکە، سوێندی لەسەرە:

سەر بەڵگەی رەوابوونی داوا تۆمار کردنو سکالا پێشکەشکردن دەگەڕێتەوە بۆ ئەم فەرموودەیەی {دروودی خوای لەسەربێ}: ئەم خەڵکە ئەگەر بە

قسەی رووت‌و بە داوای بێ بەڵگە داوای هەرچی بکەن پێیان بدرێ، ئەوا گەلێ کەس بە ناڕەوا داوای سەرو ماڵی زۆر کەسی تر دەکەن، وە وای لێدێ دەبێ بە تێکەو لێکەو بگرەو بەردەو کەس لە سەرو ماڵی خۆی دڵنیانابێ، بەڵام بۆ ئەوەی کە نەبێ بە پاشاگەردانی، بەڵگە لەسەر داواکارە، هەر کەسێ داویەکی هەبوو لەسەر کەسێ دەبێ بەڵگەی لەسەر داواکەی هەبێ، جا ئەگەر داواکار بەڵگەی لەسەر داواکەی نەبوو، ئەوکاتە بۆ لابردنی گومان سوێند لەسەر داوا لێکراوە. (شەیخان گێڕاویانەتەوە ئەمە گفت (لفظ) موسلیمە/ تاج/ ٣ ل – ٣٠٦).

بایستی ئەوەی کە بەڵگە لەسەر داواکارە چونکە لایەنی ئەو لاوازە، وە ئەوەی دەیلێ بە پێچەوانەی رووکاری حاڵە، چونکە بنەڕەت خاوێنی ئەستۆیە، یا وەك مەلاکان دەفەرموون: ئەصڵ بەرائەتی نیممەیە، لەبەر ئەوە داوای بەڵگەی بەهێزی لێ دەکرێ تا لاوازییەکەی بەهێز بکا سوێند بەڵگەیەکی بێ هێزە، چونکە سوێندخۆر گومانبارە، گومانی ئەوەی لێ دەکرێ کە بەرژەوەندی خۆی بپارێزێ بەڵام لایەنی داوالێکراو بەهێزە، چونکە بنەڕەت خاوێنی ئەستۆیەتی، لەبەر ئەوە بە بەڵگەی بێهێز قنیات دەکرێ. جا هەر کاتێ داواکار بەڵگەو شایەتی راست کردەوە لەسەر دروستیی داخوازییەکەی بڕیاری بۆ ددرێ، هەتا ئەگەر داوالێکراو سوێندیشی خواردبێ هەر بڕیاری بۆ دەدرێ، چونکە فەرموودەکە بەرەهایی بەبێ قەیدو مەرج ئەوە رادەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بەڵگە لە ئارادا نەبوو قسە قسەی داوالێکراوە بەمەرجێ سوێندبخوا، بەپێی فەرموودەکەی پێشوو. لە صەحیحەینیشدا هەیە دەفەرموێ: (ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} بڕیاری داوە سوێند

خواردن لەسەر داوا لێکراوە) (لە – کفایە الاخیار –ەکەدا بە هەڵەی چاپ ئەم فەرموودەیە ئاوا نووسراوە: وفی الصحیحین: (قضی رسول الله بالیمین علی المدعی) لە (الفقە المیسر)ەکەیشدا بەبێ لێکدانەوە ئەو هەڵەیە روونووس کراوە. بەڵام ئەگەر وابێ پەیوەندی بە بابەتی ئێمەوە نابێ، راستەکەی ئەمەیە: عن ابن عباس أن رسول الله {صلی الله علیه وسلم} قضی بالیمین علی المدعی علیه). بڕوانە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم ج – ۱۲ ص ۳ عومدە تولقاری بەرگی ۱۳ ص ۲٤۸ – وەرگێڕ).

## ۳۹۷) گێڕانەوەی سوێند بۆ سەرداواکار (رد الیمین علی المدعي)

ئەگەر مافە داواکراوەکە هی کەسێکی وابوو کە دەتوانرا سوێند بدرێ، وە داوالێکراو نەیویست سوێند بخوا ئەوە سوێند دەگەڕێتەوە بۆ سەر داواکار، چونکە فەرموودە دەفەرموێ: (پێغەمبەر {درووودی خوای لەسەربێ} سوێنەکەی گێڕایەوە بۆ سەر داواکار).

(بەیهەقی/ دارە قوطنی. ئەم فەرموودەیان باس کردووە) جا لەکاتی وادا کاتێ داواکار سوێندی خوارد شتەکەی پێ دەدرێ. لەکاتی خۆیدا سوێند بەرەو رووی زەیدی کوڕی ثابیت کرایەوە سوێندی خوارد، وە بەرەو رووی عوسمانیش کرایەوە سوێندی نەخوارد، ئەم باسە لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا دەنگی دابۆوە لەگەڵ ئەوەیشدا کەس رەخنەی نەبوو لێی. وەك گوتمان ئەمە کاتێ وایە کە لە تواناد‌ا بێ داواکار سوێند

بدرێ، وەك كەسێكی دیاری زیندووی رەسیدەی هۆشیار، بەڵام ئەگەر كەسێكی دیاری وابوو كە لە توانادا نەبوو سوێند بدرێ وەك منداڵو شێت، ئەوە فەرموودەی مەشهوور- واتە: ناودار – ئەوەیە كە چاوەڕوانی رەسیدەبوونو چاكبوونەوە دەكرێ. بەڵام ئەگەر مافەكە هی كەسێكی دیاری نەبوو.

وەك ئەوە كەسێ بمرێو لە دەفتەرەكەیدا مافێكی لەسەر كەسێ هەبێ، وە لەبەر ئەوەی مردووەكە كەلەپوورگری نەبێ كەلەپوورەكەی هی موسوڵمانان بێ، ئەوە لەم شێوەیەدا داوالێكراو بەند دەكرێ لەسەر ئەو هەقەی كە لەسەریەتی بەپێی دەفتەری مردووەكە، هەتا یا سوێند دەخوا یا هەقەكە دەدا، چونكە مافەكە لەكاتی وادا نادرێ بە داواكار هەتا سوێند نەخوا، نایشتوانرێ داواكار سوێند بدرێ چونكە نادیارە، خۆنایشبێ واز لە داوالێكراو بهێنرێ چونكە هەقەكە دەفەوتێ، كەواتە تەنیا رێگە چارە ئەوەیە داوالێكراو چەپس بكرێ، تاكۆتایی بە مەسەلەكە بهێنرێ: یا مافەكە دەدا، یا سوێند دەخوا.

## ٣٩٨) ئەگەر هەردوو هاوداوا داوای زات (عەین)یكیانكرد:

ئەگەر دوو كەس هەرایان بوو لەسەر شتێ، وە كەسیشیان بەڵگەی نەبوو، وە شتەكە لە ژێر دەستی یەكێكیاندا بوو، وەك پارچە زەوییەك بە دەستی یەكێكیانەوەبێ، ئەوە قسەی ئەوەیان دەخوات كە شتەكەی بە دەستەوەیە، بە مەرجێ سوێندی لەسەر بخوات كە هی خۆیەتی. چونكە

ئەشعەثی کوڕی قەیس {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: منو پیاوێکی جوولەکە پارچەیێ زەویمان هەبوو، جووەکە حاشای لێکردوو گوتی هی خۆمەو بەشی تۆی پێوە نیە، منیش بۆ دادگاییکردن بردم بۆ لای پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: ئایا بەلگەت هەیە؟ گوتم: نەء بە جوولەکەکەی فەرموو: (تۆ سوێند بخۆ) منیش گوتم: جا قوربان سوێند دەخوا، دەربەستی سوێند نایەت، ئەگەر وا بێ ماڵەکەم دەخوا. جا زاتی مەزن ئەمەی ناردە خوارەوە: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً – سورة آل عمران – ٣/٧٧}. (ئەبو داوود/ تاج/ ٣ ل – ٣٠٦ فەرمووی: - ٢) بەلگە سازی بەم فەرموودەیە ئاوا دەکرێ: زەوییەکە بە دەستی هەردوو لایانەوە بوو، یا بەدەستی جوولەکەوە بووە، بە بەلگە بۆ کەسیان ساخ نەبۆنەوە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمانی کردووە بە کابرای جوو، کە سوێند بخواو زەوییەکە ببێ بەهی خۆی. بەلام ئەگەر داواکراوەکە بە دەستی کەسیانەوە نەبوو، ئەوە هەردوو لایان سوێند دەخۆنو دەبێ بەهی هەردوو لایان. چونکە پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} ئاوا بڕیاری داوە. ئەگەر دوو کەس لەسەر وڵاخێ هەرایان بوو، یەکێکیان کەلوپەلی بەسەر وڵاخەکەوە بوو، ئەوە قسەی ئەوەیان دەخوا کە باری وڵاخەکە هی ئەوە، چونکە بە تەنها خۆی سوود لەو وڵاخە وەردەگرێ. ئەگەر سێ کەس لەسەر وڵاخێ هەرایان بوو، یەکێکیان لێخوڕی بوو، یەکێکی تریان جڵەوکێشی بوو، سێهەمیان سواری بوو بوو ئەوە قسە قسەی سوارەکەیە، بە مەرجێ سوێند بخوا، چونکە هەر ئەو بەهرە لە وڵاخەکە وەردەگرێ لەم کاتەدا. ئەگەر دوو کەس بوو بە هەرایان لەسەر وڵاخێ، کە لە تەویلەی

یەکێکیانا بوو، بەڵام ولاخەکە بە دەستی هەردوو لایانەوە بوو، ئەوە هی هەردوو لایانە، بە مەرجێ تەویلەکە ولاخی خەڵکی تریشی تێدابێ، دەنا دەبێ بەهی خاوەن تەویلەکە. ئەگەر دوو کەس لەسەر شتێ لەناو پاکەتێکا بوو بە هەرایان، یەکێکیان دەستی لەسەر شتەکە بوو، ئەوی تریان دەستی لەسەر پاکەتەکە بوو، هەرکەسەیان دەبێ بە خاوەنی ئەو شتەی کەوا بە دەستیەوە، چونکە ئەم دوو جۆرە شتە لەیەك جیان.

## ٣٩٩) چۆنێتیی سوێندخواردن لەسەر کردەوەی خۆی یا لەسەر هی کەسێکی تر:

کەسێ سوێند لەسەر کردەوەی خۆی بخوا دەبێ لەسەر بوونو نەبوون (اثبات ونفی) بەبێگومانی سوێند بخوا، وەك ئەوە لە نەبوون (نفی)دا بڵێ: بەخودا ئەو شتەم نەکردووە، لە بوون (اثبات)دا بڵێ: بەخودا ئەو شتەم کردووە، چونکە پەی بە هەموو زانستێکی خۆی دەباو بە بوونو نەبوون بەبێ گومان ئاگای لە خۆی هەیە کە شتەکەی کردووە یا نەیکردووە. بەڵام ئەگەر سوێندی لەسەر کردەوەی کەسێکی تر خوارد، ئەگەر لەسەر نەبوون بوو بڵێ: بەخودا بەپێی ئاگاداری من ئەو شتەی نەکردووە، ئەگەر لەسەر بوون بوو دەڵێ: بەخوا ئەو شتەی کردووە بەبێگومانی سوێند دەخوا چونکە پەیپێبردن، لەکاتی بووندا لە تواناداهەیە.

## ٤٠٠) كەسێ هەقێكی لەلابێو حاشای لێبكا:

ئەگەر كەسێ مافێكی لەلای كەسێ هەبوو، بەڵام بەڵگەی لە سەری نەبوو، كابرایش حاشای لێكرد، بۆی هەیە لەماڵی كابرا لە جۆری ماڵەكەی خۆی بەقەد ماڵەكەی خۆی ببا، بەهەر شێوەیێ بۆی دەست دەدا، نابێ لە جۆرێكی تر ببا بەمەرجێ لە جۆری ماڵەكەی خۆی دەست بكەوێ، تەنانەت بۆی هەیە لەسەر فەرمایشتی دامەزراو (راجح) كە ماڵی خۆی ببات گەرچی بیشتوانێ لە رێگەی داوەرو دادگاوە وەری بگرێتەوە. دەبێ بە بەڵگەو شایەت بۆ ئەم بڕیارە مەسەلەی ژنەكەی ئەبو سوفیان كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رێگەی پێدا كە بەقەد ژێواری خۆیو منداڵەكانی لە ماڵی ئەبو سوفیان بەبێ پرسو راكردن بەكەس ببات. چونكە داوا تۆماركردن لە دادگا هۆی كێشەو بەرەو منەتو بە فیڕۆدانی كاتە. گوتراویشە: ئەگەر لە رێگەی قازییەوە ماڵەكەیی دەست دەكەوێتەوە نابێ وەری بگرێتەوە بە پەنامەكیو شتی وا. وەكی تریش لەهەر شوێنێ مافی ئەوەی هەبێ ماڵەكەی خۆی بباتەوە، بەڵام بەبێ ئەوە كە دەرگا بشكێنێ، یا دیوار ببڕێ بۆی نەدەكرا، ئەوە دروستە كەوا بكا، هەتا هەر شتێ بفەوتێنێ دابینكردنی لەسەر نیە، وەكوو چۆن كەسێ بەرگری لە خۆی بكا لەكاتی شاڵاوهێنانی هەڵمەتهێنەر (صائل)دا هیچی لەسەر نیە ئەمیش ئاوا.

## ٤٠١) باسی شایەتیدان (الشهادة)

شایەتیدان لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا بریتییە لەوە کەسێ هەواڵ بدا لە مافێ کە بەسەر کەسێکەوەبێ. سەر بەڵگەی رەوایی شایەتیدان قورئانو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوەیە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ – سورة البقرة – ٢٨٣/٢} واتە: شایەتی حەشار مەدەن، هەر کەسێ شایەتی بشارێتەوە ئەوە بەدڵ تاوانبارە). هەروا دەفەرموێ: {وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ – سورة البقرة – ٢٨٢/٢} واتە: کاتی سەوداو مامەڵەو کرینو فرۆشتن شایەت رابگرن) ئەم جۆرە فەرمانو ئەمرەبۆ رابەریو رێپیشاندانە، بۆ پێویست بوون نیە. پرسیار لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) کرا لەبارەی چۆنێتیی شایەتیدانەوە، بە پرسیارکەرەکەی فەرموو: (خۆ چاوت لە خۆرە؟ گوتی: بەڵێ زۆر بە باشی چاوم لێیەتی، فەرمووی: دەبەو شێوەیە شایەتی لەسەر شت بدە، دەنا نا). ئایەتو فەرموودەی زۆری لەم بابەتە هەیە.

## ٤٠٢) نیشانەکانی شایەت:

چەند نیشانەیەك هەن بۆ وەرگرتنی شایەتی رەچاو دەکرێن، وەك: موسوڵمانەتیو رەسیدەبوونو هۆشیاریو ئازادیو دادپەروەری. کەواتە شایەتیی بێبڕوا بێبایەخە، خوای پەیماندار‌بێ یا جەنگیبێ، وە خوای شایەتی لەسەر موسوڵمان بدا یا لەسەر بێبڕوا، چونکە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ) شایەتیی خاوەن ئایینێ لەسەر کەسێ کە لەسەر ئایینی

خۆی نەبێ دانامەزرێ مەگەر هی موسوڵمانان چونکە عەداڵەت کە مەرجی شایەتیدانە لە وانا دروست دەبێ، لەبەر ئەوە شایەتیی ئەوان لەسەر موسوڵمانو ناموسوڵمان پەسەند دەکرێ. (ئەم فەرموودەیە بە مورسەلی بەم واتایە عەبدورڕەزاق گێڕاویەتەوە، بەیهەقیش گێڕاویەتەوەو بە لاوازی داناوە). وەکی تریش گەواهی دانو شایەتیدان ڕاپەڕاندنی گوتەی کەسێکە لەسەر کەسێکی تر ئەوەیش برێتییە لەسەر داریو سەروەری، بێبڕوایش شایانی ئەوە نیە، هەروا شایەتی مناڵو مێرد مناڵ (مراهق)و شێت دانامەزرێ، چونکە گوتەی مناڵو شێت بۆ خۆیان کاری پێ ناکرێ ئیتر بۆ کەسێکی تر یا لەسەر کەسێکی تر چۆن کاری پێ دەکرێ.

قورئانیش دەفەرموێ: {وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء – سورة البقرة – ٢٨٢/٢} واتە: سەرەڕای نووسینیش دووشایەتیش بە شایەت رابگرن، لە پیاوانی موسوڵمانان کە لە خۆتانن، ئەگەر دوو پیاو نەبوون یا پیاوێكو دوو ژن بن، بەڵام بەو مەرجە کە لە رەفتارو کرداری پەسەنیان رازیبن). دەی مناڵ بەر پیاو ناکەوێ، سەرەڕای ئەوەیش مناڵو مێردمناڵو شێت لە کەسانێ نین کە رەفتارو کردار پەسەند بن. هەروا شایەتیی کۆیلە بە هەموو جۆرەکانیەوە (وەك بەندەی زەرخرپیدەو پاشەمەرگە (مدبّر)و کاغەز پێدراوو دایکی مناڵ) دانامەزرێ. چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ – سورة الطلاق – ٢/٦٥} واتە: دوو شایەتی بە دادو عەدڵیش لە خۆتان رابگرن بە شایەت. چونکە رووی فەرمایشت لەم ئایەتەدا لە

ئازادە، بە نیشانەی وشەی (منكم) چونكە ئەم وشەیە بۆ بەرنەكەوتنی بێبڕوا نیە، چونكە بێبڕوا بە وشەی (ذوی عدل منكم) دەردەچێ، كەواتە ئەم وشەی (منكم)ە تەنیا بۆ ئەوەیە كە بەندە بەرنەكەوێ، لەبەر ئەوەیش كە شایەتی راپەڕاندن (نفوذ)ی گوتەی كەسێكە بەسەر كەسێكی تردا، ئەوەیش وەك گوترا: سەرداریو سەرورییە، كویلەیش شایانی سەروەری نیە. بە دادیش بەپێی ئەم ئایەتە مەرجە: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ هەروا بەپێی ئەم فەرموودەیەی (دروودی خوای لەسەربێ): شایەتیی پیاوی گرزیكارو ژنی گزیكار وەرناگیرێ، هەروا شایەتی پیاوی داوێنپیسو ژنی داوێنپیس وەرناگیرێ.

## ٤٠٣) مەرجەكانی دادپەروەری:

مەرجی عادڵیی شایەت چەند شتێكە، یەكێ لەوانە: ئەوەیە خۆی بپارێزێ لە هەموو گوناهێكی گەورەو لەهەر گوناهێكی تر كەوا بگەیەنێ ئەو كەسە دەربەستی ئایین نایەت، وە خۆی بپارێزێ لەبەر دەوام بوون لەسەر گوناهی بچووك، مەبەست لە بەردەوام بوون ئەوەیە كە بیكا بە پیشەی هەمیشەی، مەبەست ئەوە نیە كە ناو بەناو گوناهی بچووك بكا بەڵام تاسەر نا. یاسای كۆگر بۆ گوناهی بچووك ئاوایە: ئەگەر ناو بەناو گوناهی بچووك بكا، بەڵام بەگشتی خواپەرستیی زۆرتربێ لە گوناهكردنی بچووك ئەوە دادپەروریی نافەوتێ، دەنا ئەگەر گوناهكردنی زۆرتر بوو لە تاعەتی، ئەوە شایەتییەكەی پووچەڵە.

مەبەست لە گوناهی گەورە (کە ناودارە بە گوناهی کە بیرە) زۆر شتە. بەڵام دەتوانرێ لە چەند کۆگرێکا کۆبکرێتەوە:

**یەکەم:** هەر گوناهێ کە حەددی لەسەربێ، وەك داوێنپیسیو بادەنۆشیو دزیو پیاو کوشتن.

**دووەم:** ئەو گوناهانەی هەڕەشەی بەهێزیان لەسەربێ لە قورئانو حەدیثا، وەك پاشملە گۆییو دووزمانیو بوختان.

**سێیەم:** نەکردنی پێویستەکانی ئایینی (واجبانی دینی) وەکوو نوێژو رۆژوو و زەکاتو حەجو هەر شتێ کە خود فەرزبێ (واتە: فەرزی عەینبێ) وەك فێربوونو خوێندنی ئەو شتانە کە فەرزن لەسەر موسوڵمان.

گوناهی بچووکیش (کە پێشی دەگوترێ گوناهی صەغیرە (ئەوەیە: کە گوناهی کەم بێ وەك تەماشاکردنی نارەوا بۆ ژنو پێست لە پیستکەوتنی ژنو پیاوی ناخۆییو نامەحرەم وەك کاتی تەوقەکردن.

یەکێ تر لە مەرجەکانی عادڵیی شایەت ئەوەیە کە بیروباوەرێکی دروستی دامەزراوی هەبێ، کەواتە: شایەتی دەستەی بیدعەتکارو دەستەی ئارەزوپەرستان وەرناگیرێ، بە تایبەت ئەوانەیان کە بە بیدعەتەکەیان کافر دەبن، بەڵام ئەو گورۆهانەیان کە بیدعەتەکەیان سەرناکێشێ بۆ کوفر شایەتییان وەردەگیرێ، بە مەرجێ مەرجەکانی تری شایەتییان تیادابێ.

یەکێ تریان: ئەوەیە لەکاتی تووڕەبوونا جڵەوی هۆشیاری لەدەست نەداو بەهۆی تووڕە بوونەوە دۆو دۆشاو تێکەڵ نەکا، چونکە لەکاتی وادا بەرو دوای قسەی خۆی نازانێ‌و چاك‌و خراپ تێکەڵ دەکا، شایەتی وایش دەست نادا.

یەکێ تریان: ئەوەیە خاوەن پیاوەتی‌و مرووەت بێ. کەواتە هەرکەسێ ڕێزی کەسایەتی خۆی نەپارێزێ‌و خاوەن پیاوەتی نەبێ شایەتیی وەرناگیرێ، وەك سەماکەرو خۆڵڕێژو کەسانێ کە لەناو کۆڕی ذیکردا جەزبەیان لێدێ، یا وێنەی ئەمانە، کە قەدرو ڕێزداریی خۆیان لەکیش داوە[1].

چونکە ئەو کەسەی ئەم جۆرە هەڵبەزو دابەزەو هات‌و هاوارە بکا ئەوە عەقڵی تێکچووەو شەرمی کەم بووە، دەی مرۆڤی بێ شەرم‌و بێ حەیا هەمیشە بێ خێرە. لە ڕاستیدا هەڵبەز هەڵبەزو هەڵپەڕکێ‌و هەلەکە سەماو بە دەست‌و پاسەماکردن‌و ملبادان‌و سەر هەڵسووڕان وەم مزراح، دەق وەك جمووجووڵی شێت کارێکی ناشیرینە، مرۆڤی پێ سووك دەبێ، لەبەر ئەوە متمانە بە قسەی ناگرێ.

---

[1] داخەکەم لەم جۆرە قسە بێ تامانە لە (کفاية الاخيار)ەکەیشدا هەیە. تکایە تەماشای شەریعەتی ئیسلام ب/٤ ل – ٢٥٠ و مغني المحتاج ج/٤ ص ٤٣١ بکە هەتا لە مەسەلەکە بە باشی حاڵی ببی. خۆڵڕێژو دەروێش‌و سۆفی ئەگەر ڕوویان لە خوابێ‌و باوەڕێکی دامەزراوی پاکیان هەبێ لەگەڵێ مەلاو ئەفەندی ئەم چەرخە لەلای خودا لە پێشترن (إن أكرمكم عند الله اتقاكم).

– وەرگێڕ –

## ٤٠٤) بەشەكانی ماف (أقسام الحقوق):

**ماف دوو جۆری هەیە:**

**یەكەم:** مافی خودای گەورەیە.

**دووەم:** مافی ئادەمیزادە.

**مافی خودا لە دواوە باسی دێ. مافی ئادەمی سێ جۆری هەیە:**

**یەكـــەم:** شــتێ كــە ماڵبــێ یــا مەبەســت لێــی چەســپاندنو ســاخ كردنـــەوەی ماڵبـــێ. مـــاڵ وەك زاتـــەكان (أعیـــان)و قـــەرز، ئەوەیـــشی كـــە مەبەســت لێــی مــاڵ بــێ وەك كــڕینو فرۆشــتنو بــە كرێــدانو بارمتــەو پێڵێنانو زەوتكردنو كوشتنی بە هەڵەو شتی وا. لـە شتی وادا شایەتیی دوو پیـاو یـان پیاوێـكو دوو ژن قـەبووڵ دەكـرێ، چـونكە زاتـی مـەزن دەفـەرموێ: {وَاسْتَـشْهِدُواْ شَـهِيدَيْنِ مِـن رِّجَـالِكُمْ فَـإِن لَّـمْ يَكُونَـا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ – سورة البقرة – ٢٨٢/٢}.

ئەم جۆرە مافە بە شایەتێكو سوێندی داواكاریش ساخ دەبێتـەوە، چـونكە لـە فـەرموودەدا دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) بـە سوێندی داواكارو بە شایەتیی شایەتێ بڕیاری دەدا بـۆ داواكار. (م/ تـاج/ ٣ ل – ٣٨).

مـاوەردیش دەفـەرموێ: هەشـت كـەس لـە هاوڕێیـانی خۆشەویـست (دروودی خودا لەسەر خۆی و ڕەزای خودا لەسەر یارانی) ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە. بەڵام پێویستە كە سوێند دانی داواكار بخرێتە پاش شایەتیدانی شایەتەكە.

دووەم: شتێ کە ماڵ نەبێ‌و مەبەستیش لێی ساخکردنەوەی ماڵ نەبێ‌و لەو جۆرەیش بێ کە پیاوان ئاگایان لێی بێ، وەك ساخبوونەوەی بنەچەو ژن مارەبڕین‌و تەڵاقدان‌و کۆیلە ئازادکردن‌و سەرداریی کۆیلەو جێداری‌و راسپێری‌و کوشتنی بە قەستی کە تۆڵەکەی کوشتنەوەیەو هەموو حەددێکی تر جگە لە حەددی داوێن پیسی، وەك رەسیدە بوون‌و تەواو بوونی عیددەو لێ خۆشبوون لە تۆڵە سەندنی کوشتنەوەو ئیلاء (سوێنکاری)و ظیهارو مردن‌و ژن خولعکردن‌و ئازادکردنی بەندە لە پاش مردنی خاوەنەکەی‌و کاغەز پێدانی کۆیلە، لەم جۆرە شتانەدا بەس شایەتیی دوو پیاو وەردەگیرێ. سەر بەڵگەی هەندێ لەمانە ئەم ئایەتەیە: {حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ} وە ئەم ئایەتە: {فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ} حەزرەتیش (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەبێ هەقداری ژن‌و دوو شایەتی راست‌و روستی دادپەروەر ژن مارەی نایێ (د/ ت/ - س/ ح – تاج – ٣ ل – ٧٤). ئیبنو شەهابیش دەفەرموێ: سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوە دامەزراوە کە شایەتیی ژنان لەم شتانەدا دانامەزرێ لە حودوودو ژن مارە بڕین‌و تەڵاقدا. ئەم حەدیثە مورسەلە.

سێیەم: شتێ کە پیاوان بێ ئاگابن لێی‌و بە تایبەت بە زۆری ئافرەتان پسپۆرییان هەبێ لەو بابەتەداو ئەوان زیاتر لێی بزانن، ساخدەبێتەوە یا بە شایەتیی بە چوار ژن یا بە شایەتیی بە دوو پیاو، بە شایەتیی پیاوێك‌و دوو ژنیش دەچەسپێ.

ئەمەیش وەك: منداڵبوون و کچێنی و بێوەژنی و تاتی و پارچە گۆشت و پارچە ئێسکی ناو شەرمگای مێینەو بێنوێژیی و مەمك پێدان و نەنگی ژێر جل و بەرگ، وەك بەڵەکی و گەڕی و ئەمانە، لە سەر رای فەرمایشتی ناودار واقەواق (استهلال)ی منداڵیش لەکاتی لە دایکبوونا بەر ئەم بەشە دەکەوێ. ئەم جۆرە بە چوار ژن کەمتر ساخ نابنەوە، بەڵگەی ئەوەیش کە لەم جۆرە بابەتانەدا شایەتیی ژنان بە تەنیا بەبێ پیاوان وەردەگیرێ ئەم فەرمایشتەی زوهرییە کە دەفەرموێ: سوننەت و رێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر ئەوە دامەزراوە کە شایەتیی ژنان بە تەنها خۆیان دادەمەزرێ لە هەموو شتێکا کەهەر خۆیان سەرەوکاری بکەن (عەبدورەزاق بەم مەعنایە ئەم فەرموودەیەی لە زوهرییەوە گێڕاوەتەوە) لەبەر ئەوەیش چونکە پیاوان زۆرتر ئەم جۆرەشتانە نابینن، جا ئەگەر شایەتیی ژنان لە بارەیانەوە وەرنەگیرێ چەسپاندن و ساخ کردنەوەیان ئەستەم دەبێ ئەوەیش کە لە باروودۆخی وادا بە مەرج گیراوە ژمارەی ژنە شایەتەکان چواربن لەبەر ئەوەیە کە خودا بۆ شایەتی دوو ژنی لە جێی یەك پیاو داناوە، لە فەرموودەیشدا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەم هۆشیی ژنان برێتییە لەوە کە شایەتیی دوو ژن بە شایەتی تاقە پیاوێ حسێبە (تاج/ ١ ل – ٢٧) دەی لە شوێنێ شایەتیی ژنان بە تەنها خۆیان قەبووڵ بێ باشتر شایەتی دوو پیاو، یا شایەتیی پیاوێك و دوو ژن قەبووڵ دەکرێ.

**مافی خودای گەورە:**

مافی خودای گەورە بەشی دووەمە لە بەشەکانی ماف. ئەمیش سێ جۆری هەیە:

**جۆری یەکەم:** دەبێ بەلانی کەمەوە چوار پیاو شایەتیی لەسەر بدەن، ئەم جۆرە بریتییە لە داوێن پیسیو نێربازیو چوونە لای گیانلەبەران. سەبارەت بە داوێنپیسیو نێربازی ئەم ئایەتو فەرموودانە بەلگەی ئەم بابەتەن: {وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ – سورة النساء – ١٥/٤} و {لَوْلَا جَاؤُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء – سورة النور – ١٣/٢٤} واتە: ئەوە بۆچی بۆ سەلماندنی داواکەیان کە بریتی بوو لە بوختان بۆ ژنو پیاوی داوێنپاك چوار شایەتیان نەهێنا).

لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خوای لێبێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر کەسێ زەلامێ بەسەر ژنی خۆیەوە بگرێ دەبێ دەستی بۆ نەبا هەتا چوار شایەت دەهێنێ؟ فەرمووی: بەڵێ (تاج/ ٣ ل – ١٤٣) وەکی تریش داوێنپیسیو نێربازی لە گەورەترینی کارە ئابرووبەرەکانن، جا لەبەر ئەوە ژمارەی شایەتەکان زۆر کراون، تا شایەتیدان لەم بارەیەوە قورسو گران بێ، هەتا خەڵکی بێ تاوانی بێ ئاگا لە کەسوکاری هەردوو لا بەهۆی هەڵماڵینی عەیبی ئەوانەوە حەیایان نەچێ، سەبارەت بە چوونە لای گیانلەبەرانیش دەڵێن: ئەمیش هەر بریتییە لە چوونەلای نێرینە بۆ لای مێینە، وە

وەکوو ئەو خۆشۆردن پێویست دەکا، کەواتە لەهی ئادەمیزاد دەچێ کەوابێ بە کەمتر لە چوار شایەت ساخ نابێتەوە.

**جۆری دووەم:** بریتییە لەو مافانەی خودا کە بە شایەتی دوو پیاو ساخ دەبنەوە، شایەتیی ژنان لەم جۆرەدا کاریگەر نیە، ئەمەیش وەك حەددی بادەنۆشی‌و حەددی دەست‌و پابڕینی دزو جەردەو ڕێگرو حەددی کوشتن بەهۆی پاشگەز بوونەوە، کە لە عورفی شەرعا ناودارە بە ریددەو، وەك حەددی تری لەم جۆرە بابەتە. چونکە یەزدانی مەزن دەفەرموێ: (واشهدوا ذوی عدل منکم – تەلاق – ٢/٦٥) وەکی تریش بە پێوەرو قیاس لەسەر مارەبڕین‌و راسپێری.

**جۆری سێیەم:** بریتییە لە ساخبوونەوەی بینین‌و چاوپێکەوتنی مانگی نوێی رەمەزان‌و ئەو شتانەی کە پاشکۆی ئەمەبن، وەك پەلەکردن لە دانی سەرفترەو هاتنی مانگی شەشەڵان‌و کردنی نوێژی تەراویح، ئەم جۆرە بە شایەتی یەك پیاوی بە داد ساخ دەبێتەوە.

**بەڵگەی ئەم بڕیارە ئەمەیە:** ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: موسوڵمانان چاویان دەگێڕا بۆ مانگی نوێی رەمەزان، من مانگم دی‌و عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! من مانگم بینی. ئیتر پێغەمبەر خۆی {دروودی خوای لەسەربێ} لەسەر شایەتییەکەی من کردی بە رەمەزان‌و، بۆ سبەینێ خۆی بەرۆژوو بوو، وە فەرمانیکرد کە لە بەیانییەوە موسوڵمانان بەرۆژوو بن!) (ئەبو داوود/ ئیبنو حەببان/ دارە قوطنی/ حاکم، حاکم دەفەرموێ: فەرموودەیەکی دروستە بەپێی مەرجی پیری موسلیمە).

## ٤٠٥) شایەتیی کوێر:

شت بەهۆی یەکێ لە پێنج هەستەوە ساخ دەبێتەوەو زانست پێی پەیدا دەبێ. بە زۆری شت لە ڕێگەی چاوەوەو لە ڕێگەی کوێچکەوە دەزانرێو هەستی پێدەکرێ، جا هەرشتێ بە یەکێ لەم دووە هەستی پێ بکرێو بزانرێ ئەوە لە ساخبوونەوەیدا پشت بەو هەستە دەبەسترێ، وەك دیتنی مانگ کە بەچاو دەبینرێ، بە گوێ نابینرێ. زۆر شتیش بە هەردوولا یا بەچەند هەستێ دەزانرێ، وەك بنەچە (نەسەب)و مردنو خاوەنێتیی ڕەها، کە بە بیستنیش زانست پێیان پەیدا دەبێ چونکە هەرکاتێ مرۆڤ هەواڵی ئەمانەی لەمو لەو لە چەند لایەکەوە ژنەوت بتمانە پەیدا دەکا کە ئەو شتە وایەو لێی دەبێ بە یەقینو وەك تەواتور بۆی دەبێ بەهۆی زانینی ئەو شتە، لە بارودۆخی ئاوایشا پشت بە بیستنیش وەك دیتن دەبەسترێو، بیناو نابینا لەم جۆرە شتانەدا وەك یەکن.

## ٤٠٦) چەند مەرجی تر هەن بۆ شایەتی:

نابێ شایەت لە شایەتییەکەیدا گومانباربێ، وەك ئەوە شایەت بەهۆی شایەتییەکەوە سوودێك رابکێشێ بۆ خۆی، یاخود زیانێ لەخۆی دوور بخاتەوە، ئەوە دەبێ بەهۆی گومان لێکردنو شایەتیی ئەم جۆرە کەسە دروست نیە. وەك شایەتیی میراتگر بۆ میراتبەخشی خۆی، چونکە لەکاتی وادا قازانجی شایەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی، چونکە ئەمیش بەشی هەیە لە دەسکەوتنی کەلەپوور بەخش

(مورث)ەکەیدا، وەك شایەتی خاوەن قەرز بۆ قەرزاری نابووت، چونکە مافی خاوەن قەرز لەو شتەدا هەیە کە بەهۆی شایەتییەکەی ئەوەوە دەبێ بە ماڵی قەرزارەکە، ئەمەیش واتای وایە شایەتی بۆ خۆی دەدا. بەڵگەی ئەم باسەیش ئەم ئایەتەیە: (**وادنی الا ترتابوا**) چونکە لەکاتی وادا گومان پەیدا دەبێ، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: شایەتیی ناحەزو گومان لێکراو قەبووڵ نیە. لەبەر ئەمە شایەتیی کەسانێ کە زیانێ لە خۆیان دوور دەخەنەوە ومرناگیرێ، وەك شایەتیی کەسوکاری نزیکی دەوڵەمەند لەسەر ئەوە کە ئەو شایەتانەی شایەتییان داوە لەسەر خزمە بکوژەکەیان، فاسقو بەدکارن، چونکە ئەگەر بەهۆی شایەتییەکەی ئەمانەوە بەدکاریی ئەو شایەتانە بچەسپێ خوێنی کوژراوەکە لە کۆڵ ئەمان دەکەوێ کە عاقلەی بکوژەکەن، هەروەها شایەتیی دەستەبەر قەبووڵ نیە لەسەر ئەوە کە ئەو کەسەی ئەو زامنیەتی ئەو شتەی لە ئەستۆدا نەماوە کە شایەتەکە بووە بە دەستەبەری، چونکە گومانی ئەوەی لێدەکرێ کە لەبەر رزگار بوونی خۆی لە دەستەبەری ئەو شایەتییە بدا.

## ٤٠٧) باسی بەندە ئازادکردن:

ئازادکردن لە شەرعا بریتییە لە نەهێشتنی خاوەنێتی لە ئادەمیزاددا لەبەر رەزای خوای گەورە. بەندە ئازادکردن سوننەتێکی گەورەیە بەپێی قورئانو سوننەتو یەکگرتنی نەتەوە. زاتی مەزن دەفەرموێ: {فَكُّ رَقَبَةٍ – سورة البلد – ١٢/٩٠} . لە صەحیحی

موسلیمدا دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ کۆیلەیێ ئازاد بکا، خودای گەورە لە جیاتیی هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە ئەندامێکی ئەو کەسە ئازاد کەرە لە ئاگری دۆزەخ ئازد دەکا، تەنانەت دامەنو شەرمگای لە جیاتیی دامەنو شەرمگای ئازاد دەکا. چونکە بە راستی کۆیلەیی کۆتو بەندی کەساسیو داماوییە. ئازادیش کلیلی کردنەوەی گرێ کوێرەی ئەو کۆتو زنجیرەیە، جا لەبەر ئەوە دادەنرێ بە گەورەترین تاعەتێ کە بەندە نزیك بکاتەوەو بە گەورەترین بەهرە.

## ٤٠٨) مەرجی دامەزراندنی ئازادکردن:

بۆ دامەزراندنی بەندە ئازادکردن مەرجە کە ئازادکەر مافی تەواوی لە گەردان پێکردنی سامانی خۆیدا هەبێ، ئیتر چ موسوڵمان بێ، یا پەیماندار بێ، یا بێبڕوای جەنگی بێ چون یەکە، چونکە گەردان کردنە بەماڵ لەکاتی ژیانا، لەبەر ئەوە لەشت بەخشین دەچێ.

ئازادکردن بە گوتەی رۆشن (لەفظی صەریح) بە رەهایی دادەمەزرێ، بە گوتەی بە مەعنایش دادەمەزرێ، لەگەڵ مەبەستی ناو دڵدا. گوتەی رۆشن وەك ئەوە بە بەندەی خۆی بڵێ: ئەوا تۆم ئازادکرد، یا تۆ ئازاد کراوی، یا ئەوا تۆم سەبەرست کرد، یا تۆ سەربەستو خاوەنی خۆتی، لەکاتی وادا تەنیا بە گوتنی ئەم گوتەیە ئەو بەندەیە سەربەستو ئازاد دەبێ، با مەبەستیشی بەو قسەیە ئازاد کردنیشی نەبێ. چونکە ئازادکردن خوای بەراست بێ یا بە گەمەبێ وەك یەك دادەمەزرێ، وەك لە فەرموودەدا دەفەرموێ:

**گوتەی:**

به واتایش وەك ئەوە پێی بڵێ: تۆ له ملكی من دەرچووی، تۆ له ژێر ركێفی منا نەماوی، ڕێگەی دەستەڵاتی من بەسەر تۆدا نەماوە، تۆ بووی بەهی خودا. یا وێنەی تری ئەم گوتەیانە. پاڵفتەی گوته گوتەی بە واتا ئەوەیە كه ئازادكردنو شتی تریش هەڵبگرێ، جا لەكاتی گوتنی گوتەی وادا ئەگەر مەبەستی ئازادكردن بێ بەندەكه ئازاد دەبێ، دەنا ئازاد نابێ.

## ٤٠٩) ئازادكردنی بەشێ له بەندە:

دروسته كه مرۆڤ بەشێ له بەندەیێ ئازاد بكا وەك دروسته هەمووی ئازاد بكا، بەڵام ئەگەر بەشێكی ئازاد بكا ئەوا هەمووی لەسەر ئەم دەستوورەی دواوە ئازاد دەبێ، بەڵگەی ئەم بڕیارەیش ئەم فەرموودانەیە: جارێ پیاوێ پشكی خۆی له بەندەیەكا ئازاد دەكا، كه ئەمە دەگێڕنەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا هاوبەشی نیە. (ئەبو داوود گێراویەتەوە) له گێڕانەوەیەكا: ئەو بەندەیە سەرتاپا ئازاد بووە. جا هەر كاتێ هاوبەشێ پشكی خۆی له بەندەیەكا ئازاد بكا ئەوە تەماشا دەكەین، ئەگەر ئازادكەرەكه لەكاتی ئازادكرنەكەدا دەوڵەمەند بوو، ئەوە پشكی هاوبەشەكەیشی دەقەبڵێنرێ بە پارەو بەندە كه بە تەواوی ئازاد دەبێو دەبێ ئازادكەرەكە پارەی پشكەكەی هاوبەشەكەی بدا پێی، بەڵام ئەگەر نەدارابووئەوە پشكەكەی ئەو ئازاد دەبێ، ئەوی تری بە بەندەیی دەمێنێتەوە. بەپێی ئەم فەرمایشتەی

{دروودی خوای لەسەربێ}: ئەوەی بەشی خۆی لە بەندەیێ ئازاد بکا لە سەریەتی کە هەمووی ئازاد بکا، ئەگەر ئەوەندەی ماڵ هەبوو کە بەشی ئەوە بکا، بەڵام ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو ئەوە هەر ئەو بەشەی ئازاد دەبێ کە ئازاد کراوە. (شەیخان) لە گێڕانەوەیەکدا: ئەگەر ئازادکەرەکە دەوڵەمەند بوو تەواوی پشکەکانی بەندەکە دەقەبلێنرێو دەبێ بە ماڵ لەسەر هاوبەشە ئازادکەرەکەو هەر هاوبەشەی بەهای بەشی خویی پێ دەداو بەندەکە بە تەواوی ئازاد دەبێ.

## ٤١٠) ئازادکردنی بنەچەو وەچە:

هەر کەسێ بوو بە خاوەنی بنەچەی خۆی با دووریش بێ، یا بوو بە خاوەنی وەچەی خۆی با بەرەو خواریش بێ، ئەو بنەچەیە، یا ئەو وەچەیە یەکسەر ئازاد دەبێ، بەڵگەی ئازاد بوونی بنەچە ئەم فەرمایشتەیەتی {دروودی خوای لەسەربێ}: کەس لە چاکەی بنەچەی خۆی دەرناچێ، مەگەر کەسێ کە بنەچەکەی کۆیلەبێو بیکرێو ئازادی بکا. (م/ د/ ت/ ن/ تاج – ٣ ل – ٣٧). وەکی تریش بنەچەو وەچە پارچەی یەکترینو خوێن تێکەڵن، لەبەر ئەوە دروست نیە کە ببن بە خاوەنی یەکتری، چونکە دەق وەك ئەوە وایە کە پارچەیێ لە کەسێ ببێ بە خاوەنی پارچەیەکی تری ئەو کەسە خۆی. بەڵگەی ئازادبوونی وەچەیش لەکاتی وادا ئەم ئایەتەیە: {وَقَالُوا اتَّخَذَ اللهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ – سورة الأنبياء – ٢٦/٢١} واتە: دەڵێن: خودای میهرەبان منداڵی هەیە، خودای پاكو پیرۆزە لە شتی وا زۆر دوورە،

بەڵكوو ئەوانەی كە ئەوان بە هاوەڵو منداڵی خودایان دادەنێن، وەك عوزەیرو عیساو فریشتە، بەندەی بەرێزی نازداری خودان) ئەم ئایەتەی تریشە كە دەفەرموێ: {وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا – سورة مریم – ٩٢/١٩} ئەوەتا ئەم دوو ئایەتە بەڵگەن لەسەر ئەوە كە باوكو فرزەندیو مڵكایەتی كۆنابنەوە.

## ٤١١) سەرداریی (الولاء)

سەرداری بە عەرەبی پێی دەگوترێ (الولاء)، لە مووالاتی عەرەبی وەرگیراوە، كە برێتییە لە كۆمەكیو یارمەتیدانی یەكتری، وەكوو بڵێی كۆیلەكە یەكێ بێ لە خزمەكانی ئازاد كەرەكەی.

لە شەرعیشا سەرداریی برێتییە لە باوەنێتی (عەصەبەیی) لە پلەی دووەما، لە پاش باوەنێتیی بنەچە كە پلەی یەكەمی خزمایەتیو كەسێتییە. واتە: هەركاتێ ئازاد كراو خزمو كەسوكاری باوانی نەبوو، ئازادكەرەكەی یا نێرینەی باوانی ئازادكەرەكەی، لەم چەند شتەدا، لە جێی باوانی دەبن:

١) كەلەپووری ئازاد كراوی بێ باوان دەدرێ بە ئازادكەرەكەی، لەپاش ئەو دەدرێ بە نێرینەی باوان (عەسەبە)ی ئازاد كەرەكەی.

٢) ئەو خوێنەی دەكەوێتە سەر خزمی نزیك (عاقلە) دەكەوێتە سەر ئازادكەرو نێرینەی باوانی ئازادكەر.

٣) بـه شـوودانی ئـازادکراوی بـێ بـاوان مـافی ئازادکـەرو نێرینـەی باوانیەتی.

٤) ئازادکـەرو نێرینـەی بـاوانی لـە پێـشترن بـۆ نوێـژی مـردوو لەسەری.

لـە عەرەبیـدا مـەولا (کـە بـەواتا سـەردارە) نـاوە بۆ ئازادکەرو بـۆ ئازادکراویش.

سەر بەڵگەی دامەزراندنی سەرداریش لەپاش سوننەت کۆدەنگیو یەککرتنـە. سـەرداریی یەکێکـە لـە مافـەکانی ئـازادکردن، بـەپێی فەرمایشتەکەی {دروودی خوای لەسەربێ}: سەرداریی‌و هەقداریی هی ئەو کەسەیە کە ئازاد کراوەکەی ئازاد کردووە (ش/ د/ ت/ ن/ تا: ٣ ل — ٣٩).

سەرداریی لە بڕیاردا رێك وەك بڕیاری بوون بە باوان (عەصەبە) وایە، ئەگەر ئازادکەر نەبوو سەرداریی دەبێ بە مافی باوانی ئازادکەر، مافی میراتبەرەکانی تری پێوە نیە. چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: رشتەی سەرداریش لە نێوانی ئازادکەرو ئـازادکراودا وەك رشتەی بنەچە وایە کە بە تان‌و پۆی خزمایەتی‌و خوێشایەتی چنراوە، لەبەر ئەوەیە کە سەرداریی نە دەفرۆشرێ‌و نە دەبەخشرێ‌و نە بە کەلەپوور دەگیرێ. (ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حەببان‌و حاکم گێڕاویانەتەوە).

جا ئەگەر باوان برێتی بوون لە کوڕێك‌و لە کوڕی کوڕێ، سەرداریی هینی کوڕەکەیە، یا ئەگەر ئازادکەر باوك‌و برایەکی هەبوو، سەرداریی هی باوکەکەیە، رێك وەك دەستووری باوان لە کەلەپووردا.

بەهۆی سەردارییەوە ژن کەلەپوور ومرناگری، مەگەر ژنێ کە خۆی ئازادکەربێ، چونکە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا. جا ئەگەر ئازادکەر ژن بوو، وە مرد مافەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ نزیکترین کەسی لە باوانی.

فرۆشتنی سەرداری و بەخشینی دروست نیە چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێشکیری و نەیی کردووە لە فرۆشتنی سەرداریی و لە بەخشینی.

# ٤١٢) بەندە ئازادکرن لە پاش مردن (التدبیر):

تەدبیر لە زمانی عەرەبدا دووربینیکردنە لە سەرەنجامی کاروباردا، لە شەرعا هەڵسپاردن و بەستنی ئازادبوونە بە مردنەوە، ئەم جۆرە یاسایە لە سەردەمی نەزانیشدا لە پێش هاتنی ئیسلام دا باو بووە، لەبەر ئەوەی کارێکی پەسەندە ئیسلامیش پەسەندی کردو بڕیاری مانەوەی داو پووچی نەکردەوە، کۆچکاران و یاریدەدەران گەلێکیان بەندەی خۆیان لە پاش مردنی خۆیان ئازاد دەکر، عائیشەیش (رەزای خوای لێبێ) کە نیزەکێکی هەبوو، ئازادی کرد، بە مەرجێ لە پاش مردنی خۆی ئازاد ببێ. موسوڵمانان بە یەکگرتن و بەکۆی دەنگ بڕیاریان لەسەر ئەم مەسەلەیە داوە.

ئەوەنــدە هەیــە ئــازادکردنی پــاش مــردن نابــێ بــەهۆی نــەمانی خاوەنێتی هەتا خاوەنەکەی مابێ، بـەڵکوو ئاغاکەی بۆی هەیـە گـەردان )تصرف(ی تەواو لە بەندەی پاشەمەرگە (مودەببەر)دا بکا، بەڵگەی ئـەم بڕیارەیش ئەم فەرموودەیە کە جابیر {رەزای خوای لێبێ} دەیگێڕێتەوە: پیـاوێ لـە یاریـدەدەرانی حـەزرەت {دروودی خـوای لەسـەربێ} کـە نـاودارن بـە ئەنـصار خولامێکی هەبوو، ئازادی کرد بەمەرجی ئەوە کە لـەپاش مردنـی خـۆی ئـازاد ببـێ، پیاوەکـە هـیچ مـاڵێکی تـری وای نـەبوو: جـا کـە ئـەم باسـە گەیشتەوە بە حەزرەت {دروودی خوای لەسەربێ} فـەرمووی: کـێ ئـەم خولامـەم لێ دەکڕێ؟ نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕی بـە هەشت درەم، پێغەمبـەر {دروودی خوای لەسەربێ} پارەکەی وەرگرتو دای بـە خاوەنەکـەی (ش/ د/ ت/ ن/ تـاج – ٣ ل – ٤١) لـە گێڕانـەوەی شافیعیدا دەفـەرموێ: نـوعیمی کـوڕی نەححام لێی کڕی. بەڵام ئایا خاوەنەکەی بۆی هەیـە کـە هـەر بـە قـسەی رووت لـەم جـۆرە ئازادکردنـە پەشـیمان ببێتـەوە یا نـا؟ دوو فەرمایـشت هـەن لـەم بارەیـەوە، فەرمایـشتی دروسـت دەفـەرموێ: بـۆی نیـە کـە بـە قـسەی رووت لێـی پەشـیمان ببێتــەوە، وەك ئــەوە بڵــێ: ئــەوا ئــەم پاشـەمەرگییەم هەڵوەشـاندەوە، بـەڵکوو دەبێ بـە گـەردان لێـی پەشـیمان ببێتەوە، وەك فرۆشتنو بەخشین. پاشە مەرگی واتە: تەدبیر.

## ٤١٣) نامەنووسی (الكتابة):

**نامەنووسی:** یـا کاغـەز پێـدان، یـا کیتابـەو موکاتەبـە لـە شـەرعا ئەوەیە: بەسـتنی ئازادکردنـە بـە سیفەتێکەوە کـە ئـاڵوگۆڕو ئاڵشتکردن بگەیەنێ. سوننەتێکی گەورەیە ئەگەر لەسەر داخوازی بەندەکە بێ، بـەم دوو مەرجە:

**یەکەم:** بەندەکە ئەمیندارو راستاڵ بێ.

**دووەم:** توانـای کاسـپی کردنـی هـەبێ. زاتـی مـەزن دەفـەرموێ: {فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا – سـورة النـور – ٢٤/٣٣} واتـە: ئەو بەنـدەو کەنیزەکانـەتان کـە دەیانـەوێ نامەنووسییان لەگەڵدا بکـەن داخوازییەکەیان جێبەجێ بکەن، بەمەرجێ ئومێدی خێریان لێ بکەن.

پێـشەوا شـافیعی {رەزای خـودای گـەورەی لێبـێ} دەفـەرموێ: مەبەسـت لـە (خێر) لەم شوێنەدا توانای کاسپی کـردنو ئەمیندارییـە، چونکە کاسـپی نەکەر توانای دانـی وەجەڵـە دیارییەکـەی نیـە، نـا ئەمینـداریش جێگـەی متمانە نیە کە بەڵێنی خۆی بباتەسەر.

## ٤١٤) مەرجی دامەزرانی نامەنووسی:

مـەرجی دامـەزرانی نامەنووسی ئەوەیـە کـە ماڵەکـە دیـاری بکـرێ، ماوەی دانەکەیشی دیاری بکـرێ، چونکە دیاری نـەکردنی ئـەم دوو شـتە مایـەی دەستەشـکێنیو تێـشکان (غـەرەر)ە، ئـەوەیش سـەر دەکێـشێ بـۆ هـەراو کێـشەو بـەرە. ئـەو ماڵـەی کـە لـە نامەنووسـیدا لـە نێوانی ئاغاو بەندەدا بڕیار دەدرێ نابێ لە دوو بەشی دیـاریکراو کـەمتربێ، وەك ئـەوە ئاغا بە بەنـدەکەی بڵێ: وا نامەنووسیم لەگەڵدا کـردی لەسـەر سێ سـەد دینار، کە بەسێ بەش بیدەی پـێم، هـەر بەشـەی سـەد دینـار بـێ، مـاوەی هەر بەشەی دوو مانـگ بێ، هـەر کاتـێ ئـەم پارەیـەت بـۆم هێنـا ئازادبـە. ئیمامی عەلی {رەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: نامە نووسی لەسـەر دوو پـشکیش دەبێ، دەبێ بەنـدە کاغـەز پێدراوەکـە پـشکەکانی سـەری بـە تـەواوی بـدا ئەوسا ئازاد دەبێ!.

جارێ عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لە بەندەیەکی خۆی تووڕە بوو، ویستی تەمێی بکاو سزای بدا پێی فەرموو: دەبێ لەسەر دوو پشك نامەنووسیت لەگەڵ بکەم. دەی ئەگەر لەسەر کەمتر لە دوو پشك دروستبووایە وای دەکرد چونکە پشکەکان هەتا کەمتر بوونایە تۆڵەو سزاکە زیاتر دەبوو، بەڵام زانا شەرعزانەکان بە یەك دەنگ دەفەرموون: دروستە پشکەکان لە دوو پتربن.

## ٤١٥) گرێدانی نامەنووسی:

گرێدانی نامەنووسی بۆ بەندە لە عوقدی جائیزەیە، واتە: لە گرێبەندە دروستەکانە، چونکە گرێدانەکە لە شانسی ئەوە، لەبەر ئەوە بۆی هەیە کە هەڵی وەشێنێتەوە، بەڵام بۆ ئاغا (سَیّد) لە عوقودی لازیمەیە، واتە: لە گرێبەندە نەگۆڕەکانە لەبەر ئەوە مافی ئەوەی نیە کە هەڵی وەشێنێتەوە، چونکە ئەگەر ئاغا ئەوەی بۆ هەبێ کاغەز پێدراو (مکاتب) متمانەی پێ ناکاو لە رزگاربوونی خۆی لە کۆتی کۆیلەیی دڵنیا نابێ، لەبەر ئەوە پشتی سارد دەبێتەوە لە کاسپی کردن[1].

---

[1] تێبینی/ عوقوودی جائیزە ئەوەیە گرێدەر هەتا کاتی جێبەجێ کردنی بۆی هەبێ هەڵی وەشێنێتەوە، بە کوردی ناوی دەنێین: گرێدانە دروستەکان، عوقوودی لازیمەیش ئەوەیە عەقدەکە بە تەواوی دامەزرابێ، عاقید بۆی نەبێ هەڵی بوەشێنێتەوە. بە کوردی واتە: گرێدانە دامەزراوەکان. زاراوەی کوردی لە هەموو بابەتێکا زۆری ماوە هەتا بە تەواوی بڕسکیو بچەسپێو جێی خۆی بگرێ.

## ٤١٦) گەردانکردنی کاغەزپێدراوو ئاغا:

هەرکاتێ گرێدانی نامەنووسی سازدرا کاغەز پێدراو خۆی خاوەنی بەرهەمی رەنجەشانی خۆیەتیو قازانجی کاسپییەکەی بۆ خۆیەتی، لەبەر ئەوە بۆی هەیە شت بفرۆشێو شت بکڕێو شت بدا بە کرێو شتی تری لەم بابەتە ئەنجام بدا. پێویستە لەسەر ئاغا، هەرکاتێ نامەنووسییەکە بە تەواوی دامەزرا، شتێ لە پشکەکانی سەر نامە پێدراو دابشکێنێ، یا لەلای خۆیەوە شتێکی پێ بدا تا بتوانێ پشکەکانی سەری بە ئاسانی بدات. چونکە زاتی مەزن دەفەرموێ: {وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ - سورة النور - ٣٣/٢٤} واتە: وە بدەن بەو کاغەز پێدراوانە هەندێ لەو ماڵی خودایە کە داوێتی بە ئێوە. فەرمان لەم ئایەتەدا بۆ پێویستبوونە. ئەندازەی ئەو پێویستبووە کە پێی دەدرێ دوو قسەی لێ دەکرێ:

**یەکەمیان دەڵێ:** بەپێی زۆریو کەمیی پشکەکان ئەندازەی بۆ دادەنرێ، لە کەم کەمو لە زۆر زۆر، رێك وەك مافی موتعەکە دەدرێ بە ژنی تەڵاق دراو، ئەندازەکەی بەپێی دەوڵەمەندیو دەستکورتی تەڵاقدەر بریار دەدرێ.

**دووەمیان دەڵێ:** ئەوەندە بەسە کە پێی بگوترێ ماڵ، چونکە یەزدانی پاك بۆ مەسەلەی کاغەز پیدان، ئەندازەی بۆ یارمەتیدانەکە دانەناوە، بەپێچەوانەی موتعەوە، لە بارەی موتعەوە دەفەرموێ: {وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ - سورة البقرة - ٢٣٦/٢} بەڵام سوننەتە ئەو ئەندازەی کە لە ماڵەکە دادەشکێنرێ

چواریەکی ماڵە بڕیاردراوەکەبێ. پێشەوا عەلی {ڕەزای خوای لێبێ} دەفەرموێ: ئەو ئەندازەیەی کە ئەم ئایەتە فەرمان دەکا بە داشکاندنی لە پشکەکان چواریەکە، واتە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ ➡}.

**بزانن:**

کە کاغەزپێدراو نەخۆی نە هیچ شتێك لێی ئازاد نابێ، هەتا یەك درەمی لەسەر بمێنێ چونکە خۆشەویست {دروودی خوای لەسەربێ} دەفەرموێ: کاغەز پێدراو هەتا یەك درەمی نامەنووسی لەسەر بمێنێ هەر بەندەیە. (ئەبو داوود گێڕاویەتەوە).

## ٤١٧) دایکی منداڵ (ئوممولوەلەد)

لە زاراوەی شەریفا دایکی مناڵ پێی دەگوترێ: ئومموولەد، یا (الامة المستولدة).

جاهەر کاتێ ئاغای ئازاد چووە لای کەنیزەکی خۆی، وەسکی پڕکرد، ئەو منداڵە بە ئازادی لە دایك دەبێ، وە کەنیزەکەکە دەبێ بە دایکی مناڵ، بە مردنی ئاغاکەی ئازاد دەبێ، تەنانەت ئازاد بوونی دەخرێتە پێش دانەوەی قەرزی سەر مردووەکە.

کاتێ ماریەی قیبطییەی دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ئیبراهمی بوو، پێغەمبەر {دروودی خوای لەسەربێ} فەرمووی: مناڵەکەی ئازادی کرد. (ئیبنو حەزم بەرشتەیەکی دروست گێڕاویەتەوە) لە

فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ {درودی خوای لەسەربێ}: یەکێ لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی قیامەت ئەوەیە کچی کەنیزەك دەبێ بە ئاغای.
ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیە منال لەکاتی وادا لە جێگەی باوکیەتی، باوکیشی ئازادە، کەواتە ئەویش ئازادە، دەی کاتێ چەسپا منال ئازادە ئازادی بۆ دایکیشی دەچەسپێ، ئیتر فرۆشتن‌و بەخشین‌و بارمتەکردنی ئەو دایکی منالە نادروست دەبێ، هەروا دروست نیە کە بکرێ بە راسپێری، واتە بە وەسێت کە پاش مردنی ئاغای بکرێ بەخێر.
ئەمانەیش بەپێی ئەم فەرموودەیە: ئیبنو عومەر {رەزای خوایان لێبێ} دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا {درودو سڵاو رەحمەتی خودای گەورەی لێبێ} پێشگیری‌و نەیی کردووە لە فرۆشتنی ئەو کەنیزەکانەی کە لە ئاغاکانیان منالیان بووە، کە پێیان دەگوترێ: (أمهات الاولاد: دایکانی مندالان)وە دەفەرموێ: دایکی منال نە دەفرۆشرێ‌و نە دەبەخشرێ‌و نە بە کەلەپوور دەگیرێ، دەبا خاوەنەکەی لە ماوەی ژیانی خۆیدا خۆشی لێ وەرگرێ‌و لەگەڵی رابوێرێ، جا هەرکاتێ ئەو مرد دایکی منالەکەی یەکسەر ئازاد دەبێ (دارە قوطنی / بەیهەقی). ئاغای دایکی منال مافی خۆیەتی کە خزمەتی خۆیی پێ بکاو لەگەڵی دروست ببێ.

**بزانە:**

**منالی دایکی منال ئەمە حالیەتی:**

١) ئەگەر منالەکەی لە ئاغاکەی بوو، ئەوە بەبێ راجیایی منالەکەی ئازادە، رێك وەك باوکی.

٢) ئەگەر لە مێردی بوو، یا هی داوێنپیسی بوو ئەوە بڕیاری دایکەکەی هەیە، چونکە منداڵ لە ئازادیو کۆیلەییدا دەبێ بە پاشکۆی دایکی.

## ٤١٨) توێکاریی (تەشریح) لەم چاخەدا کارێکی پێویستە لەبەر ناچاری:

لە گۆڤاری (البحوث الاسلامیة)دا، کە لە (ریاض) دەردەچێ دەڵێ: شەریعەتی ئیسلام دەستوورو یاسایەکە کە خودای داناو زانا پیادەی کردووە، کە ئاگایەکی تەواوی لەبەرو دوای هەموو شتێ هەیە، خوای ئەو شتە لەمەوپێش بووبێ، یان لەمەو پاش ببێ، خوای گەورە ئەم شەریعەتە مەزنەی ناردووە بۆ ئێمە بەهۆی کەسێکەوە کە چاکترینی سەرجەمی دروست کراوانەو دواترینی هەموو پێغەمبەرو رەوانەکراوانە.

خودای داناو زانا زۆر بەجوانی ئەم شەریعەتەی لەسەر چەند بنەمایەکی رێكو پێكو لەسەر چەند یاساو ئاواو دەستوورێکی گشتی بەرنامە رێژی کردووە، مەبەستە بەرزە گشتییە نازدارەکان لەناویاندا رەنگ دەدەنەوە، لەبەر ئەوە بووە بە سیستەمو بەرنامەیەکی یاسایی گشتی هەمیشە زیندووی وا کە دەست بدا بۆ گشت چینو کۆمەڵو تاقمێ لە کۆمەڵانی خەڵك، لە هەموو کاتو چاخو جێگەو شوێنێکا بەبێ جیاوازی.

له راستیدا زۆر له نموونەو شێوەکارو مەسئەله جووزئییەکانو گەڵ لەو رووداوانەی کە بەرودوا رۆژانە روو دەدەن، لە قورئانو سوننەتدا دەقی رۆشن له بارەیانەوە نەهاتووە، رەنگە لەبەر ئەوەبێ لەمەوپێش نەبووبن، لەبەر ئەوە پێشینانە باشەکانی ئێمە لەو بارەیەوە بڕیاری زانراویان نیه. بەڵام ئەوەی کە یەك دەنك گومانی تیادا نیه ئەوەیە: که هەموو پرسو مەسەلەو بابەتێ، بڕیاری خودا له بارەیەوە هەیە، ئەو بڕیارە بەریەکێ لە یاسا دامەزراوە شەرعییە گشتییەکان دەکەوێ. لە ئەنجامدا زانایانی ئیسلام، لە ئەنجامی کۆششێکی پیرۆزدا پەی بەو بڕیارە دەبەن!

یەکێ لەم جۆرە بابەتانە بابەتی توێکاریی لاشەی مرۆڤی مردووە، کە لە بارەیەوە دەقێکی تایبەت نیە، لەبەر ئەوە ئەمیش دادەنرێ بە یەکێ لە بابەتە نوێکان کە رۆژ بە رۆژ سەر هەڵ دەدەنو وەك دیاردەیەکی تازە روو دەدەن. دیارە کە مەسەلەی توێکاریش بەریەکێ لە یاسا دامەزراوە گشتییەکانی شەریعەت دەکەوێ، چونکە وەك زانراوە شەریعەتی ئیسلام بەرنامەیەکی تەواوی دامەزراوی هەیە، بۆ هەموو کەسێ، لە گشت کاتو ساتو جێگەو شوێنێکا دەست دەدا، وە گشت بابەتو پێشهاتێ لەخۆ دەگرێو بۆ گشت کارێ چارەسەری خۆی هەیە. هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری خودا {دروودی خوای لەسەربێ} کراوە بە دواترینی پێغەمبەرانو بووە بە مایەی میهرەبانیو رەحمەت بۆ هەموو جیهان. بەڵگەی ئەم راو بۆچوونە ئەم ئایەتانەیە لەگەڵ چەندین فەرموودەدا. خودای مەزن دەفەرموێ

{وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا – سورة مريم – ١٩/١٤} (واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! خودای تۆ قەتو قەت فەرامۆشکار نەبووەو هەرگیزاو هەرگیز هیچی لەبیر ناچێ) لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا – سورة النساء – ١٦٥/٤} واتە: ئەم زاتانە رەهبەرانی خودا بوون، پێغەمبەری راستو دروست بوون، مژدەبەخش بوون بۆ ئەوانەی کە فەرمانی خودا پەسەند دەکەن، وە ترسێنەر بوون بۆ ئەوانەی کە سەرکێشی دەکەن لە فەرمانی خودا، حیکمەتی ناردنی ئەم رەهبەرانەیش ئەوەیە: کە لە رۆژی قیامەتدا مەهانە نەمێنێ بۆ مەردومو رێگەی ئەم جۆرە بیانووەیان نەمێنێ کە بڵێن: خودایە! خۆت دەزانی کە ئێمە نەزانو بێ ئاگا بووین، کەسێ فەرمانی تۆی پێ رانەگەیاندووین هەتا پەیرەویمان بکردایە، وە یەزدانی مەزن هەمیشە باڵادەستو کار دروستە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا – مائیدە – ٣/٥) واتە: ئەمرۆ من دەستووری ئایینی ئێوەم بە تەواوی تەواوکرد بۆتانو، نازو نیعمەتو بەهرەی بێ پایانی خۆمم رژاند بەسەرتاندا، وە ئایینی پیرۆزی ئیسلامم هەڵبژارد بۆ ئێوەو کردم بە ئایینتان). پێغەمبەری ئازیزیش {درودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەربێ} دەفەرموێ: کەس بەقەد یەزدان عوزر خوایی پێ خۆش نیە، هەر لەبەر ئەم حیکمەتەیە کە ئەم پێغەمبەرو فروستادەو رابەرانەی رەوانە کردووە هەتا ببن بە مژدەبەخشو بە

ترسێنەر! (واتە: ڕەوانەکردنی ئەم پێغەمبەرانە بۆ ڕوونکردنەوەی بڕیارەکانی خودا لە بارەی هەموو شتێکەوە بیان‌و مەهانەو عوذر بۆ کەس ناهێڵێ کە سبەینێ بڵێ: ئێمە بێ ئاگابووین‌و یاساکانی شەریعەت بەئێمە نەگەیشتبوون دەنا پابەندیان دەبووین. لە ئەصڵەکەدا نووسراوە: (لا احد أحب اليه القدر من الله...) بەڵام وا دەزانم ئەوە هەڵەی چاپە. چونکە دەقی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئاوایە (وليس أحد أحب اليه العذر من الله من اجل ذلك أنزل الكتاب وأرسل الرسل) بڕوانە صەحیحی موسلیم بەرگی ١٧ ص ٧٨ عومدەتولقاری ج ٢٠ ص ٢٠٦ + ج ٢٥ ص ٢٠٨ + تاج الاصول ج٢ ص ٣٣٢ + تاج ج٤ ص ١١٨، تاج/ ٣ ل — ١٤٣. ڕەمزی (ل) نیشانەی لاپەڕەی تەرجەمە کوردییەکەی تاجە — وەرگێڕ).

## جا پاش ئەم ڕێگا خۆش کردنە دەڵێین:

دیارەکە بابەتی توێکاریش بەریەکێ لە یاسا دامەزراوەکانی شەریعەت دەکەوێ، وە یەکێ لە بەرژەوەندە بایەخدارە گشتییەکانی شەرعی خوایگرێتە خۆ، وە لەشەریعەتدا نموونەو هاو وێنەی تری هەیە، کە شەرعزانەکان ڕای خۆیانیان لە بارەیانەوە ڕاگەیاندووە، گەرچی مەرج نیە ڕای شەرعزانەکان لە هەموو بابەتێکدا یەکسان بێ، بەڵکوو ڕاجیایی مایەی ڕەحمەتە بۆ ئەم ئوممەتە. دیارە کە شتی وا خوا یاربێ دەبێ بە چراوگێ، ڕێگەی توێژەرەوە لە بارەی توێکەرییەوە ڕوون دەکاتەوە، هەتا ڕووی ڕاستی لەم بابەتە نوێیەدا بپێکێ، کە ئایا بڕیارەکەی چییەو چی نیە.

یاسایەکی هەمەگری شەریعەت هەیە کە مەبەستە بەرزە گشتییەکانی بەرنامەکەی خودا رەچاو دەکا، دەڵێ: هەر کاتێ دوو بەرژەوەندی شەرعی بەرابەری یەکتری وەستان کامیان بەهێزتربێ کار بەوەیان دەکرێو بەهێزەکەیان پێش دەخرێ، وە هەر کاتێ دوو مایەی خراپە بەرابەری یەکتری وەستان، کار بە سووکەڵەکەیان دەکرێ، هەتا پارێز لە خراپترینەکەیان بکرێ!.

جا بەهەرحاڵی بێ بابەتی توێکەریی بەر ئەم دەستوورە دەکەوێ، چونکە بەرژەوەندی رێز گرتنی مردووەکە، خوای موسوڵمانبێ یا نا موسوڵمان، لەگەڵ بەرژەوەندی کەسوکارەکەیو بەرژەوەندی نەتەوەو گومانبار (متهم) لەکاتی هەبوونی گومانیو تۆمەتدا بەرابەر دەوەستن، جا گەلێ جار بەهۆی توێکارییەوە دەردەکەوێو کە تاوان لە ئارادا هەیەو لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا تاوانبار دەردەکەوێو بە سزای رەوای شانی دەگاو دەبێ بە پەندو عیبرەت بۆ کەسانی تریش کە لە تاوانی وا بە دوور بن دەنا هەمان تۆڵە بۆ ئەوانیش ئامادە کراوە گەلێ جاریش توێکەریی لاشەی مردووەکە دەری دەخا کە کابرا بە مردنی ئاسایی مردووە، گومانبار بێ تاوانە وە گومنبار بێ تاوانە. جا لە ئەنجامی ئەم ئەنجامانەدا کەسوکارو گومانبارو مەردوم سەرجەم بەرژەوەندیان دەپارێزرێ. لەکاتی توێکەریشدا بۆ دۆزینەوەی ماکی ئەو نەخۆشینەی کابرای پێ مردووە، گەلێ جار دەردەکەوێ کە بەنەخۆشینێکی کوشندەی درەم ئامێز مردووە، جۆری درمو پەتاکە دەست نیشان دەکرێ، بەهۆی ئەوەوە پێشگیری لە بڵاوبوونەوەی دەکرێو هۆکاری خۆلێپاراستنی

لەباری بۆ ئامادە دەکرێ، شتی وایش دەبێ بەهۆی پاراستنی گیانی خەڵكو سنووری بۆ نەخۆشییەکان دادەنێو دەبێ بە مایەی پاراژتنو سەلامەتی نەتەوە.

دیارە کە شەرعی پیرۆز بە پەرۆشەوە بانگەواز دەکا بۆ پارێز لە نەخۆشیو، فەرمان دەکا بە خۆتیمارکردنو دەرمان بەکار هێنان بۆ چارەسەری نەخۆشی. کە شتی وا بەرژەوەندی نەتەوە دەپارێزێو، دەبێ بە مایەی ئارامیو ئاسایشو خۆشگوزەرانی بۆ رۆڵەکانیو، رزگاریان دەکا لە مەترسیو کارەسات، بێگومان کە ئەمەیش رێك بەپێی بزافی ئەو یاساو دەستوورو بەرنامە باشانەیە کە خودای گەورە دایناونو بەپێی چارەنووس بڕیاری لەسەریان داوە.

## ٤١٩) فێربوونی توێکاریی (تشریح):

دیارەو بەڵگە نەویستە فێرخواز هەرکاتێ فێری ئەم بابەتە زانستییانە ببێ، لە زانستی پزیشکیدا، خێرو بێرێکی بێ شومار دەست نەتەوە دەکەوێ. وەك شارەزا بوون لە چۆنێتیی رێکخستنی جەستەی مرۆڤو ئەندامەکانی دەرەوەیو دەسگاکانی ناوەوەیو، جێگەو شوێنو قەبارەیان، خوای ساغ بن یا نەخۆش، وە ئەوە بە کردەوە مەشق لەسەر ئەمانە بکاو، بەرە بەرە فێرخواز فێری دۆزینەوەی توشبوونی نەخۆشینەکان ببێو رێگەچارەی چارەسەرکردنیان بزانێ.

جا هەرکاتێ ئەم دوو بەرژەوەندە بەرامبەر وەستان واتە: بەرژەوەندی پاراستنی رێزی مرۆڤو ئەم کۆمەڵە بەرژەوەندەی نەتەوە

کە روون کرانەوە، ئەوە زاناکان تەماشا دەکەن: کام لەم دوو بەرژەوەندە دامەزراوترە، ئەوسا بەپێی ئەوەیان کە باشترە بڕیار دروست دەبێ، خوای بەرکردن بێ یا بە نەکردن.

جا لەسەر ئەم بنەمایە بفەرموون لەگەڵ رای چەن زانایەکی پایە بەرز لەم بارەیەوە.

لە زانای پایە بەرز شێخ حسنین مخلوف) پرسیار کرا لە بابەت بڕیاری توێکەریی لاشەی مرۆڤی مردووەوە، ئەمە وەڵامەکەیەتی لە دواوە:

(بزانن کە دەرمانکردنو چارەسەرکردنی نەخۆشیو ئێشو ئازاری لەش کارێکی دەوایە، مایەی پاراستنی بەرەی ئادەمیزادە لە فەوتان، هەتا ئەو کاتو ساتەی کە خودا دیاری کردووە بۆ مانەوەی لەسەر رووی زەوی، بەپێی چارەنووسی خوایی. ئەمە لە کاتێکا کە پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) دەرمانی بۆ خۆی بەکار هێناوە، لە نەخۆشینا بە دەرمان خۆی تیمار کردووە، وە راسپێری کەسوکاری خۆیو موسوڵمانانی تریشی کردووە کە خۆیان دەرمان بکەن، ئەوەتا دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): خۆتان تیمار بکەنو ئەگەر نەخۆش کەوتن دەرمان بەکار بهێنن، چونکە خودا هەر دەردێکی دانابێ دەرمانیشی بۆ داناوە، تەنیا بۆ یەك دەرد نەبێ کە پیرییە، دەردی پیری دەرمانی نیە، تەنیا چاری ئەوەیە کە روو لە خودا بیو پیری ئاخر خێربێ!) (د/ ت/ ن/ تاج/ ٤ ل – ١٩١).

هەروا دەفەرموێ: {درودی خوای لەسەربێ}: لە راستیدا خودای باڵا دەستو شکۆمەند هەر دەردێکی ناردبێ چارەسەریشی بۆ ناردووە، هەیە ئەوە دەزانێ، هەیشە نایزانێ. ئەوەی وا لەبەر چاو ئەمەیەو هەموو کەسیش دەزانێ کە لەپاش خۆی {درودی خوای گەورەی لەسەربێ} یارانیشی هەمان رێبازی پیرۆزی ئەویان گرتووەو دەرمانو تیماریان بەکار هێناوە. کەواتە فێربوونو فێکردنی پزیشکی کارێکی رەوای پەسەندە، بەپێی گوتارو کرداری پێغەمبەر خۆی {درودی خوای لەسەربێ} بەڵکوو چەند ئایەتێکیش هەیە کە دوور یا نزیك دەبن بە بەڵگەی ئەمە، وەك لە قورئانا هەیە کە رێگە بە نەخۆش دەدرێ کە رۆژوو بشکێنێ، هەتا چارەسەری خۆی بکا، نەبادا دەردەکەی تەشەنە بکاو پەرەبسێنێ!.

هەروەك رێگە بە نەخۆش دەدرێ لە جیاتی ئاو خۆڵی پاك بەکار بهێنێ، نەبادا زامەکەی ئاودز بکا، یا دەردەکەی زیاتر ببێ، یا بە بەکارهێنانی ئاو نەخۆش بکەوێ.

دەی ئەمانە بە گشتی نیشانەی ئەوەن کە خودای یاسا دانەر مەبەستێتی کە مرۆڤ دەرمان بەکار بهێننو دەردو نەخۆشی چارەسەر بکەنو پارێز لە هەموو شتێ بکەن کە دەبێ بە سەرچاوەی ئێشو ئازار بۆی، بۆ ئەمەیش جیایی نیە لە نێوانی دەرەوەو هەناوی مرۆڤ دا، واتە: لە نێوانی دیوی دەرەوەو دیوی ناوەوەی جەستەی مرۆڤدا. وەك پێشەوا ئیبنو لقەییم {رەحمەتی خوای لێبێ} لە پەڕاوی (زاد المعاد)دا ئاماژەی بۆ دەکا.

جا لەسەر ئەم بنیاتە هونەری پزیشکی، بە زانست بێ یا بە کردەوە، فەرزی کیفایەیە، پێویستە لەسەر نەتەوە کە دەستەیێ لەم بوارەدا ئامادە بکا، هەتا هەڵسن بەم ئەرکە، دەستووری فەرزی کیفایەیش وایە: ئەگەر جێبەجێ نەکرێ نەتەوە سەرجەم تاوانبار دەبێ، بە نەکردنی ئەو فەرزە.

سەرەڕای پزیشکی هەموو زانستو هونەرو کاروبارێ کە نەتەوە پێویستی پێیان هەبێ، وەك ئەو پێشەسازییانەی کە دەبن بەهۆی مانو گەشەکردنو پێشکەوتنی نەتەوە، ئەمانەیش گشتیان لە فەرزی کیفایەن، یەزدانی یاسادانەر فەرمانی پێ کردوونو بانگەوازیان بۆ دەکاو، هەڕەشە دەکا لەوانە کە لەم بوارانەدا کەمتەرخەمی دەکەنو لە ڕەورەوەی پێشکەوتن بەجێ دەمێنن.

دەی! یەکێ لە سەرەتاکانی هونەری پزیشکی، بەڵکوو یەکێ لە یاسا پێکهێنەرەکانی، توێکاریی لاشەی ئادەمییە، لەبەر ئەوە ئەستەمە پزیشك بەبێ پسپۆڕی باش لەم مەودایەدا بتوانێ دەرمانی جەستە بکاو تیماری نەخۆشی بەگشت جۆرە جیاجیاکانییەوە بکا، چونکە لەپێش ئەمەدا گەرەکە لە ڕێگەی توێکەرییەوە، بە گوتارو بە کردار، بە زانستو بە کردەوە شارەزای کونو قوژبنو دەرەوەو ناوەوەی جەستە ببێ، ئەندامەکانیو جمگەکانیانو جێگەکانیانو چۆنێتیی پەیوەندیی نێوانیانو هەموو زانستییەکی تری لەم بابەتە بە باشی فێرببێو مەلەیان تیادا بکا، چونکە پزیشك گەرەکە لەم بوارانەدا مەلەوان بێ، ئەوسا دەتوانێ بەو ئەرکە پیرۆزەوبارە قورسە هەڵبستێ

كه خودا دایناوه لەسەری سەبارەت بە چارەسەركردنی نەخۆشان‌و دەرمانكردنی نەخۆشین. بێگومان ئەمە بەڵگە نەویستەو كەس لەمەدا گومانی نیه. ئەوە نابێ بە رەخنە ئەگەر كەسێ بڵێ: كەی ئەمە وایە؟ خۆ لەكۆندا پزیشكی بووەو توێكاریش نەبووە، چونكە لە وەڵامی ئەم جۆرە بەرپەرچدانەوەدا دەڵێین: كات‌و سات رۆڵ دەبینێ، ئەوەی لە كۆندا بووە پزیشكییەكی سەرەتایی بووە، بۆ چاخی خۆی دەستی داوە، چارەسەری دەردە بەرچاوی (ظاهر)ەكانی كردووە، ئێمە قسەمان لە پزشكییەكی فرە تەواوە كە چارەسەربێ بۆ سەرجەمی دەردو نەخۆشییەكان.و لە رووبەری لەش‌و هەناوی تەواو شارەزابێ. ئەمە لە كاتێكدا كە رۆژ بە رۆژ زانستەكان پەرە دەستێنن‌و سات بە سات زۆر دەبن‌و هۆكارەكان بەرە بەرە گەشە دەكەن‌و پتر دەبن.

دەی كە ئەمە حاڵی توێكاریی بێ وەك باسكرا، ئەو بەڵگانەی كە فێربوون‌و فێركردنی پزیشكی پێویست دەكەن دەبن بە بەڵگەی پێویستبوونی توێكاریش.

چونكە یاسایەكی سەرەكی ئوصوڵی هەیە دەڵێ: كە یاسادانەر هەر شتێ پێویست بكا دەبێ بەهۆی پێویستبوونی هەر شتێكی تریش كە ئەو پێویستە كە پێویستیی پێی هەبێ. وەك ئەوە خودا نوێژی پێویست كردووە بەهۆی ئەوەوە پاكیش كە مەرجی دامەزرانی نوێژە پێویست دەبێ، دەی مادام لەسەر مستەیێ لە نەتەوە پێویستە كە فێری پزیشكی ببێ‌و بەكاری بهێنێ، پزیشكیش بەبێ توێكاریی

جێبەجێ نابێ، کەواتە پێویستە توێکاریش بەگفتارو بە کردار فێرببن.

ئەمانە بەلگەن لەسەر ئەوە کە توێگەریی وەك پزیشکی فێربوون و فێرکردن و پێهەڵسانی دروستە بەڵکوو بەلگەن لەسەر ئەوە کە توێگەریی فەرزو پێویستە لەسەر پزیشکی پسپۆڕ لە پزیشکیی تایبەت بە مرۆڤ.

وەکی تریش لەهەر شتێکدا توێگەریی ببێ بە بەلگەیەکی رەوا بۆ چەسپاندنی مەبەستێکی رەوای شەرعی ئەوە دروستە، وەك توێکاریی لاشەی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی هۆی مردن، کە زۆر جار ئەو کارە دەبێ بەهۆی ساخکردنەوەی تاوان لە ئەستۆی تاوانکارێکدا، یا دەبێ بەهۆی بێ تاوانیی گومانباری لە رووداوێکی گومان لێکراودا... هەتەد.

بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ ئەم جۆرە بڕیارانە سەرپێیی نەبن و نەبن بەهۆی رووداني کاری ناهەمواری بێ شەرعی تر.

کورت و پوخت هەرکاتێ دەستەیێ زانای پسپۆڕی خوداناسی خاوەن ومرع و تەقوا فەتوایاندا کە توێکاریی بۆ فیسارە مەبەست دروستە یا پێویستە ئەوە بڕوا بە فەرمایشتەکەیان دەکرێ و کار بە فەتواکەیان دەکرێ.

## ٤٢٠) بڕیار (حوكم)ی تەئمین:

تـــەئمینیش وەك تەشـــریح پێویـــستیی بـــە توێژینـــەوەو شیكردنەوەو لێكۆڵینەوەی تیرو تەسەل هەیە، ئەمیش چەند بەشێكی هەیە، وەك تەئمین لەسەر ماڵو تـەئمین لەسـەر حـەیات. هـەتا ئێستا رای شـەرعزانە تازەكـان لـەم بارەیـەوە یـەك نیـە، بگـرە زوربـەی لێكۆڵەرەوە نوێكان رایان وایـە ئـەم دوو جۆرە تەئمینـە دروست نـین، یـەكێ لـەم زاتانـە كـە دەفـەرموون: تـەئمین دروسـت نیـە مامۆسـتای رەحمـەتی شـێخ محمـد بـەخیت مفتـی الـدیار المـصریەی پێـشترە، یـەكێتریان مامۆسـتای هـەرە مـەزن شـێخ عبـدالرحمن تـاج شـێخی پێـشووی جـامیعول ئەزهـەرە. كۆمـەڵێكیش دەفـەرموون: هـەموو جۆرێكی تەئمین دروستە بە مەرجێ سەرنەكێشێ بۆ سوود (ریبا).

كۆمـەڵێكیش دەفـەرموون: هەنـدێ جـۆری تـەئمین دروسـتەو هەنـدێكی نـا دروسـتە. بـۆ نموونـە مامۆسـتای پایـە بـەرز موحەممـەد ئـەبو زەهـرە (رەحمەتی خوای لێبێ) دەفـەرموێ: بـۆ نموونـە تـەئمین لەسـەر سەیارەو خۆشڕۆ بۆ چاككردنەوەی حەرام نیە، گەرچی هێشتا دڵم لەم بڕیارە چەكەرە دەكا.

بسم الله الرحمن الرحیم

لــه ســەرەتاوە ئەدیبــە عەرەبــەکان، کەویــستیان زاراوە نــوێ ئەورووپاییەکان بکەن بە عەرەبی، تووشی بارودۆخێکی وەك ئێستای ئێمە بوون، دەستەیەکیان رایان وابوو کە لە وەرگەڕانی وشەنوێکاندا زۆر پێی لێهەڵ نەبڕن، وە لە جیاتی تەرجەمەکردنی ئەو موفرەداتانە بە عەرەبی خودی موفرەداتەکان بەکاربهێنن. بەڵام هەرە رۆشنبیرەکانیان گوتیان: نە، هەرچی ئەمڕۆ رێخنە بکاتە ناو زمانەکەمان هەتا هەتایە شوێنەواری دەمێنێ، شەقڵو شێوازو نازداریو قەشەنگی زمانەکەمان دەشێوێنێ.

لە راستیشدا هەروەك چاوی شینو قژی زەردو لێوی ئاڵ لەناو عەرەباندا نامۆن، وشەی ئەورووپیش لەناو زمانی عەرەبیدا ئاوا زەقو ناقۆڵایە. وە هەروەها وشەی بیانیش لەناو زمانی خۆماندا. بۆیە بەندەیش لە هونەری وەرگەڕاندا ئەوەندەی بۆم بکرێ پەنا بە وشەی کوردی پەتی رەسەن دەبەم.

چونکە دڵنیام لەوە کە ئەم بۆرە گلەیەی ئێستا هەندێ کەس دەیکەنو دەڵێن: گوایە ئەم توندڕەویە لە تەرجەمەدا کارێکی ناباشە، دڵنیام لەوە کە ئەم بۆچوونە هەڵەیەو ئاییندە ئەوە دەچەسپێنێ. لەبەر ئەوە گوێ نادەم بەلاقرتیو رەخنەی ئەمو ئەو، هەروەك چۆن زانا دڵسۆزەکانی زمانی عەرەب گوێیان بەشتی وانەدەدا، لە ئەنجامدا قسەکەی ئەوانە سەرکەوت کە دەیان گوت: عەرەبییەکی پەتی رەسەنی پاك.

ئەمە لەلایەك، وەكی تریش ئەم زاراوە شەرعییانە لە سەرەتای گەشەكردنی شەریعەتی ئیسلامەوە، وەك ئێستا ئاوا دامەزراوو چەسپاوو ناسراوو مەشهوور نەبوون، بە تایبەتی كە رووبەری خاكی ولاتو دەوڵەتی ئیسلام بەرەبەرە پانو پۆڕو فرەوان بوو.

رێ دەكەوت زانایەكی گەورە لە میسر زاراوێكی پێش نیاز دەكرد بۆ بابەتێكی شەرعی، زانەیەكی تر لە شام یا لە عێراق یا لە ئێران بۆ هەمان مەبەست زاراوێكی تری پێشنیاردەكرد، جا بەرە بەرە ئەوزاراوانەشەنو كە وكران، وە كامیان لە بارتر بوو چەسپا، وە ئایەخەكانیان فەوتا، جاروباریش چەند زاراوەیێ بۆیەك مەبەست دەچەسپانو هەروەها زانستەكانی تریش.

سەرەنجام كتێبی شەرع پەیدابوون، گەلێ لە زانا گەورەكان كتێبی فیقهیان دانا، لەمەتن، لە شەرح، لە حاشییەو پەراوێز، بەرە بەرەو رۆژ بە رۆژ زاراوەو عیبارەتو یاسا شەرعییەكان بەرەو پێشتر دەرۆیشتن، هەتا كار گەیشت بەم شێوەیەی ئێستا، لە هەر شوێنی گوترا: (**صلاة الليل، صلاة التهجد، القراض، المهر، زكاة الفطر، الوضوء، الاستنجاء** ..تاد) هەموو كەس وەك یەك تێدەگا، نامۆیی لە واتای ئەم زاراوانەدا نیە. دەی ئومێدەكە ئێمەی كوردیش لەم جۆرە كۆششەدا بەرە بەرە بەرەوپێش برۆینو رۆژ بەرۆژ زمانەكەمان بەرەوپێش بەرین.

بەڵێ خوا یاربێ ئەم ئاواتەمان دێتەدی. بەلام ئەم تەحففوظە دەكەم. دەڵێن: رۆژێ لە قەراخ حەوزەكەی بیارە، فەقێ شێتە دەرسی تەفسیر لە خزمەت مەلای گەورەی بیارەدا دەخوێنێ، مەلا سەرنج دەدا

فەقێ شێتە ئایەتەکان ناخوێنێتەوە، مەلا دەفەرموێ: فەقێ! ئەوە بۆ ئایەتەکان ناخوێنیتەوە؟ فەقێ دەڵێ: قوربان! لەشم پیسە! مەلای گەورەیش دەفەرموێ: چۆن بە لەشی پیسەوە دەرسی تەفسیری قورئان دەخوێنی؟ ئادەی فەقێینە لەو حەوزەی هەڵکێشن و لەشپیسی دەرکەن! فەقێکانیش چوار پەلی دەگرن و لەسەر فەرمانی مەلای گەورە لە حەوزەکەی هەڵ دەکێشن. فەقێ شێتەیش زۆر زیرەك دەبێ، لەناو حەوزەکەوە بە مەلا دەڵێ: قوربان! تۆ لای خۆی مەلای گەورەی بیارەی، نیەتەکە بە دەست خۆمە، نیەت ناهێنم!! دەی ئەوەتا بەس نیەتەکە بەدەس خۆمانە کەچی چوینەتە سەر کەلی شەیتان نیەت ناهێنین!.

جا برام! وابە چاوەوە کەسەر لێشێواو لەم وڵاتەی ئێمەدا زۆر زۆرە، گەلێ دەرووی رەحمەت لە گەلی کورد کراوەتەوە، بەڵام بەخودا شەڕە گیرفان وزڕەی دۆلارو دڵسۆزی زۆر زۆری دەرو دراوسێ ناهێڵن نیەت بهێنین. بەڵام خوا شایەتە کە ئەمجارە ئەم دەرووی رەحمەتە کەسانێ دای دەخەن کە خۆیان بە رۆشن بیر دەزانن، کە خۆیان بە پێشەنگ دەزانن. نەمەلایان تیادایە، نە شێخ نە حاجی. مەگەر مەلا درۆینەو حاجی نا حاجی.

بەراستی پیاو قیزو بێزی دێتەوە لەم بارودۆخە، کەسانی رۆشنبیر بەناو، خاوەنی شەهادەی بەرز، بۆ قومێ بادە، بۆ مەرحەبایێ، گوێ بەهیچ بەرژەوەندێکی گەلی کورد نادەن، وەك ئەڵقە بە گوێی لایەنێ بەهەق و ناهەق لەسەری دەکەنەوە، بەراستی گەلێ جار هەزار رەحمەت دەنێرم بۆ صالح زەکی کە قائید فیرقەی دووبوو لە کەرکەووك لە داخی زۆڵە کورد سوێندی بە تەلاق خواردبوو کە هەتا ماوە بە کوردی قسە نەکا.

من ئەم قسە بۆ ئەوە ناکەم کە ئەم سەرلێشێواوانە بێنەوە سەر هۆش، ئەمانە دڵ مردوون، گەلی کورد وەك دەواجن تەماشادەکەن، ئەمانە بەمنی هەژار هۆشیار نابنەوە، ئەوانە خەریکی ئاوەدانکردنی گریفانی خۆیان و کاولکردنی کوردستانن، بەلام مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم: (من کوردم بەلام لە کورد بێزارم!).

ئیتر پێویست بە درێژەناکا، کێ بەکێیە؟ کێ گوێ لە قسەی هەق دەگرێ؟ رۆژی درۆو دەلەسەو چاووراوو دزیو جەردەییو پیاو کوشتن و خوێن رشتنە.

نەفرەت لەم رۆژەرەشە. نەفرەت لەو کەسانە کە بۆ قومێ بادە، بۆ کەشوفشێ ئاواتی گەلی کوردیان زیندەبەچاڵکرد. لەعنەت لە ئەبو رەیغالەکانی کورد:

ئاخ براکوژی، ئەی شەرە گیرفان!

لەعنەت لەوانەی کە هەڵیانگیرسان!

مامۆستای گەرەو مەزن جەنابی مامۆستا ئەحمەد عیسا عاشوور (رەزاو رەحمەتی خودای لێبێ) دەوری دوو سێ پەرەی تری لە بابەت تەشریحو تەئمینەوە نووسیوە، پاڵفتەکەی ئەمەیە کە عەرزتان کرا.

بەلام هەر کەسێ دمیەوێ بە باشی لە بارو دۆخو حاڵەکە حاڵی ببێ وا باشە موراجەعەی شەرعزانێکی گەورەی لە خواترس بکا، چونکە بەپێی بۆچوونی بەندە کاتێ کار بەرای زانا نوێکان دەگرێ:

١) کە زانای شەعزانی لە خودا ترس بن و شیاوی کۆششکاری بن و ئەهل بن بۆ ئیجتیهادو فەتواکەیان ساخ لەبەر رەزای خودا بێ، نەوەك لە ژێر کاریگەریی مودارات و موجامەلەو شتی وادابێ.

٢) هەرکاتێ دەوڵەتی قورئانو سوننەت لەهەر لا دروست بوو، بە راستی نەك بەقسە، ئەو کاتە ئەو دەوڵەتە ئەم جۆرە بابەتانە لەبەر رووناکی دەستوور دەچەسپێنێ نیتر لەسەر موسوڵمانانە کە بە دڵنیایی پەیرەوی ئەوە بکەن.

**دوا گوتە:**

سوپاسو ستایش بۆ خودای تاكو تەنیا، بە یارمەتی خودای گەورەو مەزن، ئەمرۆکە یەکشەممەیە، رێکەوتی (١٩٩٦/٩/٢٢) لە وەرگێرانی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە پیرۆزە بوومەوە. لە خودای میهرەبان داوا دەکەم دایبنێ بە تاعەتێکی جوان، بە خێرێکی نەبراوەو، بە میهرەبانیی خۆی قەبووڵی بفەرمووێ، وە پیتو فەرِی تێ بخا، وە برەوی پێ بدا، وە بیکا بە مایەی پاداشتی باشو سەرچاوەی رەحمەت بۆمان، بۆ خۆمانو باوكو دایكو منداڵو خزمو کەسوکارمان، بۆ مردوو زیندوومان، هەروا بیکا بەسەرچاوەی رۆشنبیریی لە وڵاتدا.

خودایە! بە رەحمەتی خۆت رەحمەت برێژی بەسەر ئەو کەسانەداکە بایەخ بەم کتێبە دەدەنو خەریکی دەبنو موتاڵای دەکەنو بەهرەو سوودی لێ وەردەگرنو خزمەتی دەکەنو چاپی دەکەنو کاری پێ دەکەن. بە راستی ئەم کتێبە گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووە. بۆ کەسی خۆی چاوی دینو دنیایە. لە کۆتاییدا تکام ئەمەیە:

١) رەحمەت لەو کەسەی چاو لە هەڵەمان دەپۆشێ.

٢) زۆر مەبەستم بوو کە خاڵبەندی ئەم کتێبە وەك ئەصڵەکەی وابێ، بەڵام وا جارێ لەسەر ئەم شێوەیە چاپکرا، کە ئەمیش لە خودا بەزیادبێ زۆر باشە بە تایبەتی لەم چاپی دوو هەمەیدا کە هەر زۆر نایابو پەسەندە.

٣) تکا لە فێرخوازو مامۆستاو مەلا بەڕێزەکان دەکەم کە دڵنیابن لە تەرجەمەکە، چونکە خوایاربێ تەرجەمەیەکی ئەمینە، خوا بیکا بە مایەی ئەمنو ئاسایش بۆ هەمووومان.

٤- سوپاس بۆ خودای گەورە کە بە دەستی خۆم ئەم چاپی دووەمەم پاك نووسو هەڵە بژێری کرد، لە ٢٠٠٦/٩/١٢ تەواوم کرد. وە لە زۆر شوێن هەندێ چاکسازی شیاوم ئەنام درا لەبەر ئەوە ئەم چاپە نوێیە هەتا بڵێیت پاكو پوختو جوانو قەشەنگەو جێگەی متمانەیە.

غفر الله لی ولوالدی ولسائر المسلمین. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین. ﴿ وصلی الله تعالی علی سیدن محمد وعلی آله وصحبه وسلم ﴾.

یملی المقال الآتی المقام: (کلامنا ختامه سلام)

وەرگێڕ

نوری فارس حەمەخان حەسەن

سلێمانی/ مامۆستایان

# پێڕستی باسەکان